بەرگی سێیەم

# مەحرەمی راز

## شەرحی غەزەلیاتی حافز

ئەکرەم عەنەبی

هەولێر - ٢٠٠٨

دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **مەحرەمی راز (شەرحی غەزەلیاتی حافز)**
- نووسین: ئەکرەم عەنەبی
- نەخشەسازی ناوەوە: طـه حسین
- پیتچنین: موسلیح
- بەرگ: ئاسۆ مامزادە
- ژمارەی سپاردن: (١٦٣٣)
- نرخ: ٢٥٠٠٠ دینار (سێ بەرگ)
- چاپی یەکەم : ٢٠٠٨
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی خانی - دهۆك

**زنجیرەی کتێب (٣١٢)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ڕوونکردنەوە

دوای ئەوەی مامۆستا (ئەکرەم عەنەبی) ساڵانێکی دوور و درێژ بەردەوام بوو لەسەر وەرگێڕان و لێکۆڵینەوەی غەزەلەکانی حافزي شیرازی و لە تەمەنی خۆیدا توانی **٢٧٩** غەزەل تەواو بکات، بەڵام مەرگ ماوەی تەواوکردنی ئەم کارەی نەدا و بەرهەمەکەی بە چاوی خۆی نەدیت و لە **١٩-٣-٢٠٠٧** لەسەر ڕێگای هەولێر- کەرکوك لە ڕووداوێکی دڵتەزێندا ئەم ئاواتەی بردە ژێر گڵ، بۆیە بە پێویستی دەزانم هەندێك ڕوونکردنەوە لەم بوارەوە بخەمەڕوو:

١- مامۆستا بەپێی گرێبەستێك لەگەڵ دەزگای موکریانی بڕیاری چاپکردنی ئەم کتێبەیان بەستبوو.

٢- لە ژیانی خۆیدا هەندێك لەم کتێبە کە تاکو غەزەلی ١٥٠ بوو ئەرکی تایپ کردنی تەواو بووبوو کە ئەوەی کە دیزاین کرابوو بە ئارەزووی خۆی بوو بە دانانی وێنە و هەندێ دیکۆمێنتی تایبەت.

٣- لە غەزەلی ١٥٠ تاکو **٢٧٩** دوای مەرگی مامۆستا تایپکرا، بۆیە نەتوانرا بە هیچ شێوەیەك بۆ ڕێزی ئەو دەستکاری بکرێت و کەسیش ئەو مافەی بەخۆی ڕەوانەدی ئەم کارە بکات.

٤- دواکەوتنی ئەم کتێبە کە زۆر چاوەڕوان بوون لەبەر ئەوە بوو کە تایپ کردنی دەستنووسەکان زۆری پێچوو هەروەها پێمان خۆش بوو سەرجەم غەزەلەکان لە یەك کاتدا بڵاوببنەوە...

لە کۆتاییدا سوپاسی زۆر و بێپایانم بۆ هەموو دۆست و هاوەڵانی مامۆستا و هاوکارانم لە بەئەنجام گەیاندنی کارەکانی ئەم کتێبە بە تایبەتی خوشکی زۆر بەڕێز م. سروە عوسمان لە کۆلیژی زمانی زانکۆی سەلاحەددین کە بە گیانێکی لێبووردوانە ئەرکی هەڵەچنی و دانانی هەمان فۆنتی غەزەلەکانی پێشوو هەروەها دەزگای موکریانی کە زۆر بە تاسەی بڵاوبوونەوەی ئەم کتێبە بوون.

دووبارە سوپاس بۆ هەموو لایەك

**بێستون حەمە ساڵح**

**برای م. ئەکرەم عەنەبی**

**٢١-٢-٢٠٠٨**

**هەولێر**

## غەزەلی سەد و هەشتا و یەکەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسڵەمی موسبەغ**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**١ — نقدها را بُودَ آیا که عیاری گیرند**

**تا همه صومعەداران پـِیِ کاری گیرند**

ئایـا دەبـێ (نەقـدەکان) سـکەکان لـە عـەیار بـدەن، تـا هـەموو سـۆفییانی خانـەقا (خانەقادارەکان) بڕۆن بەدوای کاری تۆوە.

نقد: سکە، بێگومان جاران سکە ئاڵتون بووە.

گیرند: بگرن (بەڵام لە کارە لێکدراوەکاندا واتە: کەی دەگوترێت).

عیاری گیرنـد: لـەعیار بـدرێنی صـومعەداران: پیـاوانی خانـەقا، شـێخ و سۆفییانی خانەقا.

پی کاری گیرند: بە دووی کارێکدا بڕۆن، کارێکی دیکە پەیداکەن.

خواجە دڵنیایە کە سکەی پیاوانی و مەشایخی خانەقا هەمووی تەزویرە، بەڵام حەیفێ کە سکەی کردارەکان لە عیارە نادرێن. ئەو دەڵێ ئایا بڵێی ببێ کە سـکەکان لـە عـەیار بـدرێن و ئـەو کاتـە سکەی تەزویری پیاوانی خانەقا و سۆفی و شێخانی بانگەشەکەری داعیەدار دەرکەوێ و ریسوا بن و واز لە خانەقا بهێنن و بە دوی کارێکی دیکەی جگە لە سۆفیگەری و شێخایەتیدا بگەڕێن.

**٢ — مصلحت دیدِ من آن است که یاران همه کار**

**بگـذارند و خَمِ طرّەی یـــــاری گیرند**

من وابە چاك ئەبینم کە یاران هەمووکارێك واز لێ بهێنن و لوولی زولفی یارێك بگرن.

مصلحت دید: چاوانی مەسڵحەت بین، بە چاك زانین.

بگـذارند: بخەنە لاوە، واز لێ بێنن.

لە دێڕی یەکەمدا کە خواجە کاری خانەقادارانی بە پـووچ و تـەزویر زانـی، لێـرەدا دەڵـێ چاوانی مەسڵەحەت بینی من وابەچاك ئەزانێ کە تەواوی یارانی خانەقا واز لە تـەزویر و ریـای خانەقا بهێنن و شوێن عەشقی حەقیقی بکەون و بەدوای مورشیدێکدا بڕۆن.

**٣ — خوش گرفتند حریفان سرِ زلفِ ساقی**

**گر فَلَـکْشان بگـذارد که قراری گیرند**



حەریفان / دۆستان جوان سەری زوڵفی ساقی دەگرن بەمەرجێ گەر فەلەك بهێڵێ ئارام بگرن.

حریفان: دۆستان، یاران قرار: ئارام

حەریفان لای خواجە عاشقانی رێگەی حەقن و سـاقی مورشـیدانی هـەمان رێگـە، لـەم بەیتـەدا حـەریفانی بـادەنۆش لەبەرامبـەر صـومعەدارانی بـەیتی یەکەمـدا هـاتووە و پێچەوانەیەتی خواجە دەڵێ:

گەر رۆژگاری کەچ و بەدبهێڵێ و مۆڵەتیان پێ بدات ئەوا دەست بە زوڵفی ساقییەوە دەگـرن و لە دایرەی مورشیداندا دەتوێنەوە و دەست لە (الجبل المتین) بەرنادەن.

**٤ — قوّتِ بازوی پرهیز به خوبان مَفُروش**

**که درین خیل حصاری به سواری گیرند**

هێزی بازووی تەقوای بە جوانان و چاکان مەفرۆشە، چونکە لەم لەشکرەدا حەسار / قەڵایەك بەسوارێ دەگرن.

بازو: بازوو پرهیز: تقوی مفروش: مەخەڕوو، مەفرۆشە

خیل: لەشکر، ئۆردوو، سوپا، کۆمەڵە سواران — سوارە حصاری: قەڵایەك، حەسارێك

لێرەدا خواجە کاریگەری نێوان تەقوا (رواڵەتی ئایین) و چاکی و جوانی (عەشـقی ئیلاهـی) دەردەخات و لایەنی دووەم بەکاریگەرتر دەزانێت و بـە شـێخ و خانـەقاداران دەڵـێ: تـۆ هێـزی بازووی تەقوا لای عاشقان و عارفان دەمەخەوە نازی تەقوایان بەسـەردا نەفرۆشـە، چـونکە لـە سوارەی عاشقان و عارفدا هێندە سوارچاکی تەقوادار هەیە کە بەعەشـق سـوارێکیان قەلایـەك داگیر دەکات.

**٥ — یارب این بچەی ترکان چه دلیرند به خون**

**که بەتیرِ مژه هر لحظه شکاری گیرند**

یارەب ئەم منداڵە تورکانە چەند دلێرن لـە خوێنڕێژیـدا کـە بـەتیری بـرژانگ هەرسـاتە شکارێك دەگرن.

بچە ترکان: منداڵە تورك، هێما و رەمزی جوانی بوون و بەگشتی مەبەست لە (جوانـان)ە و ئەکرێ لێرەدا مەبەست لە مورشید و کامڵانی رێگەی تەریقەت بێت.

شکاری گیرند: واتە شتێ راودەکەن، شتانێك دەگرن.

خواجـە سەرسـامی خـۆی بەرامبـەر سەرنجڕاکێـشی مورشـیدانی کـامڵی رێگـەی تەریقـەت دەخاتەڕوو.

دەڵێ: خواجە ئەم مورشیدە کامڵانە چەندە دلێرن لە کوشتنی عاشقاندا و خستنە نێو داویانەوە، کە بە جوانی (تیری برژانگیان) هەر ساتەو نێچیرێك راو دەکەن و کەسێك گرفتاری عەشقی خۆیان دەکەن.

**٦ – رقص برشعرِ تر و نالەی نی خوش باشد**

**خاصه رقصی که در آن دستِ نگاری گیرند**

سەماکردن بە شیعری تەڕ و ناڵەی (نای)یەوە خۆشە، بەتایبەتی سەماکردنێك کە تیایدا دەستی یارێ بگرن.

خاصە: بەتایبەتی          دست نگاری گیرند: دەستی یارێ بگرن.

حافظ لەم بەیتەدا جەخت لە (سەماع) – حاڵ و سەمای دەروێشانە – دەکاتەوە و دەڵێ سەماعێك کە تیایدا شیعری تەڕ بخوێنرێت و ناڵەی نەی بێت زۆر خۆشە بەتایبەتی سەماعێك کە مورشید خۆشی دەستی تێدا بگرێت بکەوێتە حاڵەوە.

(بۆ سەماع بڕوانە غەزەلی: .... دوتا نتوان کرد          ....صبا نتوان کرد)

**سر و بالای من آنگه که در آید مەسماع**

**چە محل جامەی جان را که قبا نتوان کرد**

**٧ – حافظ ابنایِ زمان را غم مسکینان نیست**

**زین میان گر بتوان بِهْ که کناری گیرند**

حافظ، خەڵکی رۆژگار – دەوڵەمەندان – خەمی هەژارانیان نییە، واچاکترە گەر بکرێ لەم نێوەندە کەنار بگرن.

ابنای زمان: کوڕانی زەمانە، واتە: ئەوانەی زەمانە دەوڵەمەندی کردوون و فرسەتەکانیان گۆستۆتەوە بۆخۆیان، هەڵپەرست.

گربتوان : گەر بتوانرێ، گەر بکرێ          کناری گیرند: کەنار بگرن، دوورکەونەوە.

حافظ بە هەژاران دەڵێ ئەوانەی رۆژگار دەوڵەمەندی کردوون لە خەمی هەژاراندا نین و هەرگیز دۆستیان نین بۆیە بە پێی پێویست مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن هەتا ئەکرێ لێیان دوورکەنەوە.



## غەزەلی سەد و هەشتا و دووەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەحزوف**

**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن)**

**١ – گر مێفروش حاجتِ رندان روا کند**

**ایزد گنه ببخشد و دفعِ بلاکند**

گەر مەیفرۆش پێویستی رەندان دابینبکات، یەزدان گوناهی دەبەخشێت و بەلا لادەدات و دووری دەخاتەوە.

حاجت: پێویستی، لێرەدا مەبەست لە پێویستی (مەی)یە.

رواکند: دابینبکات، بهێنێتە جێ یا بەجێ بهێنێ.

دفع بلا کند: دەفعی بەلا دەکات، بەلایان لێ دوور دەخاتەوە.

واتە: گەر مەیفرۆشی عەشقی حەقیقی – پیری رێگەی تەریقەت – پێداویستی رەندان دابین بکات و شەرابی عەشقیان بداتێ بینۆشن، خوا گوناهی عاشقان / رەندان دەبەخشێت و بەلایان لێ دوور دەخاتەوە.

لەڕاستیدا شەرابی مەیفرۆش گوناە و بەلا دەهێنێ، بەڵام خواجە لێرەدا دەڵێ شەرابی مەیفرۆشی عەشقی کە عەشقی ئیلاهییە ئەبێتە مایەی ئەوەی کە خوا لە گوناهیان خۆش بێ و بەلایان لێ دووربخاتەوە.

لە هەندێك لە نوسخەکاندا بەتایبەتی نوسخە دێرینەکان بەبیانووی ئەوەی کە (بلا) دووبارە بوونەوەی قافیەیە و ئەمەش لە شیعردا نەنگییە و حافظیش کە شاعیرێکی نموونەییە نابێت لەم نەنگییەی تێدا بێت – (بلا) یان بە (وبا) گۆڕیوە، بەڵام د. خرمشاهی بۆ رەتکردنەوەی ئەم رایە قافیە دووبارەکانی حافظی هێناوەتەوە و دەڵێ: زیاتر لە حەفتا جار قافیە لە شیعری حافظدا دووبارە بووەتەوە و بەنەنگی نەزانیوە{خرمشاهی، ج ١، ل٦٨٧}، هەر چۆن بێت لە کۆنترین نوسخەکاندا (وبا) هاتووە (کە نەخۆشی کوشندە – کولێرا ؟؟) یە، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنج (دەفعی بەلا) بەکارهێنانێکی باوی نێو کۆمەڵگای ئەو سەردەمە بووە و تا ئێستاش ماوەتەوە.

**٢ – ساقی بەجام عدل بدە بادە تا گدا**

**غیرت نیاورد که جهان پر بلا کند**

ساقی بە پێکی یەکسان بادە دابەشکە تا گەدا،حەسرەت نەیگرێ و سەرئەنجام جیهان پڕ فیتنە و ئاشۆب دەبێت.

جام عدل: پێکی یەکسان، واتە: بەیەك پێك کە بەشی هەمووان وەك یەك بێت و کەس لەکەس زیاتر نەبێ.

غیرت: ئاه و حەسرەت، غیرە و حەسادەت.          نیاورد: نەهێنێ.

بێگومان لە ساقیدا گومان نییە کە هەمان پیری مەیفرۆشی بەیتی یەکەم و مورشیدی ڕێگەی تەریقەتە، بەڵام (گەدا) بە دەروێشان و ڕەندانی هەژاری بەیتی یەکەم یاخود واعیز و سۆفییەداخ لەدڵەکانی دیکە لێکدراوەتەوە و بەوەش (غیرت) دوو واتای ئاه و حەسرەت و خەفەت — گەر گەدا بەواتای یەکەم لێکدرێتەوە — یاخود حەسادەت و غیرە — گەر گەدا بەواتای دووەم لێکدرێتەوە — دەگەیەنێت کە هەردوو ماناکە تەواو پێچەوانەی یەکترن و مانای بەیتەکەش بەتەواوی گۆڕانی بەسەردا دێت و بەم شێوەیە دەبێت:

١ — (گەدا ـ ڕەندان) خواجە بە ساقی دەڵێ: تۆ بادەی عەشق بەیەکسانی دابەش بکە و جیاوازی لە نێوان هەژار و دەوڵەمەند و فلان و فیساردا مەکە، چونکە ئەمە دەبێتە مایەی ئەوەی کە ڕەندانی هەژار خەفەت بخۆن و لە ئاهی حەسرەتی ئەوانیشەوە دونیا پڕ دەبێت لە فیتنە و بەڵا، چونکە خوا حەقی مەزڵومان دەسێنێ و نزایان ڕەتناکاتەوە، یاخود خۆیان دونیا پڕ لە شەڕ و ئاشوب دەکەن (ئەمە زیاتر لێکدانەوەی کۆمەڵایەتی).

٢ — (گەدا — واعیز و سۆفی داخ لە دڵ) لێرەدا خواجە بەساقی دەڵێت: تۆ بادەی عەشقی بەیەکسانی دابەش بکە و عادل بە لە دابەشکردنیدا، چونکە گەر وانەکەی واعیز و کاربەدەستە داخ لە دڵەکانی شار بەبیانووی ئەوەی کە دادپەروەری پیادە ناکرێت و زوڵم هەیە، مەیخانە وێران ئەکەن و دونیا پڕ دەبێ لە ئاشوب و بەڵا.

**٣ — مارا کە دردِ عشق و بلایِ خمار کُشت**

**یا وصلِ دوست یا مِیِ صافی دوا کند**

ئێمە کە دەردی عەشق و بەڵای خوماری کوشتینی، یا وەسڵی دۆست یا شەڕابی ساف (بێ خڵتە) دەرمانمان دەکات.

خمار: خومار، مەستی، گێژی دوای مەستی و لێرەدا مەبەست لە (حجاب)ە.

خواجە دەردی عەشق بەشەوق تاسەی و دووری داوەتە قەڵەم، خوماریش گێژی نێو پەردەکان و دەڵێ: ئاخری ئەم شەوق و تاسەیە و ئەم هەمەرەنگییە لە ویساڵی مەعشوقدا ئێمە دەکوژێت و ورمان دەکات یا خود ویساڵ و بەیەکگەیشتن لەگەڵ یاردا دەرمانی دەکات یاخود عەشقی حەقیقیی دۆست — کەبەمەیی بێ خڵتەی ساف نێوی دەبات.



**٤ — حقّا کزین غمان برسد مژدەی امان**

**گر سالکی بە عهد امانت وفا کند**

بەڕاستی گەر ڕێبوارێك وەفای بۆ پەیمانی (امانت) هەبێت، موژدەی ئاسوودەیی و ئەمان لە غەمەکان دەگات.

غمان: غەمان، ئەم غەمانە          امان: ئاسودەیی و ئەمان، پارێزراوی.

عهد امانت: پەیمانی ئەمانەت، هەمان ئەو ئەمانەتەیە کە مرۆڤ شانی داوەتەوە ژێری و لای عارفەکان عەشقە.

موژدەی ڕزگاری لە غەم یا غەمان لە قورئانی پیرۆزدا بە ئاشکرا دراوە و ئەم بەیتەش لەو ئایەتانە وەرگیراوە. لە قورئانی پیرۆزدا یازدە جار — ولا هم یحزنون — هاتووە کە موژدەی بێ غەمییە و — گەیشتنی موژدەی ئەمان و ڕزگاری لە غەمیش — هەمان ئەم موژدەیەیە کە خوای گەورە بە بەندەکانی ئەدات و هەر بۆیە ئەو ئەمانەتەش پێیان ئەدات، بۆ نموونە لە سورەتی (البقرە) ئایەتی (٣٨) دا دەفەرموویێت: ﴿فَمَنْ تَبِعَ هُدَايَ فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ هەروەها لە ئایەتی (٦٢) ﴿مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ یا لە ئایەتی(١١٢) دا هاتووە: ﴿بَلَى مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَلَهُ أَجْرُهُ عِنْدَ رَبِّهِ وَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ هەروەها لە ئایەتی (٢٦١ - ٢٧٤) هەمان سورەتدا لە (١٧٠) ی سورەتی ال عمران و ئایەتی (٦٩)ی سورە المائدە)دا دووبارە کراوەتەوە.

لە ئایەتی (٤٨)ی (الأنعام)یشدا هاتووە ﴿وَمَا نُرْسِلُ الْمُرْسَلِينَ إِلاَّ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ فَمَنْ آمَنَ وَأَصْلَحَ فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ هەروەها لە ئایەتی (٣٥)ی سورەتی الاعراف یشدا بەم شێوە هاتووە: ﴿يَابَنِي آدَمَ إِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ رُسُلٌ مِنْكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِي فَمَنْ اتَّقَى وَأَصْلَحَ فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ بۆ کرۆکی باسەکەی ئێمە ئەمانەتی مرۆڤ کە (بلی)ی یەکەمجارە لە ئایەتی (٤٦)ی (الاحقاف) دا هاتووە: ﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾

خواجە لەم بەیتەدا ئاماژە بە مەرجەکانی سەرەوە دەڵێ: گەر ڕێبوار و سالکی ڕێگەی حەق وەفای بۆ ئەو بەڵێنە هەبێت کە بە خودای داوە و بەردەوام بێت ئەوا بەڕاستی لە غەم و مەینەت ڕزگارمان دەبێت و موژدەی ڕزگاری و نەجاتبوونمان لە غەم پێدەگات.

**٥ – گر رنج پیش آید و گر راحت ای حکیم**

**نسبت مکن به غیر که اینها خدا کند**

ئەی حەکیم و فەیلەسووف ئەگەر رەنج و نارەحەتی بێتە پێشەوە و گەرخۆشی و رەحمەتی، مەیدە پاڵ غەیر (جگە لە خودا)، چونکە ئەمانە هەموویان لەلایەن خوداوەن.

پیش آمد: بێتە پێشەوە، رووبدات      حکیم: فەیلەسووف، حەکیم، فەلەکناس.

ئەم بەیتە لەبیری ئەشعریانەی حافزەوە هەڵدەقوڵێت کە تەواوی خۆشی و ناخۆشییەکان لەلایەن خوداوە دێن و کەسی دیکە دەستی تیایاندا نییە – بێگومان ئەم بیرە لە قورئانیشدا پاڵپشتی هەیە و ئێمەی کوردیش بەهەمان جۆر بیر دەکەینەوە.

لە ئایەتی (٧٨) سورەتی (النساء) هاتووە ﴿..... وَإِنْ تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا هَذِهِ مِنْ عِنْدِكَ قُلْ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ فَمَالِ هَؤُلَاءِ الْقَوْمِ لاَ يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا ﴾ واتە: ئەگەر چاکەیەکیان تووش ببێ دەڵێن: ئەوە لای خواوەیە و گەر خراپەیەکیان تووش ببێ دەڵێن ئەمە لەلایەن تۆوەیە، بڵێ هەموو لەلای خواوەیە ئەم قەومە چییانە کەلە قسە تێناگەن.

خواجە بە زمانێکی پاراوی جوان ئەم مانایە دووبارە دەکاتەوە و بەفەیلەسووف و حەکیمەکان – کە چاکە و خراپە دەدەنە پاڵ عەقڵ یا هۆکار یا ئەستێرە – دەڵێ: مەیدەنە پاڵ هیچ کەسی دیکە (قدری خیر و شر) هەمووی لە خواوە دێت.

**٦ – در کارخانه‌ای که رهِ علم و عقل نیست**

**وهم ضعیف رای، فضولی چرا کند**

لە دەزگا و کارخانەیەکدا لە رێگەی (بواری) عیلم و عەقڵ نییە، بۆچی وەهمی لاواز (زەعیف) نیازی فزوڵی کردنی هەبێت ؟

کارخانەی: دەزگا و کارخەنەیەکدا – مەبەست لە دەزگای ویست و قەدەری ئیلاهییە

وهم ضعیف: وەهمی لاواز، گومانی لاواز - مەبەست لە فەلسەفە و گومانی مرۆییە- لەهەندێ نوسخەدا لەبری وەهم- فەهم هاتووە.

رای فضولی کند: بیەوێ فزولی بکات، نیازی فزوڵی کردنی هەبێت، مەبەستی فزوڵی کردنی هەبێت.

لەبەیتی پێشوودا خواجە بەروونی دیاریدەکات و بۆ ئەوەی دەگێڕێتەوە کە کارخانەی تەقدیری ئیلاهی دەزگایەکە کە ئەسڵەن عەقڵ بۆی نییە پێ بخاتە ناوی و گومان و هەڵێنجاندنی تۆش هەمووی لەرێگەی عەقڵەوەیە، ئاخر گومانی فەلسەفییانەی لاواز و بێبنەمای (عاشقانە) کەی شیاوی ئەوەیە بیەوێ فزوڵی بکات و باس لە شتە ئیلاهییەکان بکات.



وەك هەمیشە حافظ لێرەدا بچووکی و کەمی عەقڵ لەمەسەلە ئیلاهییەکاندا دەخاتەڕوو، کە ئەم روانگەیەشی – رەتکردنەوەی عەقڵ لە مەسەلە ئیلاهییەکاندا – روانگەی باو و باڵای عارفەکانە.

**٧ – مطرب بساز عود که کس بی اجل نمرد**

**وان کو نه این ترانه سراید خطا کند**

موتریب عود لێدە، چونکە کەس بێ ئەجەل نەمرد، هەرکەس کە ئەم گۆرانییەش نەڵێ – گۆرانی ئەجەل – هەڵەدەکات.

بساز: لێدە، بژەنە، دروستکە      ترانە: گۆرانی – مەبەست لە گۆرانی کەس بێ ئەجەل نامرێت –

نە این ترانە سراید: ئەم گۆرانییە نەڵێ، واتە باوەڕی وانەبێ کە مردن ئەجەلە.

ئەم بەیتەش رەتدانەوەی رای زاناکانە سەبارەت بە مەرگ کە پێیان وایە مرۆڤ بە خوێنی یا بە دڵ یا هەرشتێکی دیکەی جەستەیی بەندە و گەر ئەوانە نەبن ئەمرێت، بەڵام خواجە بە مۆسیقاژەنی عەشق – مورشید – دەڵێ عودمان بۆ بژەنە تا بکەوینە رەقص و سەماع، چونکە کەس بێ ئەجەل نەمردووە و نامرێت و هەر کەس باوەڕی بەم قسەیە نەبێت هەڵەدەکات و بەهەڵەدا چووە، لە قورئانی پیرۆزدا زۆر جەخت لە جێگیری ئەجەل کراوەتەوە کە نە دێتە پێشەوە و نەپاش دەخرێت، خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لاَ يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ ﴾ سورة الاعراف، ئایەتی (٣٤)، هەروەها لە سورەتی منافقون ئایەتی (١١) دەفەرموویێت: ﴿وَلَنْ يُؤَخِّرَ اللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَاءَ أَجَلُهَا وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾.

**٨ – جان رفت در سرِ می و حافظ به عشق سوخت**

**عیسی دمی کجاست که احیایِ ما کند**

گیان لەرێی مەیدا تێپەڕی و حافظ بە عەشق سووتا، عیسا نەفەسێك لە کوێیە کە زیندوومان بکاتەوە.

در سر می: لەرێی مەیدا      احیای ماکند: ئێمە زیندوو بکاتەوە.

خواجە دەڵێ: تەمەن و گیانم لەرێگەی عەشقی حەقیقیدا بەسەر چوو ـ تاسە و ئارەزووی سووتاندمی کوانێ یارێك کە نەفسی عیسایی هەبێت و مردوو زیندوو بکاتەوە و بێت ئێمەی مردوو زیندوو بکاتەوە واتە لەم دوورییە دەرمان بهێنێ...

## غەزەلی سەد و هەشتا و سێیەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی مەحزوف**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلن)**

**١ — دلا بسوز که سوزِ تو کارها بکند**

**نیازِ نیم شبی دفعِ صد بلا بکند**

ئەی دڵ بسووتێ، چونکە سووتانی کاری زۆر دەکات، راز و نیازی نیوەشەو سەد بەڵا دەگێڕێتەوە.

نیاز: راز و نیاز، دۆعا و نزا، پاڕانەوە.

خواجە دان بە گەورەیی سووتانی دڵدا دەنێت لە پێناو مەحبوبدا و سووتان و رازونیازی نیوەشەوانی شەوبێداران زۆر بەکاریگەر دەزانێت و پێی وایە کاری زۆریان پێ ئەنجامدەدرێ دەبنە بەڵاگێڕەوە بۆیە بە دڵی خۆی دەڵێ: ئەی دڵ بسووتێ، چونکە سووتانی تۆ کاری زۆری پێ ئەنجامئەدرێ و کاریگەریی هەیە و پاڕانەوە و رازونیازی نیوەشەویش — بەڵای زۆر [سەد بە نموونە] دەگێڕێتەوە.

**٢ — عتابِ یارِ پری چهره عاشقانه بِکش**

**که یک کرشمه تلافیِّ صد جفا بکند**

عاشقانە سەرزەنشتی یاری پەری رووخسار، قەبوولبکە، چونکە یەك ناز وکریشمە، سەد جەفا لەناو دەبات.

عتاب: سەرزەنشت و توڕەیی　　پری چهره: پەری روخسار، پەری شێوە

عاشقانە: وەك عاشقان، عاشقانە　　بکش: راکێش، قەبووڵکە

تلافی کند: لەناوی دەبات، دەیسڕێتەوە.

دیسانەوە بە دڵی خۆی دەڵێ، یار کە بەهۆی هەڵە و کەمتەرخەمی تۆوە سەرزەنشت دەکات، تۆ ئەم سەرزەنشتانەی یاری پەریشێوە بەرەسمی عاشقان — بەرەزامەندی و خۆشحاڵییەوە — قەبوولبکە، چونکە گەر پاش ئەم سەرزەنشتانە یار نازێك بکات و کریشمەیەك بنوێنێ — کە جیلوەی سیفاتی جەماڵییە — ئەو تەنیا نازە هەرچی زوڵم و جەفایە — سەد بە نموونە — لەناو دەبات و دەیشواتەوە.

**٣ — ز ملك تا ملكوتش حجاب بردارند**

**هر آنکه خدمتِ جامِ جهان نما بکند**



ئەو کەسەی کە خزمەتی جامی جیهان نما (دڵ / مورشید) بکات، پەردەی سەر جیهان ماددە (محسوسات) و رۆحی بۆ هەڵدەدەنەوە.

ملك: دەسەڵات، سەڵتەنت، جیهان بینراو، ماددیات، رواڵەتی جیهان.

ملکوت: گەورەیی، جیهانی رۆح و نور، رۆحی جیهان.　　حجاب بردارند: پەردە لادەدەن.

(جام جهان نما) ئەو پێکەیە کە نێهنییەکانی جیهانی تێدا دەردەکەوێت و لای عارفەکان بۆ دڵی عارف بەکار دەهێنرێت.

لەم بەیتەدا خواجە دەڵێ: هەر کەس خزمەتی دڵی عارفانەی خۆی بکات بە پاك راگرتن و پاککردنەوەی لە ژەنگ و ژار ئەوا هەر لە جیهانی هەستپێکراوەکانەوە تا جیهانی رۆح، پەردەی بۆ لادەدەن و نیهێنییەکانیان دەبینێ.

لاهوری — لە شەرحەکەیدا — جام جهان نما بە مورشیدی تەریقەت دەزانێت و پێی وایە کە خزمەتکردن بە مورشیدی حەق، ئەم گەورەییە بە مرۆڤ دەبەخشێت . {لاهوری، ج ١، ل١١٠١}.

**٤ — طبیب عشق مسیحا دم است و مشفق لیک**

**چو درد در تو نبیند که را دوا بکند**

پزیشکی عەشق مەسیحا نەفەس و میهرەبانە، بەڵام کە دەرد لە تۆدا نەبینێ کێ چارەسەر بکات.

مشفق: میهرەبان.

پزیشکی عەشق هەمان مورشیدی رێگەی حەقە — وەك لاهوری لەبەیتی پێشوودا بە جام جهان نما دایە قەڵەم. و رێنمایی دڵانی دەردەداری عەشق دەکات بۆلای مەحبوب و ئەمەش چارەسەری دەردی دڵیانە؛ بەهەر حاڵ بۆ گەیشتنە دەرمان — مەعشوق — پێویستە دەرد هەبێت. دەردی عەشقیش لاهور دەردی رۆحانییە نەوەك جەستەیی و سەرمایەی تەواوی پێغەمبەران و ئەولیا و خاسانی خودایە، لێرەدا خواجە بە دڵی (یاخود هەر کەسێکی دیکە کە رەنگە وشکە سۆفییەك بێت) دەڵێت: پزیشکی عەشق — مورشیدی کامڵ، پیری تەریقەت... — نەفەسی مەسیحایی هەیە و فو بە هەر مردوویەکدا — دڵێکی مردوودا — بکات زیندووی دەکاتەوە و هێندە میهرەبانیشە کە وادەکات بەڵام کاتێ — دەردی عەشق — تاسە و شەوق بۆ گەیشتن بەحەق — لە تۆدا نابینێت چۆن چارەسەری بکات، واتە: کەمتەرخەمی لە خۆتە کە دەردی عەشقت نییە ئەگەر پزیشکی عەشق بێ کەم و کورییە. — ئەم بەیتە زیاتر مانای مورشیدی کامل بە جامی جیهان نمای بەیتی پێشوو دەبەخشێت.

**٥ — تو با خدایِ انداز کار و دل خوش دار**

**که رحم اگر نکند مدّعی خدا بکند**

تۆکاری خۆت بدەدەستی خودا خۆت دڵخۆش بە، چونکە گەر مودەعی رەحم نەکات خودا دەیکات (رەحیمە).

توبا خدای انداز کار: کار بدە دەستی خودا      دل خوشدار: دڵخۆش بە، غەم مەخۆ.

دیسانەوە خواجە ئامۆژگاری دڵ ئەکات کە کاروباری خۆت بدە دەستی خوای میهرەبانی خۆت، چونکە ئەو بە رەحمە و گەر مودەی رەحمت پێ نەکات، ئەو رەحمت پێدەکات.

**٦ — زبختِ خفته ملولم بُودَ کە بیداری**

**بە وقت فاتحەی صبح یک دعا بکند**

لەبەختی خەواڵو دڵتەنگم، بلێی (بەڵکو) بێدارێك — ئەهلی دڵێك — لەکاتی فاتحەی بەیانیدا دۆعایەکم بۆ بکات.

بخت خفته: بەختی خەواڵو — بەختی خەوتوو.

ملولم: دڵتەنگم، مات و مەلولم.

بیداری: بێدارێك، ئەهلی دڵێك، کەسێ کە دڵی بە خوداوە گرێدراوە و بەیانیان شەوبێدارە و دڵی بێدارە.

بە وقت: کاتێ      فاتحە: سورەتی فاتحە.

فاتحەی صبح: سەرەتای بەیانیدا، دەستپێکی بەیانیدا، چونکە فاتحە (سەرەتا و دەستپێکی) قورئانی پیرۆزە ئەکرێ بەواتای نوێژی بەیانیش بێت، بەڵام مانای یەکەم (سەرەتای سەحەر) باوترە.

خواجە لە بەختی خەواڵوی خۆی دڵتەنگە و نائومێد بووە و ئاواتە خوازە کە شەوبێدارێك ئەهلی دڵێك — کە ئەکرێ مەبەستی مورشیدی کامڵی بەیتەکانی پێشوو بێت — کە لەسەرتای بەیانیدا یا لە نوێژی بەیانیدا بەئاگایە و بەخەبەرە و خەریکی نزا و پارانەوەیە دۆعایەکی خێری بۆ بکات و رزگاری ببێ.

بە کورتی خواجە دەڵێ بە بەختی خۆم بەمراد ناگەم مەگەر بەنزای سەحەری ئەهلی دڵان.

**٧ — بسوخت حافظ و بوئی بە زلفِ یار نبرد**

**مگر دلالتِ این دولتش صبا بکند**

حافظ سووتا و بۆنێکی زوڵفی یاری نەکرد، مەگەر سەبا رێنمایی بکات بۆ ئەم بەخت و ئیقباڵە.



بوئی بە زولف یار نبرد: بۆنێکی زوڵفی یاری نەکرد. لە زوڵفی یارەوە بۆنێکی پێ نەگەیشت.

دلالت بکند: رێنمایی بکات.

حافظ لەم عەشقەدا سووتا و کەچی بۆنی زوڵفی یاری نەکرد — کە بۆنی زوڵفی یار تەجەلی و جیلوەی سیفاتی جەماله — واتە: لەگەڵ ئەوەی کە حافظ لە عەشقدا سووتا، بەڵام بە مەرامی عاشقانە کە جیلوەی حەق و سیفاتەکانیەتی و بە لیقای مەعشوقە نەگەیشت، مەگەر سەبا — کە نەفسی خێری ڕەحمانییە — بۆ ئەم بەخت و ئیقباڵە — بۆنی زوڵفی یار و جیلوە — رێنمایی بکات، وەگەرنا خۆی پێی ناگات.

## غەزەلی سەد و هەشتا و چوارەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی مەحزوف**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلن)**

**١ — مرا بە رندی و عشق آن فضول عیب کند**

**که اعتراض بر اسرارِ علم غیب کند**

ئەو فزولێتی من بە رەندی و عەشق عەیبەدار دەکات (رەخنەم لێدەگرێت)، کە گازاندە لە نهێنییەکانی عیلمی غەیب دەکات.

فضولی: فزوڵی، کەسێ کە لەکاری خەڵکیدا خۆی هەڵدەقورتێنێ.

اعتراض: گازندە.

اسرار علم غیب: نهێنییەکانی عیلمی غەیب، ئەو نهێنییانەی کە عیشق و خۆشەویستی خوداش دەگرنەوە.

هەندێك لە زانا و عالمەکان عەشقی نێوان خوا و بەندە رەتدەکەنەوە. لێرەدا ئەکرێ حافظ رەخنە لە وانە بگرێت و دەڵێ کەسێ من بەرەندی کە دڵ هەڵکەندنە لە غەیری خوا و عەشق کە دڵدانە بەخودا تاوانبار دەکات و رەخنەم لێدەگرێت کە فزوڵییە و خۆی لە ئیش و کاری خەڵکیدا هەڵدەقورتێنێ تەنانەت ئەم کارەی خۆهەڵقورتاندنە لە ئیش و کاری خوداشدا گازاندەیە لە نهێنییەکانی عالەمی غەیب، چونکە مرۆڤ لە غەیبدا مەفتونی عەشقی ئیلاهییە و — بەبڕوای عارفان — ناتوانێ لە داوی عەشقی ئیلاهی دەرچێت و ئەمەش یەکێکە لە نهێنییەکانی عیلمی غەیب.

**٢ — کمالِ صدق محبّت ببین نه نقص گناه**

**که هرکه بی هنر افتد نظر به عیب کند**

کەماڵی راستی موحیبەت ببینە نەوەك کەم و کورتی گوناه، چونکە هەرکەس نەزان بێت سەیری عەیب دەکات.

بی هنر: بێ هونەر، نەزان.

خواجە زاهیدی نەزان دەڵێت: سەیری گوناه و کەم و کورتی گوناه مەکە بەڵکو سەیری ئەو عەشقەپاکەم بکە کە هەمە، چونکە مرۆڤی نەزان تەنیا سەیری عەیب دەکات گەرنا مرۆڤی گەورە سەیری چاکە دەکات.



**٣- ز عطر حورِ بهشت آن نفس برآید بوی**

**که خاكِ میکدەی ما عبیرِ جیب کند**

ئەودەمە لە عەتری حۆرییەکانی بەهەشت بۆنی خۆش دێت کە خاکی مەیخانەی ئێمە وەك عەبیر (عەتر) بدەن لە یەخەمان.

آن نفس: ئەو دەمە، بر آید بوی: بۆن دێت، بۆنی بڵاو دەبێتەوە.

عبیر: بۆنێکی خۆشە کە لەیەخە دەدرێت — عەبیر. جیب: یەخە.

وەك هەمیشە حافظ عەشق و خۆشەویستی ئیلاهی بەگەورەتر لە هەر شتی دیکە دەزانێت، لێرەدا لە بەراوردی بەهەشت و عەشقدا دەڵێ: حۆری بەهەشت ئەوکاتە بۆنخۆش دەبێت کە گەرد و تۆزی بەردەم دەرگای عەشقخانەکانی ئێمە (عارفان) وەك عەتر (عەبیر) بدات لە یەخەی کراسەکەی.

**٤ — چنان بزد ره اسلام غمزەی ساقی**

**که اجتناب ز صهبا مگر صهیب کند**

غەمزەی ساقی وا سەرەڕێی بە ئیسلام گرت (ئیسلامی تالاّن کرد) کە مەگەر (سوهەیب خ. ل) خۆی لەمەی و شەڕاب بپارێزێت.

بزد ره اسلام: ئیسلامی تالاّنکرد، ڕێگەی بە ئیسلام گرت.

اجتناب: خۆ پارێزی: وازهێنان صهبا: شەراب، مەی.

صهیب: سوهەیب، هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر کە بە تەقوا و زوهد بەناوبانگ بوو.

خواجە باس لە سەرنجڕاکێشی جوانی و غەمزەی ساقی (مورشید و واسطەی حەق) دەکات و دەڵێ: خەمزەی ساقی هێندە سەرنجڕاکێشە، بەسەرنجڕاکێشی خۆی ئیسلامی تالاّن دەکات — کە لێرەدا مەبەست لە ئیسلام بەندایەتی عەوامانە یا ریابازانەیە — و تەواوی موسڵمانانی رواڵەتی رووەدەکەنە عەشقی ئیلاهی و مەگەر تەنیا کەسێکی زۆر (بەتەقوای) وەك سوهەیب.

لەم بەیتەدا (سوهەیب) وەك نموونە هێنراوەتەوە و مەبەست لەوە نییە کە سوهەیب یەکێ بێت لەعەوامان، چونکە بەندایەتی سوهەیب زۆر گەورەیە و د. غنی سەبارەت بە سوهەیب و بەندایەتی کردنی سوهەیب ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری ﷺ کە دەفەرمووێ (نعم العبد صهیب لولم یخف الله لم یعصة) واتە: چاکترین بەندە سوهەیبە کە گوناه نەکردنی لەبەر پاکی خودی خۆیەتی نەوەك لە ترسی گوناه) { د.هروی، ج٢، ل٧٩٠}.

**٥ — کلیدِ گنجِ سعادت قبولِ اهل دل است**

**مباد کس که درین نکته شك و ریب کند**

کلیلی گەنجی خۆشبەختی، پەسەند لای ئەهلی دڵ، خوانەکا (نەبادا) کەس لەم خاڵەدا شك و گەمان بکات.

مبادا: نەبادا، خوانەکات.

خواجە کلیلی خۆشبەختی — کە بە گەنج و گەوهەری ئەداتە قەڵەم — بە ئەوە دەزانێ کەلای ئەهلی دڵ و خاسانی خوا پەسەند بێت و ڕەزامەندی ئەوان بەدەست بهێنی، خوانەکا کەس لەم نوکتەدا شك و گومانی هەبێت، چونکە بە خۆشبەختی ناگات.

**٦ — شبان وادی اَیْمَن گهی رسد به مراد**

**که چند سال بەجان خدمتِ شعیب کند**

شوانی بیابانی (ئەیمەن) کاتێ دەگات بە موراد کە چەند ساڵ بە دڵ و گیان خزمەتی شوعەیب بکات.

شبان: شوان     گهی: کاتێك     رسد بەمراد: بەموراد دەگات.

شوانی دۆڵ / بیابانی ئەیمەن، حەزرەتی موسایە، کە ماوەی (١٠) ساڵ شوانی حەزرەتی شوعەیبی کرد. چیرۆکی حەزرەتی موسا لە قورئانی پیرۆزدا زۆر باسی لێوە کراوە، لە سورەتی (القصص) دا — کە یەکێکە لە سورەتەکانی طوسین و زۆر باسی حەزەرتی موسا دەکەن — بە درێژی باسی چیرۆکی حەزرەتی موسا، لە دایکبوون و گەورەبوون و راکردنی لە دەستی پیاوانی فیرعەون و رۆیشتنی بۆ مەداین و لەوێ بینینی دووکچەکەی حەزرەتی شوعەیب و ئاودانی مەڕەکان بۆیان و رۆیشتنی بۆلای حەزرەتی شوعەیب و شەرتی (١٠) ساڵ شوانی مەڕەکانی لەبەرامبەر یەکێ لە کچەکانیدا و..... سورەتی القصص ئایەتی (١ — ٥٠).

خواجە لێرەدا حەزرەتی موسای وەك (ڕێبواری تەریقەت) هێناوەتەوە و حەزەرتی شوعەیبیش بە رەمزی (خاسانی خوا و مورشیدان — ئەهلی دڵی بەیتی پێشوو) داناوە و دەڵێ: موسا کاتێ بە موراد دەگات کە بەدڵ و گیان چەند ساڵێك خزمەتی حەزرەتی شوعەیب بکات و هەر ڕێبوارێکی ئەم ڕێگەیەش کاتێ بەموراد دەگات کە چەند ساڵێ بەدڵ و گیان لە خزمەتی شوعەیب ئاساکاندا — ئەهلی دڵاندا — بێت.

**٧ — ز دیده خون بچکاند فسانەی حافظ**

**چو یادِ وقتِ زمانِ شباب و شیب کند**

چیرۆکی حافظ خوێن لەدیدە دەهێنێ، چونکە یادی سەردەمی کاتی لاوی و پیری دەکاتەوە.



فسانە: چیرۆك، سەرگوزەشتە     بچکاند: دەهێنێ، دەچکێنێ.

شیب: پیری.

خواجە دەڵێ لەبەر ئەوەی چیرۆکی حافظ (شیعری حافظ) باسی ژیان و زەمانی سەردەمی لاوێتی و پیری دەکات و یادیان دەکاتەوە فرمێسك لە چاوان دەهێنێ، هێندە زۆر کەدەبێتە خوێن و لەبری فرمێسك خوێن بەچاواندا دەهێنێ.

## غەزەلی سەد و هەشتا و پێنجەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی محزوف**

**فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن**

**١ — طایرِ دولت اگر باز گـذاری بکند**

**یار باز آید و با وصل قراری بکند**

ئەگەر باڵندەی بەخت جارێکی دیکە بێتەوە یار دێتەوە و قەرار بۆ دیدار دادەنێ.

طایر دولت: باڵندە بەخت، درکەیە لە باڵندەی هومـا / سـیمرغ (کـە سـێبەر بەسـەر هـەر کەسێکدا بکات بەخت رووی تێدەکات.

گـذاری بکند: گوزەری بکات، بێتەوە بەلامدا باز: دووبارە، دیسانەوە

باز آید: دێتەوە

خواجە دەڵێ گەر بەخت روم لێ بنێت و باڵندەی هومـا جـارێکی دیکـە بەسـەرمدا گـوزەر بکات یار دێتەوە قەراری ژوان دادەنێت.

**٢ — دیده را دستگهِ دُرّ و گهر گرچه نماند**

**بخورد خونی و تدبیرِ نثاری بکند**

گەرچی چاوانم سەرمایەی دوڕ و گەوهەری نەماوە، خوێن دەخوات (رەنج دەکێشێ) بـیر لـە خۆ فیداکردنێك دەکاتەوە.

دستگە: دەستگا، سەرمایە، سەلاّت و توانا در و گوهر: دوڕ و گەوهەر — مەبەسـت لە فرمێسکە —

بخورد: دەخوات، خوێن خواردن (خوێنی دڵ / جگەر خواردن) بە واتای رەنج کـشێان و غـەم خواردن. تدبیر: بیرکردنەوە، رێکخستن.

جاران باو بوو کە کەسێك لە دوورەوە هاتووە، شتێکی بۆ کراوە بە قوربانی، لـەم دیـاردەوە یە خواجە دەڵێ کەبەخت بەسەرماندا سایە بکات و یار بێتەوە، پێویستە شـتێکی بـۆ بکەمـە قوربانی، بەلاّم سەرمایەی فرمێسکی چاوانم لەدەست داوە و لەکاتی دووری یاردا هێندە گریاوم دوڕ و گەوهەری فرمێسکی چاوانم وشکی کردووە، گەرچی ئەوەش نەماوە، بەلاّم دیدەم بیر لەوە دەکاتەوە کە خوێنی دڵ بخوات و بیکاتە قوربانی لەبەر پێی یاردا، واتە لەبری فرمێسك خـوێنی بۆ برژێ یا هەوڵ و رەنجی زۆری لە پێناودا بدات.



**٣ — دوش گفتم بکند لعل لبش چارەی من**

**هاتف غیب ندا داد که آری، بکند**

شەوی رابردوو گوتم: لێوی یاقوتی چارەی من دەکات، سروشـی غـەیب دای بـە گوێمـدا ئەرێ، دەیکات.

خواجە دەڵێ: شەوی رابردوو بەخۆمم دەگوت لێوی یاقوتینی یار چـارەی دەردی دووری مـن دەکات و نزیکی لەو (یاری حەق) ئارامم دەکاتەوە، فریشتەی غەیب کە سروش دەهێنێ دای بە گوێمدا و گوتی، ئەرێ — بێ ئومێد مەبە — لێوی یاقوتینی — ارحم الراحمین — دەیکات.

**٤ — کس نیارد بَرِ او دم زدن از قصەی ما**

**مگرش بادِ صبا گوش گـذاری بکند**

کەس ناوێرێ لەبەردەم ئەودا باسی ئێمە بکات، مەگەر بادی سەبا بیدا بەگوێیدا.

نیارد: ناوێرێ، جورئەت ناکات. براو: لەبەردەم ئەودا، لای ئەودا.

دم زدن: قسە کردن، باسکردن. گوش گـذاری: بەگوێدادان.

خواجە دەڵێ: کەس ناوێرێت لای یار باسی چیرۆکی خەمباری ژیـانی بکـات، مەگـەر بـای سەبا بەم ئەرکە هەستێت و قسە و باسی ئێمە بە گوێی یاردا بدات.

**٥ — دادەام بازِ نظر را بە تـذروی پرواز**

**بازخواند مگرش نقش و شکاری بکند**

بازی نیگای خۆم بەرەو (تذرو) یەك هەڵفڕاندووە، بە ئومێدی ئـەوەی شـێوەی خـستنەداوی فێرببێ و راوی کات {مهدی معنیان، ل ٣١٧ }.

تـذرو: جۆرە باڵندەیەکە (قرقول) پروازدادن: هەڵفڕاندن

نقش: بەگوتەی سوودی، جۆرە ئامرازێکـە کـە دەنگـی باڵنـدە دەردەهـێنێ بـۆ فریـودانی باڵندەکان و راکێشانیان بەرەو دامگە.

واتە: من چاوانم وەك باز بۆ یار (تـذرو) هەڵداوە و هەڵفڕاندووە تا بەدەستی بهێنم و رەحـم پێ بکات یاخود ببینم و بەدیداری شادبم، جا بۆ ئەوەی بکەوێتە داوەوە دەنگی باڵندە دووبارە دەکەمەوە (بەهۆی ئامرازی نقش)ەوە تا بەڵکو بازی دیدەم داوای بکات.

بە کورتی، سوود لە هەر رێیەك وەردەگرم بۆ دیتنی یار.

**٦ — شهر خالیست ز عشّاق بُودَ کز طرفی**

**مردی از خویش برون آید و کاری بکند**

شار خاڵییە لە عاشقان، بڵێی کە لە لایەکەوە پیاوێك پیاوەتی خۆی بنوێنێ و کارێك بکات.

مردی ازخویش برون آید: پیاوێك پیاوەتی خۆی بنوێنێ. دلێری خۆی بنوێنی.

شار لە عاشقان خاڵییە و خواجە لە پیاوێك / مەردێك ئەگەڕێ کـە پیـاوەتی خـۆی نیـشان بدات و لەم بارودۆخە ناهەموارەدا — کە شار لە عاشقان خاڵییە — کارێك بکـات. ئـەو کـارە چییە کە خواجە خوازیارە مەردێك ئەنجامی بدات. ئەکرێ کاتێ شار عاشقانی لێ بڕاوە، کـاری عەشق و باری عەشق بێت، یاخود ڕێنمایی کەسانی بێت بۆ عەشق، چونکە بەڕاستی چ عەشـق و چ ڕێنمایی بۆ عەشق لێبڕانی دەوێت.

**٧ — کو کریمی که ز بزمِ طربش غمزده‌ای**

**جرعه‌ای در کشد و دفعِ خماری بکند**

کـوا کـەریمێك کـە لەبـەزمی شـادی و تەرەبیـدا خـەمبارێك پێکـی هەڵـدات و خورمـای وەلادەنێت.

غمزده‌ای: خەمبارێك. درکشد: هەڵدات.

خماری: خوماری، گێژی پاش مەست لـە زاراوەی عارفانـدا پـەردەی سـەر مەعـشوق کـە ئەبێتە ڕێگر لەبەردەم بەیەکگەشتنی عاشقان و مەعشوقدا.

لە ڕواڵەتدا پێکێ شەراب خومار مەست تر دەکات، بەڵام پێکی موتریبی عەشقی ئیلاهـی خوماری لادەبات مەبەست لە کەریمیشی مورشیدانی بەزم و تـەرەبن، بۆیـە خواجـە — کـە لـە بەیتی پێشوودا خوازیاری مەردێك بوو کە هـەمان مورشـید بـوو — لێـرەدا دیـسانەوە لـەدوی مورشیدێکی بەخشندە وێڵە کە عاشقانی پەردە لەسەر دڵان بە بادەی عەشقی ئـەزەلی مەسـت بکاتەوە و بە دیداری یاریان شاد بکاتەوە.

**٨ — یا وفا یاخبرِ وصل تو مرگِ رقیب**

**بازی چرخ یکی زین همه کاری بکند**

(خۆزگە) سەرئەنجام دەستی (یاری) گەردوون یەکێ لەم سێ شتەی ئەنجامدەدا: یـا وەفـا یـا هەواڵی وەسڵی تۆ یا مەرگی ڕەقیب.

**٩ — حافظا گر نروی از درِ او، هم روزی**

**گـذری بر سرت از گوشه کناری بکند**

ئەی حافظ گەر لەبەردەرگای نەڕۆیت دوورنەکەوێتـەوە — ڕۆژێـك لـە گۆشـە و کەنارێکـدا گوزەرێکت بەسەردا دەکات.

نروی از در او: لەبەر دەرگای دوورنەکەوێتەوە، بەردەوام بـی و وازنـەهێنی، بـێ ئومێـد نەبی و ڕوو وەرنەچەرخێنی. خواجە بەردەوامی لە عەشقدا دەکاتە مەرجی وەسـڵ بـەخۆی و



دەڵێ، حافظ گەر لە عەشقی یاردا بەردەوام بێت و ئاستانە و بەردەرگای عەشقی ئەو بـەجێ نەهێڵی، حەتمەن ڕۆژێك بەئاوات دەگەیت و (گەر لە گۆشە و کەنارێکیشدا بێـت) یـار دێتـە سەر جێگە و ژوانی عەشقت.

## غەزەلی سەد و هەشتا و شەشەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی محزوف**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)**

**١ — کلك مشکین تو روزی که ز ما یاد کند**

**ببرد اجر دوصد بنده که آزاد کند**

گەر رۆژێك قەڵەمی میسکباری تۆ یادمان بکاتەوە، ئەجر و پاداشت ئازاد کردنی دووسەد بەندە بەدەست دەهێنێت.

کلك مشکین: قەڵەمی میسکبار، یاخود قەڵەمی رەش، چونکە مشکین بەواتای رەش و میسکباریش دێت، گەر قەڵەمی میسکبار بێت مەبەست لە بۆنی خۆشی نووسینەکەیە و گەر رەشیش بێت مەبەست لە رەنگی قەڵەمەکەیە.

خواجە بەیار دەڵێت گەر رۆژێك قەڵەمی میسکبار و رەشی تۆ لوتفێك بکات و یادی من بکاتەوە، هێندە پاداشتی دەدرێتەوە و هێندە ئەجری هەیە کە وەك ئەجری ئازاد کردنی دووسەد بەندەیە.

بێگومان ئازاد کردنی بەندە لە ئیسلامدا خێرێکی گەورەی هەیە و لە قورئاندا زۆر هاندراوە و تەنانەت هەندێ جار بە یەکێك لە عقوبەکان (فدیەدان) دانراوە — واتە لەکاتی سەرپێچییەکدا گەر موسڵمان بەندەیەك ئازاد بکات خواڵیی رازی دەبێت. بڕوانە قورئانی پیرۆز ئایەتی: (٩٢) سورەتی (النساء) لەباسی کوشتنی بەبێ مەبەست (غیر عمدی)، ئایەتی (٨٩)ی سورەتی (المائدە) لە باسی سوێند خواردن و شکاندنی سوێندکەدا، ئایەتی (٣)ی سورەتی (المجادلە)) لە باسی کێشە خێزانییەکاندا...

**٢ — قاصد حضرت سلمی که سلامت بادش**

**چه شود گر به سلامی دل ما شادکند**

چ دەبێ، گەر نامەبەری دیاری سەلما — سەلامەت بێت — بەسەلامێك دڵی ئێمە شاد کات.

حضرت: دیار، کەلای سەلماوە دێت، حزور.　　سلامت بادش: سەلامەت بێت.

خواجە سەرەتا دوعا و نزا بۆ قاسد و نامەبەری لای یار دەکات و پاشان دەڵێ چ دەبێ گەر ئەو نامەبەرە لە حزوری سەلما (یار)ەوە بێت و سەلامێکی ئەومان بۆ بهێنێ.

**٣ — امتحان کن که بسی گنج مرادت بدهند**

**گر خرابی چو مرا لطف تو آباد کند**



تاقیکەرەوە (بزانە) کە گەنجینەی زۆری ئاواتت دەدەنێ، گەر لوتفی تۆ وێرانەیەکی وەك من ئاوەدان بکاتەوە.

امتحان کن: تاقیکەرەوە　　بدهند: بدەنێ.

ئاوات و ئارەزووی بەگەنجینەیەکی بە نرخ داناوە بەمەعشوق دەڵێ، لوتف و خۆشەویستی تۆ من — کە وەك وێرانە وام — ئاوەدان و چاك دەکاتەوە. گەر بە خۆشەویستی و لوتفی خۆت وێرانەی دڵم ئاوەدان بکەیتەوە بە ئاوات و ئارەزووی زۆری خۆت دەگەیت، تۆتاقی بکەرەوە و بزانە وانییە.

**٤ — یارب اندر دل آن خسرو شرین انداز**

**که به رحمت گذری بر سرِ فرهاد کند**

خوایە (پەروەردگار) بیخمە دڵی ئەو خوسرەوی شیرینەوە، کە بە میهرەوە گوزەرێ بەلای فەرهاد دا بکات.

اندر: لەناو، ناو.　　اندر دل انداختن: خستنە دڵەوە.　　اندردل انداز: بێخە دڵییەوە.

خوسرەوی شیرین، پاشای جوان و دەستگیرانی شیرینە، بەڵام لێرەدا ئاماژە نییە بەداستانی سەرنجڕاکێشی شیرین و فەرهاد (شیرین و خوسرەو) بەڵکو خواجە ناوەکانی بۆ مەبەستی دیکە بەکار هێناوە.

ئەو دەڵێ: خوایە ئەوە بخەیتە دڵی ئەوە پادشای جوانی و رەفتار جوانییەوە کە بەرەحم و میهرەبانییەوە لایەك لە فەرهادی زەحمەتکێش بکاتەوە. واتە خوایە والە پادشا بەختەوەر و گەروەکان بکە کە بە میهرەوە لابەلای عاشقاندا بکەن و ئاوڕیان لێ بدەنەوە.

**٥ — شاه را به بود از طاعت صد ساله و زهد**

**قدر یکساعته عمری که دَرو داد کند**

گەر پادشا هێندەی کاتژمێرێکی تەمەن دادپەروەری بکات چاکترە لە تاعەتی (بەندایەتی) سەد ساڵە و زوهد.

درو: تیایدا.　　دادکند: دادپەروەری بکات، عادل بێت.

خواجە عەدل و دادپەروەری یەك کاتژمێری پادشایەك بە چاکتر لە عیبادەت و بەندایەتی و زوهدی سەد ساڵ ئەداتە قەڵەم.

**٦ — حالیا عشوەی عشق تو ز بنیادم بُرد**

**تا دگر باره حکیمانه چه بنیاد کند**

ئێستا ناز و عیشوەی عەشقی تۆ وێرانم دەکات، تا بزانین پاشان حەکیمانە چی دروست دەکات.

زبنیادم برد: لەبناغەوە دەرم دەهێنێ، لە ریشەوە وێران دەكات.

خواجە لەم بەیتەدا دەڵێ: ئەی یار ئێستا ناز و عیشوەی عەشقت بەتەواوی داغانم دەكات و لە ریشەوە تێكمدەدات، بزانین مەبەست لەم تێكدانە چییە و پاشان بە چ شێوەیەكی عاقڵانــە و حەكیمانە دروستی دەكاتەوە.

**٧ — گوهر پاك تو از مدحت ما مستغنیست**

**فكر مشّاطه چه با حسن خداداد كند**

گەوهەری پاكی تۆ (سروشتت) پێویستی بە پێداهەڵدانی ئێمە نییە، بیری ئارایشتگەر چییە لەبەرامبەر بە جوانی سروشتی (خواداو).

مدحت: ستایش، پیاهەڵدان، مەدح.   مشّاطه: ئارایشتگەر

خواجە بەیاری جوانی دەڵێت: گەوهەر و سروشتی پاكی تۆ (ئــەی یــار) ئەســڵەن پێویــستی بەوە نییە ئێمە مەدح و ستایشی بكەین. (یار لە مەدحی عاشقان موستەغنییە) بیر و فیكـری ئارایشتگەر لەبەرامبەر جوانی خودا و سروشتیدا چی پێ دەكرێت و جوانی دەسـتكرد چـۆن بـە جوانی سروشتی و خودایی (كە یاری حەق هەیەتی) دەگات.

**٨ — ره نبردیم به مقصود خود اندر شیراز**

**خرّم آن روز كه حافظ رهِ بغداد كند**

لە شیراز جا رێمان لە موراد و ویستی خۆمان نەكەوت، خۆشە ئەو رۆژەی كە حافظ رێگەی بەغداد بگرێتەبەر.

رەنبردیم: رێمان لێی نەكەوت، پەیمان پێی نەبرد.

رە بغداد كند: رێگەی بەغدا بگرێتەبەر.

خواجە رەخنە لە شیراز دەگرێت كە كەسی تیادا بە ئاواتی خۆی ناگات و چـاكتروایە شـیراز بەجێ بهێڵێ و رێگەی بەغدا بگرێتەبەر.

بە گوتەی خوالێخۆشبوو (قزوینی) ئـەم غەزەلـە بـۆ سـلطان احمـد جلایـر (٧٨٤ — ٧١٣) نووسراوە و ئەكرێ ئامۆژگاری كردبێ { هەروی، ج ٢، ل٧٩٥}.



## غەزەلی سەد و هەشتا و حەوتەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی مەقسور**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلان)**

**١ — بعد ازین دست من و دامن آن سروِ بلند**

**كەبالایِ چمان از بن و بیخم بركند**

پاش ئەمە دەستی من و داوێنی ئەو سەروە بەرزە، كەبە بـاڵای بـە لەنجـەی لـەبن و بـێخم (رەگ و ریشەم) هەڵدەكێشێ.

دست من و دامن آن: دەستی من و داوێنی ئەو، پاڕانەوە و داوا كردن.

چمان: بەلەنجە رۆیشتن، بەناز رۆیشتن.   بالای چمان: قەد و باڵایەك كە بەلەنجە دەڕوات.

بن و بیخ: رەگ و ریشە، بێخ و بن.

خواجە دیلی و ئەسیری دڵی خۆی بۆ یار دەخاتەڕوو، دەڵێ: ئێستا كـاتی كـە ئـەو یـارە بەژنرێكە بەلەنجە و لارە لەرە گوریشەم دەردەهێنێ و من گرفتـاری عەشـقی خـۆی دەكـات، ناچارم لەمەودوا دەستم بە دامێنییەوە بگرم، واتە: لەمەوپاش هەرگیز لە یار جودا نابمـەوە و لەبەری دەپاڕێمەوە و دەستەودامێنی دەبم، چونكە لە رەگ و ریشەی دەرهێنـاوم و گـیرۆدەی عەشقی بووم.

**٢ — حاجتِ مطرب و مِیْ نیست تو برقع بگشا**

**كە بە رقص آوردم آتشِ رویت چو سپند**

پێویست بە موتریب و مەی ناكات، تۆ رووبەند لادە، تا ئـاگری رووت مـن وەك (سـپەند) بخاتە سەما.

حاجت نیست: پێویستی ناكات.  برقع: رووبەند، پەچە.   برقص آوردم: دەمهێنێتە سەما.

لەرزینی (سپەند)ی لەسەر ئاگر بەسەما و خۆشی بە سپەند و رووی یاریشی بەئاگر داوەتـە قەڵەم، خواجە لەم بەیتەدا لە پلە بەرزەكانی عیرفان دەدوێ كەتیایدا عارف پێویستی بەمورشید نامێنێ تا بكەوێتە سەمای عەشق. بەیاری حەق دەڵێ، من وەك دەروێشانی سەماعی پێویستم بە دەفژەن — مورشید — و مەی نییە تـاوەكو بكەمـە سـەماع — سـەمای دەروێـشانە — تـا ئەوەندەم بەسەكە تۆ رووی خـۆتم بـۆ دەرخـەیت و پەچـە / رووبەنـد لـە رووخـسارت لادەی — جیلوەبكەیت — چونكە رووت وەك ئاگرێكە و منیش ئەسپەندم و دەمهێنێتەوە سەما.

**٣ – هيچ رويى نشود آينه‌ى جمله‌ى بخت**

**مگر آن روى كه مالند در آن سُم سمند**

هيچ روويەك نابێتە ئاوێنەى بووكى بەخت، مەگەر ئەو رۆژەى كە بەرگەى سمى ئەسپى گرتبێ.

جملە: كەل و پەلى بووك، مالند: بمالّن سُم: سم سمند: ئەسپ

آينە جملە بخت: ئاوێنەى كەل و پەلى بووكە كە بووك سەيرى خۆيى تێدا دەكات.

خواجە لێرەدا بەخت و هەولّ پێكەوە گرێ دەدات و پێى وايە كە بەخت بە هەولّ و سەبوورى بەدەستدێت و دەلّێ: كەسێك شايانى ئەوەيە كە بێتە ئاوێنەى بووكى بەخت و بەخت خۆيى تێدا ببينێت – كەسێ شايانى بەختى چاكە – كەسمى ئەسپى بەسەردا چووبێت و بەرگەى نارەحەتى و مەينەتى گرتبێ.

**٤ – گفتم اسرارِ غمت، هر چه بُوَد گو مى باش**

**صبر ازين بيش ندارم چه كنم تاكى و چند**

نهێنى خەمتم دركاند، هەرچى دەبێ بابێ، لەمە زياتر ئارامم نييە چى بكەم تاكەى و چەند.

گفتم: دركاندم، گوتم ازين بيش: لەمە زياتر

بێگومان خواجە زۆر جەخت لە نەدركاندنى نهێنييەكانى عەشقى ئيلاهى – غەمى عەشق – دەكاتەوە كەچى لێرەدا پيچەوانەى ئەم بيرە دەردەكەوێت. بۆيە پێويستە ئەوە بزانرێت ئەم بەيتە و – غەزەلەكەش – كاردانەوەى مەقامى فەنايە لاى عارف، كە تيايدا عارف جياوازى لەنێوان شتەكاندا – عاشق و مەعشوق – ناكات و بێ ئاگايە لەو قسانەى كە دەيانكات و لەو رەفتارانەى كە دەياننوێنێ. زۆربەى ئەو قسانەى كە – لاى فەقيهەكان- بە شەتەحيات – قسەى حەلەق و مەلەق – دەدرێنە قەلّەم لەم مەقامە گوتراون، بۆ نموونە – انا الحق – ى حەللاج يەكێكە لە نهێنييەكانى كە سەرى لە رێيدا دانا.

حافظ دەلّێ: لەفەنادا – باكم لە دركاندنى نهێنى نامێنێ و نهێنييەكانى عەشقى تۆ دەدركێنم و هەرچى دەبێ با ببێ، چونكە ئيدى لەمە زياتر ئارامم نەماوە تاكەى و چەندە ئارام بگرم.

**٥ – مكش آن آهوىِ مشكينِ مرا اى صيّاد**

**شرم از آن چشمِ سيه دار و مَبَنْدَشْ به كمند**

ئەى راوچى، ئەو ئاسكە مسكيدارەى من مەكوژە، شەرم لەو چاوەرەشانەى بكە و بە كەمەند مەيبەستەوە.



مكش: مەكوژە آهوى مشكين: ئاسكى ميسكدار، ئەو ئاسكەى كە ميسكى لێ دەردەهێنرێ.

شرم دار: شەرم بكە. مبندش: مەيبەستەوە، مەيگرە.

ئاسك رەمزى جوانييە و جوانييەكەى جوانى مەعشوقمان بير دەهێنێتەوە، چونكە هەر جوانييەك لە هى يارى حەق دەچێت، د. قمشەاى گوتەنى، هەر گولّێك ئيمزايەكى خودايە. بۆيە لێرەدا خواجە بەراوچيان دەلّێ: ئاسكى ميسكدار – كە يارمان بيردەخاتەوە – مەكوژە و مەخە بەندەوە و شەرم لەچاوى رەشى – جوانى – بكە.

**٦ – منِ خاكى كه ازين در نتوانم برخاست**

**ازكجا بوسه زنم برلبِ آن قصرِ بلند**

منى خاكى – خۆلّى – كەناتوانم لەم بەردەرگايە هەستم، چۆن دەتوانم ليوارى (سەربانى) ئەو كۆشكە بەرزە ماچكەم.

خاكى: خاكى، بەواتاى بێ هێز و نزم بێت. نتوانم برخاست: تواناى هەستانم نييە، ناتوانم هەستم.

بوسە زنم: ماچكەم لب: پاسار، سەربان.

خواجە بێ هێزى خۆى لەبەرامبەر يارى گەورە و بەرزدا دەردەخات و دەلّێ منى خاكى و بێ هێز كە بەردەوام لەم بەردەرگاى ياردا كەوتووم و تواناى هەستانەوەم نييە، چۆن ئەتوانم هێندە بەرز ببمەوە كە پاسارى يا بەرزى ئەو كۆشكەبەرزە ماچكەم. ئەكرێ كۆشكى بەرز مەقامى فەنا يا وەسلّى مەحبوب (يا نهێنى عەشق) بێت.

**٧ – باز مستان دل از آن گيسوىِ مشكين حافظ**

**زانكه ديوانه همان بهِ كه بُوَد اندر بند**

حافظ، ديسانەوە دلّى لەو پرچە ميسكبارە مەسەنەرەوە، چونكە شێت وا چاكترە لە بەنديدا بێت.

مستان: مەسەنەرەوە بود اندر بند: لە بەندا بێت، بەسترابێتەوە.

دەمێكە خواجە دلّى خۆى بە مەعشوق و راز و نهێنييە ئيلاهييەكان داوە، دەلّێ گومانێك بۆ وازهێنان لە عەشق لاى خواجە سەرى هەلّداوە، يا خود هەر بۆ دووبارە كردنەوەى واى خۆيەتى – لە روانگەى عەقلّييەوە – دەلّێ: تۆ دلّى ديوانە و شێتى عەشقى خۆت لە بەندى زنجيرى زولّفى يار و رازەكان مەسەنەرەوە، چونكە دلّى عاشق وا چاكترە هەر لە بەندى عەشقدا بمێنێتەوە.

شياوى ئاماژەپێدانە ئەم غەزەلە لە هەموو نوسخە باوەڕپێكراوەكاندا نەهاتووە.

## غەزەلی سەد و هەشتا و هەشتەم:

**بەحری رەجەزی هەشتی تەواو**

**مستفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن**

**١ — آن کیست کز روی کرم با من وفاداری کند**

**بر جای بدکاری چو من یک دم نکوکاری کند**

ئەو کەسە کێیە کە لە رووی کەرەمەوە لەگەڵ مندا وەفاداربێت، دەرحەقی بەدکارێکی وەك من ساتێ چاکەم لەگەڵ بکات.

برجای: لەجیاتی لەبری، دەرحەق، یك دم: ساتێك، هەناسەیەك.

خواجە لە رووی بەوەفایەك دەگەڕێت کە لە رووی کەرەم و بەخشندەوەیی خۆیەوە لەگەڵیدا بەوەفا بێت و چاکەی لەگەڵدا بکات. بەوەفایی لەوکاتەدا دەردەکەوێ کە کاتێ بەرامبەر خراپەشی کرد هێشتا هەرچاکەی لەگەڵدا بکەیت، بۆیە ئەو دەڵێ، کوا بەوەفایەك — وەفادارێك — لە رووی بەخشندەییەوە دەرحەق بەبەدکار و گوناهکارێکی وەك من بۆ ساتێ چاکەیەك بکات، کەچاکەکەش بریتی یە لە:

**٢ — اوّل به بانگِ نای و نی آرد به دل پیغام وی**

**و آنگه به یک پیمانه میْ با من وفاداری کند**

سەرەتا بە دەنگی گۆرانی و نەی پەیامی ئەو بۆ دڵ بهێنێ و ئەو کاتەش بە پێکێکی مەی وەفاداریم لەگەڵ بکات (هاودەمم بێت).

اوّل: یەکەمجار، سەرەتا. بانگ: دەنگ.

نای: گەرو، نەی (لێرەدا بەواتای گەرو هاتووە و مەبەست لێی گۆرانی و ئاواز گوتنە.)

آرد: بهێنێ آنگە: ئەوکاتە، دوایی

بامن وفاداری کند: ببێتە هاودەمێکی من (بەوەفا بێت لەگەڵمدا — لە عەشقدا) ئەو چاکەیەی کە خواجە داوای دەکات کەکەسێ ساتێ لەگەڵ بەدکارێکی وەك ئەمدا ئەنجامیبدات ئەمەیە کە: بەدەنگی خۆش و ئاوازی نای (بەشێك لە سەمای سۆفییان) پەیامی ئەو (یار) بۆ دڵم بهێنێ و پاشان لە مەراسیمی عەشقدا — شەڕاب نۆشیندا — هاودەمی و هاوپێکم بکات.

بە کورتی خواجە دەیەوێ کەسێك چاکەیەك دەرحەق بەم گوناهکارە بکات و لە حاڵەتی — قبض — دەری بهێنێ و بیخاتەوە نێو حاڵەتی — بسط —ەوە.

**٣ — دلبر که جان فرسوداز و کام دلم نگشود ازو**

**نومید نتوان بود ازو باشد که دلداری کند**



دولبەر کە گیانم لە ئازاری شاراوەیی ئەودا داڕزا و دڵم بەئاواتی ئەو نەگەیشت و ناتوانرێ لێی بێ ئومێد بێت، بەڵکو دڵمان بداتەوە.

فرسود: کەمبوونەوە، کەم کردنەوە، بێهێزبوون، دارزان، مەحومکردنەوە، ئازاردان.

کام دل نگشود: دڵم بە ئاوات نەگەیشت، بەئاواتی دڵم ئەشکێت.

نومید: نائومێد.

خواجە باسی یار — حەق — دەکات کە بە نادیاری و دووری لەو بووەتە هۆی ئەو کە گیان لە دووری ئەو ئازار بکێشێ و برزێت و دڵ بە مەرام نەگات — وەسڵ — بەڵام مرۆڤ ناکرێ لە لوتفی ئەو بێ ئومێد بێت — لاتقنطو من رحمە اللە — چونکە رۆژی دڵی عاشقان دەداتەوە و بە ئاواتی دڵیان دەگەیەنێت.

**٤ — گفتم گره نگشودەام زان طرّه تا من بودەام**

**گفتا منش فرمودەام تا با تو طرّاری کند**

گوتم: لەوەتی هەم گرێیەکی پرچی لوولتم نەکردۆتەوە، گوتی: من پێم گوتووە کەلەگەڵ تۆدا فریوکاری بکات.

تا من بودەام: لەوەتی هەم. منش فرمودەام: من پێم گوتووە. طراری: فریوکاری، حیلە بازی.

خواجە دەڵێ: گوتم بەیار لەوەتی هەم نەمتوانیوە گرێیەکی زوڵفی لوولت بکەمەوە کەچی یار وتی: خۆم پێم وتووە فریوت بدات و ئەسیری خۆیت بکات.

لە زاراوەی عیرفانیدا پرچی لوول رازی ئیلاهییە و کردنەوەش پەی بردنە بەو رازانە، بەڵام خواجە دەڵێ، لە (رۆیا) دا بە یاری حەقم گوت بۆچی ناتوانم پەی بە رازی تۆ ببەم فەرمووی خۆم فەرمانم پێداون کە بەوشێوە بن و نەتوانن پەیبیان پێ ببەن.

**٥ — پشمینە پوشِ تندخو از عشق نشنیدست بو**

**از مستی اش رمزی بگو تا ترک هشیاری کند**

خوری پۆش (سۆفی) روگرژ بۆنی عەشقی نەکردووە، رەمزێکی لەمەستی پێ بڵێت واز لە وشیاری بهێنێ.

پشمینە پوش: خۆری پۆش، سۆفی (چونکە سۆفییان بەرگی لە خوری دروستکرویان لەبەردەکرد).

تندخو: تورە، رووگرژ.

خواجە بە خۆی یاخود بە عارف دەڵێت: کە سۆفی وشکی توڕە و رووگرژ بوونێکی عەشقی نەکردووە و هیچ لە عەشقی ئیلاهی نازانێت. تۆ رەمز و رازێکی عەشقی ئیلاهی (مەستی) بۆ باس بکە تاوەکو واز لە هۆشیاری — عەقڵ — بهێنێت و کەمندکێش راز و رەمزەکانی عەشق ببێت.

**٦ — چون من گدای بی نشان مشکل بود یاری چنان**

**سلطان کجا عیشِ نهان با رندِ بازاری کند**

بۆ گەدایەکی بێ ناونیشانی وەك من بوونی یارێکی وا ئەستەمە، کەی سوڵتان لەگەڵ رەندی بازاڕیدا کۆڕی پەنهانی عەشق رێکدەخات.

بێ نیشان: بێ ناونیشان     مشکل بود : ئەستەمە     بازاری: بازاڕی

خواجە خۆی بەگەدا و سواڵکەری بێ ناونیشان دەزانێت و یاریش بەسۆڵتانی جوانان دەداتە قەڵەم و دەڵێ: زۆر ئەستەمە کە گەدایەکی بێ ناونیشانی وەك من یارێکی وای هەبێت، گەر کۆڕی عەیش و عەشرەت هەبێت یار کە سوڵتانە لەگەڵ منی رەندی بازاڕیدا ئەو کۆڕە رێك ناخات لەم بەیتەدا خواجە خۆی بەشایانی یار نازانێت.

**٧ — زان طرّەی پر پیچ و خم سهل است اگر بینم ستم**

**از بند و زنجیرش چە غم هر کس کە عیّاری کند**

ئاسانە گەر لەو پەرچەمە پرپێچ و لوولەیەوە ستەم ببینم (دوچاری ستەم بم) چونکە هەر کەس دزی، (عەیاری) کردۆتە پیشە چ باکی لە زنجیر و کۆتی ئەو هەیە.

بینم ستم: ستەم ببینم، دوچاری ستەم بم.     عیّاری: دزی، عەیاری و عەیاران دەستە جەردەیەك بوون کە لە دزی کردندا رێوڕەسمی تایبەتیان هەبووە و جوامێریش بوون.

خواجە دان بەوەدا دەنێت کە رێگەی عەشق رێگەیەکی پڕ ئازارە، بەڵام عاشقان وەك دزان وان باکیان لە کۆت و زنجیر و ئازار نییە، ئەو دەڵێت: زۆر ئاسانە گەر لەو پەرچەمە لوولەی یارەوە ستەم ببینم و دوچاری ئازار ببم و باکم نییە، چونکە من عاشقی ئەوم و عەیارێکم (دزێکم) و باکم لە کۆت و بەندی پرچی یار نییە.

**٨ — شد لشکرِ غم بی عدد ازبخت می خواهم مدد**

**تا فخرِ دین عبدالصّمد باشد کە غمخواری کند**

لەشکری غەم بێ سنوورە، داوای یارمەتی لەبەخت ئەکەم، تا بەڵکو شانازی ئایین (عبدالصمد) غەمم بخوات و رزگاری بکات.

مدد: یارمەتی     فخردین: شانازی ئایین     غمخواری: خەمخۆری



عبدالصمد: مەولانا بهالدین عبدالصمد بن عوسمان البحر ابادی الاسفراینییە لە زانا بەرزەکانی سەدەی هەشتەمە و هاوسەردەمی حافظ و لە شیراز بووە، ساڵی ٧٨٦، کۆچی دوایی کردووە — شەش ساڵ بەر لەکۆچی دوایی حافظ — { هەروی، ج ٢، ل٨٠٢} و { معینیان، ل٣٢١} .

لە رووی رواڵەتی بەیتەکەوە خواجە ستایش زانای گەورەی شیراز عبدالصمد بحرآبادی دەکات کە غەمی سەرشانی خواجەی سووك کردووە و دەڵێ داوا لە بەخت دەکەم یارمەتیم بدات تابەڵکو ئەو غەمم بخوات و ئەم خەمە زۆرەم لە کۆڵ بکاتەوە.

لە زاراوەی عیرفانیدا غەم (قبض)ە و — عبدالصمد — مورشیدی کاملی جێگەی راز و نیازە و ئەبێتە مایەی شانازی ئایین...

**٩ —با چشم پر نیرنگِ او حافظ مکن آهنگ او**

**کان طرّەی شبرنگ او بسیار مکاری کند**

حافظ بە چاوی پڕ فریویەوە نیازی لای ئەوت نەبێ، چونکە ئەو پرچە رەشەی ئەو فێڵبازی زۆر دەکات.

نیرنگ: فریو.     شبرنگ: رەنگی وەك شەو، رەش.

مکن آهنگ او: نیازی رۆیشتن بۆلای ئەوت نەبێ، بیر لە فرۆشتن بۆلای ئەو مەکەرەوە.

خواجە بەخۆی دەڵێ، بە چاوانی فریودەری یارەوە بیر لە رۆیشتن بۆلای یار مەکەرەوە، چونکە پرچی رەشی شەوئاسای فرۆفێڵی زۆرت لێدەکات و دەتخاتە داوەوە و گرفتاری کەمەندی خۆیت دەکات.

لە زۆربەی نوسخەکاندا لەبری (مکاری) (طراری) هاتووە کە(تقریباً) بەهەمان واتا دێت، بەڵام ئێمە لێرەدا پەیڕەویمان لە نوسخەی عیوض کردووە.

## غەزەلی سەدو هەشتا و نۆیەم:

**بەحری رەجەزی هەشتی مەتوی مەخبون**

**(مفتعلن مفاعلن مفتعلن مفاعلن)**

**١ — سروِ چمانِ من چرا میلِ چمن نمی کند**

**همدمِ گل نمی شود یادِ سمن نمی کند**

(سەرو)ی خەرامانی من مەیلی چیمەن و گوڵزار ناکات، نابێتە هاودەمی گوڵ و یادی یاسەمەن ناکات.

چمان: خەرامان، رۆیشتن بەلەنجەولار، بەناز. سمن: یاسەمەن.

مەبەست لە دارسەروی بەژنرێکی بەلەنجەولار و خەرامان، مەعشوقە و خواجە دەڵێ: نازانم بۆچی یاری خەرامان تاقەتی باغ و گوڵزاری نییە و نابێتە هاودەمی گوڵ و بیری یاسەمەن ناکاتەوە.

**٢ — دی گلەای از طرّەاش کردم و از سرِ فسوس**

**گفت کە این سیاەِ کج، گوش بە من نمی کند**

دوێنێ گلەییەکم لە پرچی کرد و بە گاڵتەوە گوتی، کە ئەم رەشە لارە بە گوێی من ناکات.

از سرفسوس: بەگاڵتە پێکردنەوە.

سیاە کج: رەشی لار (مەبەست لە پرچێتی) غولامی لار و بێ گوێ

گوش بە من نمیکند: بە گوێی من ناکات.

هەمیشە (موو پرچ)ی یار مایەی شاردنەوەی راز و نهێنییەکانی یار و رووی جوانی ئەوە بۆیە هەمیشە عارف / عاشقان گلەییان لە پرچی یار / پەردەی سەر نهێنییەکان هەیە و کەچی چاکیش لەوە بە ئاگان کە پرچی یار لەژێر فەرمانی خودی یاردایە و یار خۆی لوولی ئەکات و ئەیکاتە پەردە بۆیە خواجە ئیدی خۆی پێناگیرێت و ئەم گلەییەی لای یار دەدرکێنێ و کەچی...، ئەو دەڵێ: دوێنێ گلەییەکم لە پرچی کرد- کە روویم لێ دەشارێتەوە و دەبێتە پەردەی سەر رازەکان - کەچی بەگاڵتە پێکردن و مەسخەرەوە گوتی، چی بکەم ئەو رەشە لارە (یا غولامی بێ گوێیە) بە گوێی من ناکات.

**٣ — تا دلِ هرزەگردِ من رفت بە چینِ زلفِ او**

**زان سفرِ درازِ خود عزمِ وطن نمی کند**



لەوکاتەوەی کە دڵی گەڕاڵی من چووەتە نێو چینی پرچی ئەوەوە، لەو سەفەرە درێژەی خۆیدا نیازی هاتنەوە بۆ نیشتیمانی نییە.

تا: [لێرەدا ]، لەوکاتەوەی. هرزە گرد: گەڕاڵ، بێ هودە گەڕ.

چین زلف: چینی پرچ یاخود وڵاتی چینی پرچ (بە هۆی دوورییەوە لە بەیتەکەدا سەفەری تولانی و دوور و درێژ هاتووە).

عزم وطن نمی کند: نیازی نییە بگەڕێتەوە بۆ نیشتیمان.

خواجە دڵی خۆی بە گەڕاڵ دەداتە قەڵەم کەسەربەهەمموو کون و قوژبنێکدا دەکات، بەڵام دەڵێ: لەوکاتەوەی کە ئەم دڵە گەڕاڵەم چووتە چینی زوڵفی ئەوەوە و گرفتاری پرچی بووە یاخود سەفەری تولانی بۆ وڵاتی چینی پرچی یار کردووە (کە وڵاتی چین پڕە لەعەتر و دوورە و پرچی یاریش بۆنخۆشە). ئیدی لەوێ ماوەتەوە و نیازی نییە بگەڕێتەوە بۆ سینە و قەفەسی سنگی من کە نیشتیمانی خۆیەتی.

واتە: دڵم گیرۆدەی چینی پرچی یار بووە و لەسنگیدا نەماوە و ناشیەوێت بێتەوە.

**٤ — پیشِ کمان ابرویش لابە همی کنم ولی**

**گوش کشیدە است از آن گوش بە من نمی کند**

لەبەردەم کەوانی برۆیدا زاری و داوادەکەم، بەڵام گوێی راکێشراوە و بۆیە گوێ بە من نادات، گوێ لەمن ناگرێ.

لابە: گریان و زاری، داوا و پاڕانەوە همی کنم / میکنم: دەکەم. از آن: بۆیە

گوش کشیدە است: گوێ راکێشراوە — مەبەست لە کەوانە کە راکێشراوە و لە حاڵەتی تەقاندنی تیرەکەیدا — لەبەردەم کەوانی برۆی یاردا گریان و زاری دەکەم و دەپاڕێمەوە کە رووی نەکاتە من و تیرم تێ نەگرێت، بەڵام ئەو ئامادەیە بۆ تەواندن و لەسەر پێیە و گوێی لە من نییە.

**٥ — با همە عطفِ دامنت آیدم از صبا عجب**

**کز گذرِ تو خاك را مشكِ ختن نمی کند**

سەیرم لە سروە دێت کە بەم بۆنخۆشی پالێمی دامێنەی تۆوە، کە چۆن لەکاتی گوزەری تۆدا خاك ناکاتە میسکی خوتەن.

عطف دامن: پالێمی کراس، دامێنی کراس، کە هەڵدەقەمچێتەوە و جاران بۆ بۆنخۆشی میسك و عەنبەریان پێداکردووە، لۆچی کراس.

آیدم عجب: پێم سەیرە، سەیرم لێ دێ.

مشك ختن: میسکی خوتەن (جۆری چاکی میسك هی خۆتەنە).

دامەنی یار بەعەتر بۆنخۆشە و کاتێ ئەڕوات بە ڕێگادا بۆنی خۆشی بڵاو دەبێتەوە هەمووشتێ بۆنخۆش و عەتر بار دەکات، بۆیە خواجە سەیری لە سروە دێت کە چۆن لەبۆنخۆشی دامەنیەوە خاك ناکات بەمیسکی خۆتەن.

**٦ — چون ز نسیم می شود زلفِ بنفشه پر شکن**

**وه که دلم چه یاد آن عهد شکن نمی کند**

کاتێ شەماڵ پرچی وەنەوشە چین چین دەکات، ئای کە دڵم چ یادکێشی ئەو (یار)ە پەیمان شێکنە ناکاتەوە.

شکن: پێچ و چین چین          عهد شکن: پەیمان شکێن

خواجە پێی سەیرە کە کاتێ بەهارە و شەماڵ پرچی وەنەوشە پڕپێچ و چین چین دەکات کەچی دڵی ئەم هیچ یادی ئەو یارە پەیمانشکێنە بێ وەفایە ناکاتەوە.

بەڕای لاهوری واتە زۆر یادی دەکاتەوە.

**٧ — دل به امیّدِ وصل تو همدم جان نمی شود**

**جان به هوایِ کویِ تو خدمتِ تن نمی کند**

دڵ بە ئومێدی دیداری تۆوە (ئۆقرەی لێ بڕاوە) هاودەمی گیان ناکات، گیانیش بە ئاواتی کۆڵانەکەی تۆوە خزمەتی جەستە ناکات.

تن: جەستە

وەسڵی یار و بەردەرگای یار دڵ و گیانی حافظیان بە تەواوی گرفتار کردووە و نە دڵ لەگەڵ گیانیدا هەڵدەکا و نەگیان گوێ بە جەستەی دەدات، تەنیا و تەنیا ئومێد و ئاواتیان گەیشتن بە وەسڵی دولبەر و چوونە بەر دەرگای یار حەقە.

**٨ — ساقیِ سیم ساقِ من گر همه درد می دهد**

**کیست که تن چو جامِ میْ جمله دهن نمی کند**

ئەگەر ساقیی ئەندام زیوینی من خڵتە (ی بنی کوپەڵەش) بدات، کێیە کە تەواوی جەستە وەك پێك نەکاتە دەم بۆ نۆشینی.

سیم: زیو     ساق: قاچ     سیم ساق: ئەندام زیوین

درد شرابی: خڵتەداری بنی کۆپەڵە     دهن: دەم

ڕووی سەرەوەی پێکی تەواوی دەمەو کراوەیە، خواجە ئەم دەربڕینە بۆ مەبەستی دەرخستنی سەرنجڕاکێشی ساقی بەکار دەهێنێ و دەڵێ گەر ئەو ساقیەی من شەڕاب بە



عاشقان بدات تەواوی عاشقان هەموو جەستەیان ئەکەنە دەم و لە دەستی ساقیی زیون ئەندامی من بە تەواوی حەزەرە مەی دەنۆشن با شەڕابەکەش خڵتەداری بنی کوپەڵەکان بێت و مەیی ساف نەبێت.

لە شەرحی عیرفانیدا ئەم بەیتە بە (رضا — ڕەزامەندی) لە بەرامبەر نارەحەتیدا لێکدراوەتەوە و گوتراوە مادام ناخۆشی و نارەحەتی لە مەعشوقەوەیە ئەوا عاشقان بە خۆشحاڵی و تەواوی گیان و جەستەیانەوە ڕەزامەندی بەرامبەر دەنوێنن. {لاهوری، ج ٢، ل ١٣٠٧}.

**٩ — دستخوشِ جفا مکن آبِ رُخَم که فیضِ ابر**

**بی مدد سرشکِ من دُرِّ عدن نمی کند**

ئابڕووم مەخە بەردەم دەستی جەفای خۆت، چونکە باران (ڕەحمەتی هەور) بێ یارمەتی فرمێسکی من ناتوانێ دوڕی عەدەن دروستبکات.

دستخوش: خستنە بەردەم، دانەبەر

آب رخ: ئاوی ڕوو، مەبەست ئاوی ڕوو: (فرمێسك یا ئابڕووە)

فیض ابر: ڕەحمەتی هەور، مەبەست لە ڕەحمەتی هەور بارانە.

در عدن: مرواری عەدەن، مرواری دەریا / شاری عەدەن کە جۆرێکی بەناوبانگی مرواری بووە.

خواجە باسی گرانبەهایی فرمێسکی خۆی دەکات / یاخود باسی گەورەیی عارف و مرۆڤی فرمێسك ڕێژ دەکات و بەیار دەڵێت: ئابڕووم مەکە بە قوربانی زوڵم و جەفای خۆت، چونکە فرمێسکی من هێندە بە نرخە کە باران ناتوانێ بەبێ یارمەتی ئەو مرواری دەریای عەدەن دروستبکات.

**١٠ — کشتەی غمزەی تو شد حافظِ ناشنیده پند**

**تیغ سزاست هرکه را دردِ سخن نمی کند**

حافظی گوێ نەگر لە ئامۆژگاری بووە کوژراوی خەمزەی تۆ، هەر کەس گوێ لە قسە نەگرێت (قسە کاری لێ نەکات) شایانی شمشێر (کوشتن)ە.

ناشنیده پند: گوێ لە پەند و ئامۆژگاری نەگر          سزاست: شایانیەتی

درد سخن نمی کند: قسە کاری لێ ناکات، گوێ لە قسە ناگرێت.

حافظ گوێی لە پەند و ئامۆژگاری گەورەکان نەگرت و بووە کوژراوی خەمزەی تۆ، بەڕاستی ئەم کوشتن و کوژرانە شایانی خۆیەتی، چونکە هەر کەس قسە و پەند کاریگەریی لەسەری نەبێت هەر شایانی شمشێرە. د. هروی لە شەرحی میسراعی دووەمدا نووسیویەتی: هەر کەس

قسە کاری لێ نەکات سزای ئەو کوشتنە. لەڕاستیدا لێرەدا د.هروی (سزا)ی بە سزا و پاداشتی خراپە لێکداوەتەوە، بەڵام گەر وردتر لەبەیتەکە بڕوانرێت و (سزا) بە شایان لێکدرێتەوە واتای دروستتری بەیتەکە دەردەکەوێت و وا پێدەچێت کە جەنابی د.هروی بە چاکی بۆ واتای بەیتەکە نەچووبێت. {هروی،ج ٢، ل٨٠٧} .



## غەزەلی سەد و نەوەدەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسڵەمی موسبەغ**
**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**١ — در نظر بازیِ ما بیخبران حیرانند**
**من چنینم که نمودم دگر ایشان دانند**

ئەوانەی کە ئاگایان لە نهێنی چاوبازی ئێمە نییە سەرسامن، مــن ئــاوام کــە پیــشانم داوە ئیدی ئەوان خۆیان دەزانن.

نظر بــازی: چــاوبازی، بێگومــان چــاوبازی حــافظ وەك هــەموو زاراوەکــانی دیکــە مانــای بنچینەیی خۆی لەدەست داوە و بەواتای نوێوە بەکاری هێناوە، چاوبازی حەزکردنە لــە ســەیری جوانان و پەریشێوەکان، لە عیرفانیشدا سەیر کردنی جوانی رەهایە لە جەستەی بووندا.

حیرانند: سەرسامن دانند: دەزانن

ئەکرێ بێخەبەران — لــەم بەیتــەدا — هــەمان عــاقڵانی بــەیتی دووەم بێــت و خواجــە وەك هەمیشە — عاقڵان بە بچووکتر لە عارفان دەداتە قەڵەم و دەڵــێ: عــاقڵان - بــێ خەبــەران — سەرسامن لەم چاوبازی عەشقەی ئێمە و لە راز و نهێنییەکانی ناگەن، - من — عارفی رەند — لەناخەوە ئەمەم گوت — چاو بازم — بەڵام عاقڵان خۆیان دەزانن کە چین و ناخیــان ناخەنــەڕوو، حەقیقەتی خۆیان بەخەڵك نالێن. یاخود هەرچی دەڵێن بە من بابڵێن.

**٢ — عاقلان نقطەی پرگارِ وجودند ولی**
**عشق داند که درین دایره سرگردانند**

عاقڵان خاڵی پەرگاڵی بوونن بەڵام عەشق دەزانێ کەلەم بازنەیەدا سەرگەردانن.

بێگومان پەڕگاڵ دووسەری هەیە، یەکێکیان (چەق)ە و ئەوی دیکــەیان (بازنــە) دەکێــشێ. خواجە تانە لە عــاقڵان دەدات و دەڵــێ راســتە عــاقڵان لــەوجوددا — مادیــات — دا چــەقن و سەرچاوەی زانستن بەڵام دەزانێ کە ئەوان لەم بازنــەی شــهود و عەشــقدا — ئــەودیو سروشــت و سەروماددەدا — سەرگەردان و سەرلێشێواون و هیچ نازانن و گــەوەریی و زانــستی عــاقڵان لــە سنووری مادده تێپەڕ ناکات.

**٣ — جلوەگاهِ رُخِ او دیدەی من تنها نیست**
**ماه و خورشید هم این آینه می گرادنند**

تەنیا دیدەی من جیلوەگاهی رووی ئەو نییە، مانگ و خۆریش ئەم ئاوێنەیە دەگێڕن.

جیلوەگاه: جیلوەگا، شوێنی جیلوەی حەق.　　　میگردانند: دەگێڕن

لەم بەیتەدا خواجە ئەو بۆچوونە دەخاتەڕوو کە هەموو شتێکی جوانی بوون — کە هەمووشتێ جوانە — شوێنی جیلوەی جوانی — جمال — ی حەقە. و دەڵێ ئەو تەنیا لە چاوانی مندا جیلوە ناکات بەڵکو خۆر و مانگیش ئەم ئاوێنەی جیلوەیە دەگێڕن و ئەوانیش شوێنی جیلوەی جەمالی حەقن.

**٤ — عهدِ ما با لبِ شیرین دهنان بست خدای**

**ما همه بنده و این قوم خداوندانند**

خوا (لە ئەزەلدا) پەیمانی خۆشەویستی ئێمەی لەگەڵ لەبز(لەڤز) شیریناندا بەست، ئێمە هەموو بەندە و ئەم هۆزەش لەبز شیرینیان سەروەر و خوداوەند ئاسان.

شیرین دهن: ئەوکەسەی کە دەم و لێوی جوانی هەبێت، یان قسە خۆش و شیرین کەلام و لەبز شیرین بێت.

خداوند: خواوەند، لە شەرحی لاهوردا هاتووە کە پاشگری (وند) بەواتای وەك دێت واتە وەك خودا، بەڵام خداوند: بەواتای (سەروەر)یش دێت و هەریەکە مانای تایبەت بە بەیتەکە دەبەخشن.

وەك گوتمان لەم غەزەلەدا باس لە چاوبازی عیرفانی دەکرێت و ئەم بەیتەش لەو روانگەیە گوتراوە.

- گەر خداوند بەواتای سەرەوەر و گەورە بێت ئەوا واتای بەیتەکە بەم شێوەیە یە:

ئێمە هەر لە رۆژی ئەزەلەوە خوا خۆشەویستی شیرین کەلامان خستۆتە دلّمان و پەیمانی خۆشەویستی ئێمەی لەگەڵ ئەواندا بەستووە و بۆیە هەمیشە ئێمە بەندە و غولامین و ئەوانیش شیرین کەلام و دەم و لێو جوانان سەروەری ئێمەن.

- گەر خداوند بەواتای وەك (خودا) بێت واتای بەیتەکە دەبێتە:

ئێمە هەر لە رۆژی ئەزەلەوە خوا پەیمانی خۆشەویستیمانی لەگەڵ جوانان و شیرین کەلاماندا بەستووە، ئێمە هەمیشە غولام و بەندەی ئەوانین کە رواڵەتی تەواوی جوانی رەهای خوای بەرزن و لەخودا دەچن و شوێنی جیلوەی جوانی ئەون.

**٥ — مفلسانیم و هوایِ می و مطرب داریم**

**آه اگر خرقەی پشمین به گرو نستانند**

گیرفان بەتاڵین و ئارەزووی مەی و موتریبمان هەیە، وای ئەگەر خیرقەی خورییان بە بارمتە نەوێت.

مفلسانە: گیرفان بەتاڵین، موفلیسین.　　　به گرو: بەبارمتە، لە حەقیدا.



نستانند: وەرنەگرن، نەیانەوێت.

خواجە دەڵێ: ئێمەی سۆفی کە جگە لە خیرقەیەکی خوری هیچی دیکە شك نابەین و ئارەزووی (مەی و موتریب)ی عەشقی حەقیقییان هەیە، ئەگەر ئەم خرقەیە لە حەق و بارمتەی ئەو عەشقە حەقیقییەدا وەرنەگرن چی بکەین، ترسی خۆی لە رەتکردنەوەی خیرقە لەبری مەی و موتریب ئەخاتەڕوو.

**٧ — لافِ عشق و گله از یار زهی لاف دروغ**

**عشقبازانِ چنین مستحقِ هجرانند**

لافی عەشق لێدان و گلەیی لەیار چ لافێکی درۆیە، عاشقانی ئاوا حەقی دەرکردن و دوورییان هەیە.

عشقبازان: عاشقان　　　زهی: ماشەڵا، وای (بۆ دەربڕینی ئەفسوسە).

یەکێ لەمەرجەکانی عەشق گلەیی نەکردنی عاشقە لە بێ میهری یار بۆیە عاشقانی گلەییکەر عاشقی راستەقینە نین لای حافظ ئەم جۆرە خۆبە عاشق زانانە شایانی دووری و هیجرانن. خواجە لەم بەیتەدا، بە سەرسوڕمانەوە دەڵێ: لانی عەشق لێدان و گلەیی کردن لەیار (بێ میهرییەکانی یار) چ لافێکی درۆزنانەیە، چونکە کەسی لافی عەشق لێ بدات نابێ هەرگیز گلەیی لە یار بکات و پێویستە بە هەموو شتێکی یار رازی بێت و تەنانەت پێویستە خۆشحاڵ بێت: لاهوری لە (روضە الاروح)ەوە هێناویەتی کە کەسێك چو بۆ سەردانی دەروێشێك، بینی کە بەچەندەها بەڵا و ناڕەحەتی تاقی دەکرێتەوە، بۆ دلّدانەوەی گوتی ئەی دەروێش لە دۆستایەتیدا راست نییە گەر لەسەر بەڵای دۆست ئارام نەگرێت، دەروێشەکەش گوتی: بەهەڵەدا چوویت، لەخۆشەویستیدا راست نییە گەر هەرکەس چێژ لەو بەڵا و ناڕەحەتییەکانی دۆست نەبات. {لاهوری، ج ٢، ل ١١٩١}

خواجە ئەو عەشقبازانە (خۆبە عاشق زانانە)ی کە گلەیی لە یار و نارەحەتییەکانی یار دەکەن بەموستەحەق و شیاوی دووری و هیجران دەزانێت.

**٦ — وصف خورشید به شب پرّەی اَعْمی نوسد**

**که درین آینه صاحب نظران حیرانند**

شەمشەمەکوێرەی کوێر شایانی وسفکردنی هەتاو نییە، چونکە خاوەن رایان لە وەسفی ئەم ئاوێنەیەدا سەرسامن.

شب پره: شەمشەمەکوێرە　　　اعمی: کوێر　　　صاحب نظران: خاوەن رایان، ئەهلی دلّان.

هەتاو زاتی حەق (یار)ە کە لە بەیتی دووەمدا بە ئاوێنە ناوی بردووە، مەبەست لە (شەمشەمەکوێرە)ش عەقڵ یا عاقڵانن، خاوەن رایانیش عارفانن، خواجە دەڵێ: لە کاتێکدا کە ئەهلی دڵان لە وەسفی ئاوێنەی جەمالی حەقدا مەست و حەیرانن و حەیرەت دەیانگرێ ئیدی هەرگیز شەمشەمەکوێرەی کوێری عەقل کە هەرگیز بە خۆر نەگەیشتووە و ناگات چۆن دەتوانێ وەسفیبکات. لە هەندێ نوسخەدا لەبری (وصف) و (وصل) هاتووە و لە هەندێ نوسخەی دیکەشدا لەبری میسراعی یەکەم (وصف رخساره خورشید از خفاش مپرس) هاتووە کەهەمان واتا دەگەیەنێت و دەڵێ: وەسفی رووخساری یار لە شەمشەمەکوێرە مەپرسە.

**٨ — مَگرَم چشم سیاهِ تو بیاموزد کار**

**ورنه مستوری و مستی همه کس نتوانند**

مەگەر چاوانی رەشی تۆ فێرمکات، گەرنا هەموو کەس ناتوانێ مەستی و مەستوری پێکەوە ئەنجامبدات.

بیاموزد: فێربکات.

مستی و مستوری: مەستی و داپۆشراوی، یاخود (سکر و صحو) (بێ هۆشی و بە ئاگایی) دوو زاراوەی عیرفانین کە یەکەمیان بێ هۆشی و مەستییە و لەبەرچاو نەگرتنی دابونەریتەکانە و تیایدا (شطحات) دەگوترێت و مەستوریش خۆپاراستنە لە بێ ئاگایی و رێبازی عارفە زاهیدەکانی وەك جونەیدی بەغدادییە.(صحو) ئاگاداری داوی مەستی (سکر)ە.

سکر (مستی) بریتییە لە و زهێنان لە کۆت و بەندی دیار و نادیار و رووکردنەوە حەقە، لە (سکر)دا هێزی جیاکردنەوەی چاك و خراپ نامێنێت و عارفان لەمەستیدا گوێ بەدرکاندنی رازەکان نادەن، بەڵام لە (صحو)دا هێزی جیاکردنەوە دەمێنێت و عارفان ئاگاداری دابونەریتە دیار و نادیارەکانن. (بڕوانە سجادی (سکر). (سکر و صحو) دژی یەکترن و کۆکردنەوەیان پێکەوە ئەستەمە، خواجە لەم ئەستەمە ئەدوێ و پێی وایە گەر چاوی رەشی یار (نوری ئیلاهی) فێری کۆکردنەوەی (سکر و صحو)ی نەکات ئەستەمە مرۆڤ بتوانێ ئەم دوو دژە پێکەوە کۆبکاتەوە و لەهەمانکاتدا لە (سکر)دا بێت لە (صحو) شدا.

**٩ — گر به نزهتگهِ ارواح بَرَد بویِ تو باد**

**عقل و جان گوهر هستی به نثار افشانند**

گەربا بۆنی تۆ بباتە ئارامگەی پاکیزەیی رۆحەکان، عەقڵ و گیان گەوهەری بوونی خۆیان دەکەنە قوربانی (فیدات).

نزهتگە: ئارامگەی پاکیزەیی، شوێنی پاکی.



نزهتگەی ارواح: ئارامگەی پاکیزەیی رۆحەکان، ئەو شوێنە پاکەی کە رۆحی مرۆڤی تێدایە.

گوهر هستی: مرواری بوون، گەوهەری بوون.

افشانند: دەرژن، هەڵدەدەن.

به نثار افشانند: دەکەنە قوربانی.

خواجە لە گەورەیی یار ئەدوێت و دەڵێ: گەر هەوا بۆنی تووبباتە شوێنی ئارامگرتنی رۆحە پاکەکان - جیهانی ئەرواح - ئەوا تەواوی مەلەکوتی رۆحانی یا عەقڵ و گیانی ئەوان خۆیان دەکەنە قوربانی ئەو بۆنەی تۆ.

بەیتەکە لە مەعریفەی ئیلاهی ئەدوێت کە تیایدا ئیدی عەقڵ و گیانی مرۆڤ ئامادەی قوربانی دان ئەبێت.

**١٠ — زاهد ار درندیِ حافظ نکند فهم چه شد**

**دیو بگریزد از آن قوم که قرآن خوانند**

گەر زاهید لە رەندی حافظ تێ نەگات چ دەبێ، دێو لەو کۆمەڵە هەڵدێت کە قورئان دەخوێنن.

نکند فهم : تێنەگات.      چەشد: چ دەبێ، چ گرنگییەکی هەیە.

دیو: دێو، شەیتان و جنۆکە.      بگریزد: هەڵدێت.      خوانند: دەخوێنن.

لێرەدا خواجە (زاهید)ی بە دێو داوەتە قەڵەم و (رەند)یش بە قورئانخوێن. دەڵێ: گەر زاهیدی دێو ئاسا لەمەسەلەی رەندی حافظ تێنەگات چ گرنگییەکی هەیە، چونکە ئەو دێوە و رەندی ئێمەش وەك قورئانخوێندنە و دێویش لە قورئانخوێنان هەڵدێت.

واتە: زاهید لە تەریقەتی رەندی — بە رووخسار خراپ و لەناخدا چاك — هەڵدێت، ئیدی کە لێی تێ نەگات چ گرنگییەکی هەیە.

## غەزەلی سەد و نەوەد و یەکەم:

**بەحری هەزەجی هەشتی موسبەغ**

**(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلان)**

**١ — سمن بویان غبارِ غم چو بنشینند، بنشانند**

**پری رویان قرار از دل چو بستیزند، بستانند**

جوانانێ کە بۆنی یاسەمەنیان لێ دێ کەدانیشن غوباری غەم دەڕەوێننەوە، پەریروان کاتێ کە دەست بدەنە کێبەرکێ (تەبڵی شەڕ بکوتن) ئارامی دڵ دەبەن (دەڕفێنن).

سمن بویان: ئەوانەی بۆنی یاسەمەنیان لە خۆداوە.

چو: کاتێ کە (لەم غەزەلەدا بەم واتایە هاتووە).

بنشینند: دابنیشن. بنشانند: دەنیشێننەوە، دەڕوێننەوە.

بستیزند: بکەونە کێبەرکێ و نیزاع، بدەنە لانی لاری. بستانند: دەسێنن، دەڕفێنن، دەبەن.

لەڕاستیدا ئەم غەزەلە ئەگەر جوانترین غەزەلی هونەرمەندانەی خواجە نەبێت، یەکێکە لە جوانترین غەزەلەکانی — لەڕووی داڕشتنەوە — و تیایدا بەشێوەیەکی زۆر کارامە و هونەرمەندانە وشە و زاراوەکان ڕێکدەخات و لە چەندین جار زیاتر سوود لە وشە هاوپیت و هاوفۆنەکان وەردەگرێت و کایەی جوانی ڕەوانبێژییان پێ دروستدەکات، بەتایبەتی — ڕەگەز دۆزی — بەتایبەتی هێنانی ئەو کارانە کە هاوپیتن و لەڕووی واتاوە جیاواز و یاخود تەنانەت دژی یەکترین. هەروەها لەم غەزەلەدا گرنگییەکی زۆر بە مۆسیقای وشەکان و ڕێکخستنی ریتمێکی هاوڕێك دراوە. بەڕاستی ئەم غەزەلە بەگشتی لە جوانان و ناسکانی دونیایی دەدوێت کە جوانترین دروستکراوی دەستی یاری حەقن و — هەندێك لە عارفەکان ئاوڕدانەوە لە جوانییان بەئاسایی دەزانن.

ئەم هونەرمەندییەی خواجە لە ڕێکخستنی وشەکاندا تارادەیەك تێگەیشتنی لە غەزەلەکە گران کردووە.

لەبەیتی یەکەمدا ئەو دەڵێ: غەم و ئارامی دڵی ئێمە پەیوەستە بەنەرمی و توندی جوانانەوە گەر جوانانی بۆنخۆش بە گوڵی یاسەمەن لای ئێمە دانیشن و بمێننەوە ئەوا غوباری غەمی دڵ دەنیشێننەوە و دەیڕەوێننەوە، بەڵام گەر دەست بدەنە توندی و کێبەرکێ و تەبڵی شەڕمان لەگەڵ بکوتن ئەوا ئەوکاتە سەبر و قەراری دڵمان لێ دەستێنن و دڵمان بێ قەرار دەبێت.



**٢ — به فتراكِ جفا دلها چو بربندند، بربندند**

**ز زلفِ عنبرین جانها چو بگشایند، بفشانند**

کاتێ کە دڵەکان بەفیتراکی ستەمەوە دەبەستنەوە، ئیدی ناکرێنەوە، کاتێ کە پرچی بۆنخۆشیشان پەخشان دەکەن گیانەکان پرژوبڵاو دەکەنەوە.

فتراك: فیتراك، بەند یا ئاڵقەیەکە بە زینەوە کە ڕاوچییەکان نێچیرەکانیانی پێوە هەڵدەواسین.

فتراك جفا: بەندی ستەم.

بربندند: دەبەستنەوە، هەڵدەواسن. بربندند: بەستراونەتەوە.

بگشایند: بکەنەوە، پەخشان بکەن. بفشانند: پرژوبڵاو دەکەنەوە.

ئەوکاتەی کە جوانان دڵی عاشقان بە بەندی ستەمی بێ میهری خۆیانەوە دەبەستنەوە ئیدی بەمەحکەمی دیانبەستنەوە و بەتەواوی گرفتاریان دەکەن، کاتێکیش کە پرچی لوول و چین چینیان دەکەنەوە — کە هێلانەی گیانی عاشقانە — گیانەکان دەکەونە خوارەوە و پرژوبڵاو دەبنەوە.

واتە: جوانان کە بیانەوێ دڵان ئەسیر دەکەن و گەر بیانەوێت گیانان دەتارێنن و پرژوبڵاویان دەکەنەوە.

(بربندند و بربندند) ڕەگەز دۆزی تەواوە.

**٣ — ز چشمم لعل رمّانی چو می خندند، می بارند**

**ز رویم راز پنهانی چو می بینند، می خوانند**

کاتێ کە پێ دەکەنن، فرمێسکی هەناری لە چاوانم دەبارێن، کاتێ کە ڕازی پەنهان ڕووخساریشم دەبینن تێدا دەخوێننەوە.

لعل رمانی: یاقوتی هەناری، جۆرە یاقوتێکە کە لەدانەی هەنار دەچێ، لێرەدا درکەیە لە فرمێسکی خوێنین.

میخندند: پێدەکەنن. میبارند: دەبارێن. می خوانند: دەخوێننەوە.

واتە: کە جوانان پێدەکەنن فرمێسکی خوێنین (لەخەفەتەدا) لە چاوانم دەبارێت و هەر کە روشیان بینیم پەی بەرازی دڵم دەبەن.

**٤ — به عمری یك نفس با ما چو بنشینند، برخیزند**

**نهالِ شوق در خاطر چو برخیزند، بنشانند**

گەر دوای تەمەنێك ساتێك لەگەڵمان دانیشن هەڵدەستن، کاتێکیش کە هەڵدەستن نەمامی شەوق و تاسە لە دڵماندا (مێشکماندا) دەچێنن.

به عمری: دوای تەمەنێك، پاش ماوەیەکی دوور و درێژ. یەك نفس: ساتێ.

بنشینند: دانیشن.    برخیزند: هەڵدەستن.    نهال شوق: نەمامی تاسە و شەوق
نشانند: دەچێنن، دادەنێن.
(بنشینند و برخیزند) دژیەکن.
واتە: جوانان پەریرِوویان گەر پاش ماوەیکی دوور و درێژ — تەمەنێك — ساتێ لەگەڵ ئێمە دانیشن یەکسەر هەڵدەستن و دەرِۆن، کە دەشرِۆن نەمامی تاسە و شەوق لەدڵ و مێشکماندا دەچێنن و دەبێتە عەشق.

**٥ — سرشكِ گوشەگیران را چو دریابند، دُر یابند**
**رخِ مهر از سحرخیزان نگردانند، اگر دانند**

گەر ئاورِ لە فرمێسکی گۆشەگیران بدەنەوە، مرواری بەدەستدێنن، ئەگەر بشزانن رووی میهر و عەشق لە شەوبێداران وەرناگێرِن.
دریابند: لێی تێبگەن، ئاورِی لێبدەنەوە.    در یابند: دورِ بەدەستدێنن.
رخ مهر: رووی میهر و وەفا و عەشق .    نگردانند: وەرناگێرِن    اگر دانند: ئەگەر بزانن.
خواجە لێرەدا دیسان باس لە سمن بویان و پەریرِوویان دەکات کە ئەگەر بێت و ئاوەرِ لە گۆشەگیران و شەوبێداران بکەنەوە ئەوا دەستکەوتی گەورەیان دەبێت و دەستکەوتەکەش مرواری و دورِی زۆرە. گەر بشزانن روو وەرگێرِان لە پیاوچاکان چەندە خراپە روویان لە شەوبێداران وەرناگێرِن.

**٦ — چو منصور از مراد آنان کە بر  دارند، بردارند**
**کە با این درد اگر در بند در مانند، در مانند**

ئەوانەی کە وەك مەنسور شتێکیان لە ئاوات هەیە، بەدارەوەن، چونکە گەر بەم دەردەوە بە دوی دەرماندا وێڵن، بێ چارەن.
بردارند: هەڵگرن، بەدەست بێنن.    بر دارند: بەدارەوەن، لە دار دراون.
دربند: بە رووی، لەهەوڵی بەدەستهێنانی.    در مانند: دەرماندان.    درمانند: بێ چارەن.
مەبەست لە مەنسور حسێن کورِی مەنسوری حەلاج کە سەری کردە قوربانی لە پێناو عەشقدا و لەدار درا، لێرەدا خواجە دەڵێ: ئەوانەی کە وەك مەنسوری حەللاجن و پشکێکیان لە موراد و ئاوات بردووە بە دار دراوی یاخود بەدارەوەن واتە: بەختەوەری لەرِێگەی عەشقی ئیلاهیدا سەردانان و چوونە بەر ئازار و ئەشکەنجەیە، ئەمەش سەرەنجامی عەشقە و ئەوانەی کە بەم دەردی عەشقەوە بەدوای دەرماندا وێڵن دەبێ چاك بزانن کە چارەیان نییە یاخود



خودی دەردی عەشق چارەی نییە و دەرمانی پەیدا نابێت، چونکە عەشق دەردێکە دەرمانەکەی وەسڵی مەعشوقە و چوونە سەرداریش باشترین دەرمانی و چارەیە و گەرِان بە دوای چارەسەردا بۆ خۆی نەخۆشییە.
جیاوازییەکی زۆر لە ساغکردنەوەی ئەم بەیتەدا بەرچاو دەکەوێت لای قەزوینی و... هتد میسراعی دووەم (بدین درگاه حافظ را چو میخوانند، میرانند) هاتووە کە لەم شەرحەدا میسراعی دووەمی بەیتی حەوتەمە هەروەها لە لاهوریدا ئەسڵەن پێی وایەکە ئەم میسراعە بەتەنیایە هیچ میسراعێکی دیکەی نەهێناوە ئەو لە شەرحەکەی خۆیدا میسراعێکی دیکەشی بە تەنیا هێناوە کە دەڵێ:

**((چو مجنونان هرآن قومی کە می رانند حیرانند))**

وەك شێتان ئەو کۆمەڵەی کە (حی) دەرئەکەن سەرسامن . {لاهوری، ج٢، ل١٢٨٥} .
لە هەمانکاتدا میسراعی دووەمی ئەم بەیتە بەشێوەی دیکە لە بەیتەکدا هاتووە کە بەم شێوەیە — ئێمە پشت بەستن بە عیوضی لە دەقە ئەسڵیەکەدا دامان نەنا.

**دوای دردِ عاشق را کسی کاو سهل پندارد**
**زفکر آنان کە در تدبیر درمانند، در مانند**

کەسێ کە پێی وایە دەرمانی دەردی عاشق ئاسانە و ئەوانەی بە فیکری خۆیان لە هەوڵی دەرماندان، پەی بە بێ چارەیی و بێ هێزی خۆیان دەبەن، چونکە دەرمانی عەشق ئاسان نییە و لێرە - دونیا - دەست ناکەوێ.
هەرچۆن بێت میسراعی دووەمی ئەم بەیتە و ئەم میسراعی دووەمە هەمان واتایان هەیە و مانەوە لەنێو نوسخەکانیشدا مرۆڤ گێژ دەکات، چونکە جێگۆرِکێیەکی یەکجار زۆر بە میسراعەکان کراوە.

**٧ — درین حضرت چومشتاتان نیاز آرند، ناز آرند**
**بدین درگاه حافظ چو می خوانند، می رانند**

کاتێ موشتاقان رووی کەساسی و داوا دەکەنە ئەم ئاستانەیە نازیان بەسەردا دەکرێ، کاتێ حافظیش بۆ ئەم دەرگایە داوەت دەکەن، دەری دەکەن.
حضرت: دەرگا، ئاستانە. نیاز آرند: داوا دەکەن، پێویستی دەهێنن.   نازآرند: ناز دەهێنن.
میخوانند: داوەت دەکەن.    میرانند: دەردەکەن.
خواجە باس لە جوانان، بۆنخۆشان، پەریرِوان دەکات کە هەمیشە لە هەڵکشان و داکشانی داوەت و نازکردندان، دەڵێ ئەوان: کاتێ کە موشتاقان و ئارەزوومەندان دەستی پێویستی

درێژدەکەن گوێیان پێ نایەن و ناز دەکەن، کاتێ کە حافظیش بۆ بەردەرگای ئەم جوانانە داوەت دەکەن دەری دەکەن.

ئەم داوەت کردن و دەرکردنەوەی بەردەرگای مەعشوق دروست لەو بەسەرهاتەی (شبلی) دەچێت کە لە تەفسیری (کشف الاسرار) دا هاتووە و دەگێڕێتەوە، شبلی گوتی: من سۆفیگەری لەسەگێك فێر بووم کاتێ کە لە بەردەم دەرگایەکدا خەوتبوو، خاوەن ماڵەکە دەهاتەدەرەوە و دەریدەکرد، کەچی سەگەکە دووبارە دەهاتەوە، شبلی دەڵێ: گوتم ئەو سەگە چەند سووکە دەریدەکەن و دێتەوە، خوای گەورە ئەو سەگەی هێنایە زمان و گوتی، ئەی شێخ بۆ کوێ بڕۆم خاوەنمە (خواوەندمە).

{کشف الاسرارمیبدی، ل ٤١ / نوخوانان بزم صاحبدلان}.

خواجەش باس لەم حاڵەتەی مەعشوقان دەکات کە کاتێ دەچێتە بەردەرگایان و داوادەکەیت لەبری بەجێ هێنانی داواکارییەکە ناز دەفرۆشن و بێ میهری دەنوێنن، کاتێ کە داوەتیشی دەکەن دەرت دەکەن.



## غەزەلی سەد و نەوەد و دووەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسلەمی موسبەغ**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان)**

**١ – غلام نرگسِ مستِ تو تاجدارانند**

**خرابِ بادەی لعلِ تو هوشیارانند**

تاجداران غولامی نێرگزی مەستی تۆن و هۆشیارانشین کە مەستی بادەی لێو یاقوتینی تۆن.

تاجداران: تاجداران، پادشایان

خواجە بە مەعشوقی حەق دەڵێ: پادشایان غولامی دووچاوی مەستی تۆ یا دوونێرگزی مەستی تۆن واتە: پادشایان شایستەیی لە بادەی یاقوتینی عەشقی تۆدا مەست بن یاخود لە شەرابی لێو یاقوتینی تۆدا مەست بن.

بەگشتی بەیتەکە باس لەوە دەکات کە هەموو کەسێ شایانی عەشقی ئیلاهی نییە و گەورەکان شایانی ئەم پلە و پایەیەن.

(بارە لعل تو) دوومانای هەیە:

١ / شەرابی یاقوتینی تۆ.

٢ / شەرابی لێوی تۆ، چونکە (لعل) لێڵی تێدایە.

**٢- ترا صبا و مرا آبِ – دیدە شد غمّاز**

**و گرنە عاشق و معشوق رازدارانند**

تۆ سروە و منیش فرمێسکی چاوم بوونە فیتنەچی (قسەهێنەر و قسەبەر) وەگەرنا عاشق و مەعشوق نهێنی پارێزن.

غمّاز: قسەهێنەر و قسەبەر، فیتنەچی، قسە هەڵبەست.

رازدارانند: نهێنی پارێزن.

کاتێ کە هەواڵ و نهێنی عەشق بڵاودەبێتەوە دەبێ کەسێك ئەم هەواڵە بڵاوبکاتەوە، خواجە دڵنیایە لەوەی کە نابێت خودی عاشق و مەعشوق ئەم کارە بکەن – راز بڵاوبکەنەوە – بۆیە لەلایەن مەعشوقەوە دەیداتە پاڵ سروە کە بۆنی عەشقی ئەو بڵاو دەکاتەوە و لەلایەن عاشقیشەوە دەیداتە پاڵ فرمێسکی چاوان کە لە دوری یار هێندە دەبارێت کە رازی عەشق ئاشکرا دەکات خواجە خۆی دەڵێ:

کاتێ رازی عەشق بڵاوبۆتەوە لەلای تۆوە سروە و لەلای منیشەوە فرمێسکی چاو بوون کە ڕاوارییان کردووە و بڵاویان کردۆتەوە وەگەرنا خودی عاشق و مەعشوق نهێنیی پارێزن و ڕازی یەکتری بڵاوی ناکەنەوە.

**٣ — ز زیرِ زلف دوتا چون گذار کنی بنگر**

**که از یمین و یسارت چه بیقرارانند**

کاتێ تێدەپەڕیت لە ژێر پرچی دوتاوە سەیرکە کە لە راست و چەپتەوە چ بێ ئارام و بێ قەرارێك کەوتووە.

گذرکنی: تێپەڕیت       یمین و یسار: راست و چەپ       بی قرار: بێ ئارام.

واتە: ئەی یار کاتێ کە پرچت کردۆتەوە دوتا و شۆڕ بۆتەوە و رووخسارتی داپۆشیووە و بەژێر ئەو پرچەدا تێدەپەڕی و گوزەر دەکەیت سەیرکە بزانە چەندە عاشقی بێ ئارام لە راست و چەپەوە چاوەڕێی هاتنی تۆن تا بەدیدارت شاد بن.

**٤ — گذار کن چو صبا بر بنفشەزار و ببین**

**که از تطاولِ زلفت چه سوگوارانند**

وەك سروە بە وەنەوشەزاردا تێپەڕە و بزانە کەلە ستەمی زوڵفتەوە چ تازیەبارانێك کەوتوون.

بنفشەزار: وەنەوشە زار، جێگای پڕ لە وەنەوشە.

تطاول: ستەم، زوڵم .       سوگوار: تازیەبار.

وەنەوشە سەری داخستووە و لە تازیەبارێك دەچێت، خواجە ئەم تازیەبارییەی وەنەوشە بە ستەم و زوڵمی پرچی مەعشوقەوە گرێدەدات - ستەمی پرچی مەعشوقیش ئەوەیەکە حیجاب و پەردەی سەرووی رووی جوانی مەعشوق حەقە - بەیار دەڵێ: وەك سروەی بەیان بە وەنەوشەزاردا تێپەڕەو ببینە و بزانە کە چ تازیەبارێك کەوتووە و هەمووان لە دەستی ستەمی زوڵفت کە رووی تۆیان لێ دادەپۆشێ سەریان داخستووە و چوون تازیەباران دۆش داماون.

**٥ — نصیبِ ماست بهشت ای خداشناس برو**

**که مستحقِّ کرامت کناه کارانند**

بەهەشت بەشی ئێمەیە، ئەی خوداناس بڕۆ، چونکە گوناهکاران موستەحەقی بەخشش و کەرەمن.

برو : بڕۆ، ون بە.       کرامت: بەخشندەیی، لێ خۆشبوون.

خواجە لێرەدا جەخت لە عەفو و بەخششی خودا دەکاتەوە و روو بە وشکە زاهیدەکان — کە هەمیشە مرۆڤ بە عەزاب دەترسێنن — دەڵێت: ئێمە کە گوناهکارین و دەستی داوا و نزامان



هەمیشە بەرزە بۆ دەرگای حەق دەچینە بەهەشت، ئەی وشکە خواناس کە لە مانای رەحمەت تێ نەگەیشتووی و رەخنە دەگرێت بڕۆ ون بە، چونکە گوناهکاران شایانی لێخۆشبوونی خودان و خودا لەگوناهکاران — ئەوانەی بەکزۆڵییەوە دەپاڕێنەوە — خۆش دەبێت. (قل یا عبادی الذین اسرفوا علی انفسهم لاتقنطوا من رحمة الله، ان الله یغفر الذنوب جمیعا، انه هو الغفور الرحیم) سورەتی الزمر ئایەتی/ ٥٣.

**٦ — نه من بر آن گلِ عارض غزل سرایم و بس**

**که عندلیبِ تو از هر طرف هزارانند**

تەنیا من نیم کە غەزەل بەو گوڵی رووخسارەدا دەڵێم و بەس، لە هەرلایەکەوە هەزاران بولبولت هەیە کە بۆت دەخوێنن.

عارض: روخسار       غزل سرایم: غەزەل دەڵێم، غەزەل دادەنیم       عندلیب: بولبول.

تەنیا خواجە نییە کە غەزەلی عەشق بۆ گوڵی رووخساری یاری حەقیقی دەڵێت: بەڵکو لەهەر لایەکەوە هەزاران عارف شەیدای رووی یار بوون و بولبول ئاسا گۆرانی بە جوانی رووی گوڵیدا دەڵێن.

واتە: تەنیا من نیم کە جوانی ئیلاهی لە غەزەلیاتدا تەوسیف دەکەم و غەزەل بۆ شەیدای عەشق دەنووسم بەڵکو جوملە ئەم نەغمەخوێنییە دەکەن.

**٧ — تو دستگیر شو ای خضرِ پی خجسته که من**

**پیاده می روم و همرهان سوارانند**

تۆ دەستگرۆیم کە ئەی خدری موبارەك قەدەم، چونکە من بە پێ دەڕۆم و هاوسەفەران (ئەوانی دیکە) بە سواری دەڕۆن.

دستگیر: دەستگرۆیی، دەستگرتن       خجسته: موبارەك، پیرۆز

پیاده: بە پێی پیادە       همرهان: هاوسەفەران، هاوڕێیان.

لەم سەفەری تۆڵای عەشقدا خواجە خۆی بە پیادە و ئەوانی دیکە بەسوار دەزانێت، بۆیە داوا لە خدری زیندەی موبارەك قەدەم دەکات کە دەستی بگرێت و یارمەتی بدات، گەرنا ناگاتە مەنزڵ و توانای کێبەرکێی نییە و لەوان دوادەکەوێت و لەم بیابانی عەشقدا ون دەبێت. لێرەدا (خدر) پیر و مورشیدی کاملە.

**٨ — بیا به میکده و چهره ارغوانی کن**

**مرو به صومعه کآنجا سیاه کارانند**

وەرە بۆ مەیخانە و رووت ئەرخەوانی (سوور) بکە، مەڕۆ بۆ خانەقا کە گوناهکاران لەوێن.

سیاه کار: گوناهکار، بەدکار.

خواجە لەم بەیتەدا ئامۆژگاری (خداشناس)ی بەیتی(٥) دەکات و دەڵێ: رووبکەرە مەیخانەی عەشقی ئیلاهی و لێرە رووی خۆت سوور بکە و مەڕۆ خانەقا، چونکە بەدکاران و زاهیدانی ریابازی تێدایە.

رووسوورکردن/ روو ئەرخوانی کردن: دوومانای هەیە، یەکێکیان واتە: هێندە شەڕاب بنۆشە تا مەست بیت و رووت سوور هەڵگەڕێ، دووەمیان: رووسووری و سەربەرزییە (روو سپی بوون).

**٩ — خلاصِ حافظ از آن زلفِ تابدار مباد**

**که بستگانِ کمندِ تو رستگارانند**

خوا نەکات کە حافظ لە دەست ئەو پرچ لوول و چین چینە ئازاد بێت، چونکە ئەوانەی لە کەمەندی تۆدان سەرفرازانن.

خلاص: رزگاری. تابدار: چین چین و لوول بستگان: ئەسیران، بەستراوان

رستگار: سەرفراز، رزگار بوو.

خواجە دیلی و ئەسیری کەمەندی یار (عەشقی ئیلاهی) بەمایەی سەرفرازی و رزگاری لە کۆت و بەندی دونیایی و ئاخیرەتی دەزانێ بۆیە نزا دەکات کە هەرگیز لە داوی زوڵفی یار رزگاری نەبێت.



## غەزەلی سەد و نەوەد و سێیەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەقسور**

**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلان)**

**١ — آنان که خاك را به نظر کیمیا کنند**

**آیا بود که گوشەی چشمی به ما کنند**

ئەوانەی کە بەسەیر کردن خاك ئەکەن بە کیمیا بڵێی تیلەی چاوێکیش لە ئێمە بکەن.

آنان: ئەوانەی. کیمیا: ماددەیەکە کە شتی بێ کەڵك دەکات بەشتی گرانبەها، ئیکسیر، لێرەدا مەبەست لە پیر و مورشیدانی کامڵە. گوشه چشمی: تیلەی چاوێك.

تاڕادەیەکی زۆر هاوڕییەك لەنێوان حافظ ناساندا هەیە کە خواجە ئەم غەزەلەی لە وەڵامی غەزەلێکی (شاه نعمت الله ولی) کە شاعیر و سۆفییەکی سەردەمی حافظ و دەوروبەری ٨٣٠ کۆچی مردووە و غەزەلەکەشی بەم شێوەیە دەستپێدەکات.

**ما خاك را به نظر کیمیا کنیم**

**صد درد را به گوشه چشمی دوا کنیم**

بەڕای د.هروی ئەم غەزەلە زیاتر تەنز و تانەدانە لە (شاه نعمت الله) نەوەك ستایش و پیاهەڵدان {هروی، ج٢، ل٨٢٣}.

خواجە لەم بەیتەدا دەڵێ: ئەو مورشیدە کاملانەی کە بەسەیر کردن خاکی بێ بەها دەگۆڕن بۆ ئیکسیر و کیمیا و بەنرخ و گرانبەهای دەکەن بڵێی مەرحەمەت بکەن و تیلەی چاوێکشیان لە ئێمە بێت تا ئێمەی خاکیش ببینە کیمیا.

**٢ — دردم نهفته به ز طبیبانِ مدّعی**

**باشد که از خزانەی غیبش دوا کنند**

چاکتر وایە دەردم لە پزیشکانی داعیەدار شاراوە بێت، بەڵکو لە خەزێنەی غەیبەوە دەرمانی بکەن.

نهفته: شاراوە. خزانه: خەزێنە.

جاران دەرمانی دەرد لە خەزێنەی پادشایاندا بوو، خواجە لێرەدا خەزێنەی غەیبی هێناوە، کە شوێنی دەرمانی دەردی عەشق و یارمەتی نادیاری کاملانی رێگەی عەشقە. وەك: هەمیشە

خواجە شاردنەوەی دەردی عەشق لە پزیشکانی داعیەداری بانگەشەکەری هیچ لەباردانەبوو — کە ئەوانەن خۆیان بە پێشەوای ئومەت و نوێنەری ئایین دەزانن لە کۆمەڵگەدا — بە چاکتر دەزانێت تاوەکو درکاندنی و دەڵێ: بەڵکو ئەم خوایە لە خەزێنەی غەیبی و نادیارەوە دەرمانی ئەم دەردی عیشقەم بکات.

**٣ — معشوق چون نقاب ز رخ بر نمی کشد**

**هر کس حکایتی به تصوّر چرا کنند**

کاتێ کە مەعشوق پەردە لەسەر رووی هەڵناداتەوە، ئیدی بۆچی هەرکەس بەتەسەوری خۆی بەجۆرێك باس دەکات.

برنمی کشد: هەڵنەداتەوە، لانابات. تصور: وێناکردن، تەسەور.

مانایەکی قووڵ لەم بەیتەدا هەیە، ئەویش نەبینینی خودایە لە دونیادا، خوای گەورە لە ئایەتی ١٠٣ ی سورەتی (الانعام) دا دەفەرمووێ (لاتدرکە الابصار و هو یدرك الابصار...) لەگەڵ ئەوەی کە هیچ کەسێك لە دونیا توانای بینینی خوای نییە کەچی ملیۆنەها بۆچوون و وێناکردن سەبارەت بەخودا هەیە و هەریەك لەگومانی خۆیەوە جۆرێك وەسفیدەکات. خواجە ئەم پرسیارە دەکات کە خوا پەردەی سەر رووی خۆی بۆ مرۆڤ هەڵناداتەوە و کەس رووی ئەو مەعشوقە نابینێت ئیدی بۆچی هەریەکێك بە گومان و بۆچوونی خۆی باس و وەسفی ئەو دەکات.

**٤ — چون حسنِ عاقبت نه به رندیّ و زاهدیست**

**آن به که کار خود به عنایت رها کنند**

کاتێ کە عاقیبەتخێری بە رەندی و زاهیدی نییە، ئەوە باشترە کە کاری خۆمان بدەینە دەست عینایەت و دەستگرۆیی — پەروەردگارەوە.

حسن عاقبت: عاقبەت خێری. آن به: ئەوە باشترە، واباشترە.

عنایت: عینایەت و دەستگرۆیی، عینایەت فەیز و رەحمەتی ئیلاهییە و لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی بەندەکانیەتی.

بەعنایت رها نکنند: بدەنە دەست عینایەتی ئیلاهی.

عنایت لای عارفەکان دەستگرتنی کردنی عارفەکانە لەلایەن حەقەوە. مرۆڤ بە بێ عینایەتی ئیلاهی هەرگیز لە رێگەی کاری چاکەوە بە سەربەرزی و خۆشی ناگات. خواجە لێرەدا ئەم راستییە عیرفانییە دووپات دەکاتەوە و دەڵێ: مادام عاقیبەت خێری بە کاری چاکە یا کاری خراپە و لاف و گەزافی درۆینە نییە، واچاکترە خۆمان بدەینە دەست عینایەتی ئیلاهی.



**٥ — بی معرفت مباش که در من یزیدِ عشق**

**اهل نظر معامله بـــــا آشنا کنند**

بێ ماریفەت مەبە، چونکە لە مەزادخانەی عەشقدا، ئەهلی نەزەر مامەڵە لەگەڵ ماریفەت داراندا دەکەن.

معریفت: ماریفەت، زانین و ناسین. آشنا: لێزان، ماریفەتدار.

من یزید: کێ زیاد دەکات، هەراجی، مەزادخانە.

(مەعریفەت) لە رووی زمانییەوە زانین و ناسین، بەڵام لە رووی زاراوەی عیرفانییەوە بریتییە لەو ماریفەت و ناسینەی کە لە ئەنجامی بڕینی پلە و مەقامەکانی عیرفانەوە دەست عارفی رێبوار دەکەوێت. لای عارفەکان ئەسڵی ماریفەت ناسینی خودایە و زۆرجار لەم راوانگەیەوە پێناسەی عارف دەکەن، کە عارف ترین کەس بە ماریفەت ترین کەسە، ماریفەتی عارفان شەش جۆرە کە جۆرەکانی بریتین لە: (ماریفەتی یەکتایی، ماریفەتی بە پیرۆز زانین، ماریفەتی منەتبایی، ماریفەتی دەسەڵات، ماریفەتی ئەزەل، ماریفەتی راز و نهێنی) سلما طبقات (سجادی).

ماریفەتی عارفان بە فەزل و عینایەتی ئیلاهی دەبێت و دوورە لە هەڵێنجان و بەڵگەسازی زانایانەوە عارفەکان زانستی زانایان بە جەستەی بێڕۆح مەدەنە قەڵەم.

مادام ناسین و ماریفەت بۆ رێبوار هێندە گرنگە، خواجەش دەڵێت: تۆ (ئەی رێبوار یا عاشقی دیداری یار) بێ ماریفەت مەبە، چونکە لە مەزادخانە و هەراجی عەشقدا ئەهلی نەزەر و کامڵان و مورشیدانی رێگەی عەشق بە کەسێك دەفرۆشن کە ماریفەتی هەبێت، واتە: لە بازاڕی عەشقی ئیلاهیدا پێویستە ماریفەتت هەبێت ئەگەرنا بەدەست بەتاڵی لێی دەردەچێت.

**٦ — میْ خور که صد گناه از اغیار در حجاب**

**بهتر ز طاعتی که به روی و ریا کنند**

مەی بخۆرەوە، چونکە سەد گوناهی شاراوەی دوور لە چاوی بێگانە چاکترە لە بەندایەتییەك کە بە ریا و کەش و فشەوە بکرێت.

اغیار: بێگانە درحجاب: بە پەنهانی به روی و ریا: بە ریا و کەش و فشەوە.

حافظ لێرەدا گوناهی نهێنی لە بەندایەتی بە کەش و فشەوە بە چاکتر دەزانێت و ئامۆژگاری رێبواری عەشقی حەق دەکات کە بادەی عەشق هەڵدە ئاگات لە ریا و لاف و گەزاف بێت لە کاتی بەندایەتیدا، چونکە گوناهی شاراوەی دوور لە چاوی بێگانە لە بەندایەتی و تاعەتی پڕ لە ریا باشترە.

**٧ — پیراهنی که آید ازو بوی یوسفم**

**ترسم برادرانِ غیورش قبا کنند**

ئەوکراسەی کە بۆنی یوسفی منی لێدێت، ئەترسم برا حەسوودەکانی بیدڕێنن.

پیراهن: کراس.   غیور: حەسوود.   قبا کنند: بی دڕێنن.

کراس و بۆنی کراس و یوسف و برا حەسوودەکانی، هەمووی لە چیرۆکی حەزرەتی یوسف کە درێژترین چیرۆکی بەردەوامی قورئانییە، وەرگیراوە، کاتێ کە براکانی حەزرەتی یوسف رووددەکەنە میسر و لەکاتی گەڕانەوەیاندا حەزرەتی یوسف کراسەکەی خۆی ئەدات بەوان تا بیبەن بۆ حەزرەتی یەعقوب و چاوی چاك بێتەوە. کراسی یوسف و هێنانی کراسی یوسف لە ئەدەبیدا رزگارکەرە لە دەرد و ناخۆشی، خواجە دەڵێت: لەوە ئەترسم کە برا حەسوودەکانی لەکاتی هێنانی ئەو کراسەی یوسف بیدڕێنن و نەیگەیەننە شوێنی خۆی.

لەم بەیتەدا یوسف یار و بۆنی کراسەکەشی نەفەسی بۆنخۆشی مەعشوقە.

**٨ — حالی درونِ پرده بسی فتنه می رود**

**تا آن زمان که پرده برافتد چەها کنند**

ئێستا لە نێو پەردەدا فیتنەی زۆر دەنرێتەوە، ئەوکاتەی کە پەردە لاچێت چی بکەن.

حالی / حالا: ئێستا   برافتد: لاچێت   چەها: کوێ (چی) کەلە کوردیدا کۆن کرێتەوە.

لەڕاستیدا ئەم بەیتە چەندین واتا هەڵدەگرێت، کە بەکورتی بەم شێوەیەیە:

ئەکرێ (پردە) بە دوو واتا لێکدرێتەوە کە یەکەمیان پەردەی بوون و جەستەیە و ناو پەردەش نێو دونیا و جەستەی مرۆڤە و لادانی پەردەش رۆژی قیامەت و دواڕۆژ وەك: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الیوم تبلی السرائر... ﴾ سورەتی الطارق/ ئایەتی ٩.

بەم پێیە بەیتەکە دەبێتە: ئێستا لە نێو پەردەی جەستە و بووندا مرۆڤ — خراپەکاران و شەڕەنگێزان — ئەو هەموو فیتنە و ئاژاوەیە دەنێنەوە داخۆ ئەوزەمانەی کە پەردە لادەچێت و نامەکان ئاشکرا دەبن چی دەکەن.

لێرەدا گەرچی دەکەن بۆ مرۆڤەکان — شەڕەنگێزەکان — بێت نەشیاوە، چونکە لەوێ هیچیان پێناکرێت — وەك د.هروی دەڵێت: { هروی ج ٢، ل٨٢٧} — بەڵام بۆ خودا بێت کە دەیانبەخشێت یا نایانبەخشێت واتە: چییان پێدەکرێت — وەك: لاهوری دەڵێت: {لاهوری، ج٢، ل٧٩٧}. ئەوا رێی تێدەچێت، بەڵام لەکەم و کورتی بەدەر نییە.

هەر لەم روانگەیەوە — پەردەی جەستە — ئەکرێ ئەم بەیتە لە وەڵامی بەیتێکی (شاە نعمت الله ولی) دا بێت کە دەڵێ:



**در حبس صورتیم و چنین شاد و خُرّمیم**

**بنگر که در سراچەی معنی چەها کنیم**

ئێستا کە زیندانی جەستەین هێندە شادین بزانە لە پێکهاتەی مەعنا و عیرفانیدا — دواڕۆژ — دا چی دەکەین.

لێرەدا مانای بەیتەکە -وەك تانەدان لە- ولی دەڵێ: ئێستا کە بەند و دیلی جەستەین و لە پەردەی جەستەداین هێندە ئاشوب دەگێڕین ئاخۆ ئازادبین و پەردە لاچێت چی دەکەین.

گەر (پەردە)ش بە پەردەی نادیاری و غەیب لێکدەینەوە ئەوا واتای — مەشرەبی حافظییانەی — بەیتەکەمان دەستگیر دەبێت:

خواجە بە مەعشوقانی ئاشوب و ئاژاوە بەرپاکەری نێو پەردە دەڵێت: ئێستا کەلە نێوپەردەی غەیبدان و رووی مانگ ئاسایان بۆ خەڵکی دەرنەخستووە ئەم هەموو ئاژاوە و فتنانەی لە نێوان عاشقان و رەقیبانا هەڵگیرساندووە گەر دواڕۆژ کە دەردەکەوێت و پەردە لادەچێت چی دەکەن.

**٩ — گر سنگ ازین حدیث بنالد عجب مدار**

**صاحبدلان حکایتِ دل خوش ادا کنند**

پێت سەیر نەبێ گەر بەرد (تاو ئەم باسە بناڵێنێ) چونکە ساحێبدڵان چیرۆکی دڵ چاك دەیگێڕنەوە.

خوش ادا کنند: چاك دەیگێڕنەوە، بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش و کاریگەر دەگێڕنەوە.

چیرۆکی عەشق کاریگەرترین چیرۆکە و بەرد دەهێنێتە ناڵە، بەتایبەتی گەر صاحێبدڵان و ئەهلی مەعنا ئەو چیرۆکە بگێڕێتەوە کە — زۆر بەسەرنجڕاکێشی باسیدەکەن — بۆیە خواجە دەڵێ گەر ئەم باسی عەشقە — کە لە زاری عارفانەوە دەگێڕدرێتەوە — بەرد بێنێتە ناڵە پێت سەیر نەبێ، چونکە زۆر کاریگەر و سەرنجڕاکێشە.

**١٠ — بگـذر بە کویِ میکدە تا زمرەی حُضور**

**اوقاتِ خود ز بهرِ تو صرفِ دعا کنند**

برۆ بە کویی مەیخانەدا تا کۆمەڵی ئەوانەی ولێیان لە خزمەتی یاردا ئامادەیە، کاتی خۆیان لەبەر تۆ بۆنزا سەرفکەن.

زمرە: کۆمەڵ.   حضور: حزور، ئەوانەی کە دڵیان تەنیا یاری تێدایە و ئاگایان لە هیچی دیکە نییە. پێشتر لە (حضور) دوایین. خواجە لێرەدا دەڵێت: ئەوانەی لە (حزور) دان لەبەردەم مەیخانەی عەشقدان و لە شوێنی دیکەی وەك: - خانەقا ـ نین، گەر دەتەوێ عارفانی پاك نزا و

دوعات بۆ بکەن برۆ بە کۆڵانی مەیخانەی عەشقی ئیلاهیدا تێپەڕە تا ئەو پاکانەی بەردەم مەیخانە لەبەر تۆ دەستی نزا بەرز کەنەوە و کاتی خۆیان بۆ نزا کردن بۆتۆ تەرخانبکەن.

**١١- پنهان ز حاسدان به خودم خوان که منعمان**

**خير نهان براى رضاىِ خدا كنند**

دوور لە چاوی حەسوودان داوەتم کە، چونکە چاکەکاران بۆ رەزامەندی خوا خێری پەنهان دەکەن.

بەخودم خوان: داوەتم کە بۆلای خۆت. منعمان: چاکەکاران.

خواجە بەیار دەڵێ: بە دزی حەسوودانەوە — چونکە ترسی ئەوەی هەیە وەك براکانی یوسف لێی بشێوێنن — بۆ لای خۆت داوەتم بکە، تۆ چاکەکاری و چاکەکارانیش لەبەرخاتری خوا دوور لە چاوی خەڵکی خێر دەکەن.

لەڕاستیدا ئەم دوو بەیتە (١٠ و ١١) لە نوسخەی (عیوضی)دا نییە، بەندە لەبەر ئەوەی کە لە زۆربەی زۆری نوسخەکانی دیکەدا هەبوو بەناچاری هێنامن، ئەگەرنا لەگەڵ ئەو رایەدام کە ئەم دوو بەیتە نەنووسرێتەوە، چونکە: جیاوازی لە نێوان نوسخەکاندا هەیە لە ساغکردنەوەی ئەم دوو بەیتەدا بۆ نموونە:

لە بەیتی (١٠) دا لە بری (میکده) (صومعه)ە و لەبری (تا)، (در) هاتووە و لە بەیتی (١١) شدا لەبری (براى رضاى)، (بسى ز براى) هاتووە.

**١٢ — حافظ دوام وصل ميسّر نمى شود**

**شاهان كم التفات به حالِ گدا كنند**

حافظ، بەردەوامی دیدار فەراهەم نابێت، شاهان کەم ئاوڕ لە حاڵی گەدا ئەدەنەوە.

وەك هەمیشە حافظ بڕوای خۆی بە بەردەوام نەبوونی وەسڵ و پێگەیشتن لەگەڵ یاردا دووپات دەکاتەوە و دڵی خۆی ئەداتەوە، حافظ وەسڵ بەردەوام نابێ — لە دونیادا — چونکە ئەمە بڕیاری یارە و شاهان زۆر گوێ بە حاڵی گەدا نادەن.



## غەزەلی سەد و نەوەد و چوارەم:

**بەحری رەمەلی شەشی مەقسور**

**(فاعلاتن فاعلاتن فاعلان)**

**١ — شاهدان گر دلبرى زين سان كنند**

**زاهدان را رخنه در ايمان كنند**

گەر جوانان بەم شێوەیە دولبەری بکەن، (کون دەکەنە) ئیمانی زاهیدان — دەڵەرزێنن

شاهدان: جوانان، یاران. دلبری: دولبەری، دلبردن. زین سان: بەم شێوەیە.

رخنە: کون، کون کردنە ئیمان، واتە: ئیمان لەرزاندن، لەرێ لادان.

خواجە باس لەسەرنجڕاکێشی جوان و یاران دەکات — کە مورشیدانی کامڵن — و دەڵێ گەر بەم شێوەیە خەریکی دڵبەری و عەشق بن و دڵی عاشقان بۆ خۆیان راکێشن ئیمانی زاهیدان دەلەرزێنن و لە رێیان لادەدەن و ئەوانیش عاشقی خۆیان دەکەن، ئەکرێ ئیمانی زاهیدان، ئیمانداری زاهیدانە بێت.

**٢ — هركجا آن شاخِ نرگس بشكفد**

**گلرخانش ديده نرگسدان كنند**

لەهەر کوێ ئەو چڵە نێرگزە بپشکوێت گوڵڕویان چاویان دەکەنە نێرگزدانی.

شاخ / شاخە: چڵ گلرخان: گوڵڕوویان، ئەوانەی کە روویان وەك گوڵە.

چاوی مەستی یار — چڵە نێرگزی چاوی مەستی یار — لەهەر کوێ پشکوێ و هەڵبێت — جوانان وگوڵاڵی دونیا — دیدەیان دەکەنە نێرگزدان و بەتەواوی چاو سەیری دەکەن یاخود لە دیدەیاندا دەپارێزن.

**٣ — يار ما چون سازد آغازِ سماع**

**قدسيان بر عرش دست افشان كنند**

کاتێ یاری ئێمە دەستدەکات بە سماع — سەما — فریشتە پیرۆزەکانی عەرش دەست دەکەن بە چەپڵەلێدان.

دەست افشان: چەپڵەلێدان (بە سەماکردنەوە).

واتە: یاری ئێمە — مورشید و شێخی ئێمە — هێندە — جوانە کاتێ دەستدەکات بەسەماع و وەجد فریشتە پیرۆزەکانی ئاسمانیش دەهێنێتە سەما.

ئەکرێ، یار هەمان یاری حەق بێت.

**٤ — ای جوانِ سرو قد گویی بزن**

**پیش از آن کز قامتت چوگان کنند**

ئەی لاوی بەژنرێك لەم مەیدانە گۆیەك هەڵدە، بەرلەوەی کە لە بەژنت گۆچان دروستکەن.

سروقد: بەژنرێکی وەك سەرو. گویی بزن: لە گۆیەك بدە، گۆیەك هەڵدە.

چوگان: گۆچان.

لە گۆدان، درکەیە لە سەرکەوتن بە ئاوات گەیشتن و گۆچان لەجەستەش دروستکردن مەبەست لە پیرییە خواجە ئامۆژگاری لاوان دەکات و دەڵێ: ئەی لاو لە گەنجیدا هەوڵبدە و سەرکەوە پێش ئەوەی پیر بیت و لە قەدی ڕێکت گۆچان دروستکەن — بچەمێیتەوە —

پێغەمبەر ﷺ لەو فەرموودەی پیرۆزەدا دەفەرمێ سوود لە پێنج شتت ببە بەر لە پێنجی دیکە، یەکێکیان (شبابك قبل هرمك) ە.

**٥ — عاشقان را بر سرِ خود حکم نیست**

**هرچه فرمانِ تو باشد آن کنند**

عاشقان دەسەڵاتیان بەسەرخۆیاندا نییە، هەرچی فەرمانی تۆ بێت ئەوە دەکەن .

برسر خود: بەسەر خۆیاندا.

بەیار — کە ئەکرێ مورشیدی کامڵ بێ — دەڵێ: عاشقان سەروگیانیان بە دەست خۆیان نییە و بە ئارەزووی خۆیان رەفتار ناکەن، بەڵکو هەرچی فەرمانی تۆ بێت ئەوە دەکەن.

واتە: عاشقان هەمیشە لەژێر فەرمانی یاردان و هیچیان بەدەست خۆیان نییە.

**٦ — مردم چشمم به خون آغشته شد**

**درکجا این ظلم بر انسان کنند**

گلینەی چاوم بە خوێن داپۆشرا (تێکەڵاو بوو بە خوێن) لە کوێ ئەم ستەمە لەمرۆڤ (گلینەی چاو) دەکەن.

مردم چشم: گلینەی چاو. انسان: مرۆڤ، گلێنە.

(انسان) لێڵی تێدایە و بەواتای مرۆڤ یا گلێنە (انسان العین) دێت. خواجە دەڵێ: لەتاو دووری تۆ هێندە گریام فرمێسکی چاوم بووبە خوێن و گلێنەم نغرۆی خوێن بوو، بزانە لە کوێ ئەم ستەم و ناڕەواییە لەگەڵ مرۆڤ (هیجران و دووری) یا گلێنە (نغرۆ کردنی بە خوێن) دەکرێت.

**٧- پیش چشمم کمتر است از قطرەای**

**آن حکایت ها کە از طوفان کنند**



لەبەردەم چاوی مندا ئەو چیرۆکانەی باس لە تۆفانی نوح دەکەن لە دڵۆپێك کەمترە.

واتە: هێندە گریاوم فرمێسکی زۆرم باراندووە تۆفانی نوح لەبەردەم فرمێسکی چاوی مندا وەك دڵۆپە ئاوێك وایە.

**٨ — عید رخسار تو کو تا عاشقان**

**در وفایت جان خود قربان کنند**

جەژنی دیداری رووخساری تۆ کەی دێ تا عاشقان، لە وەفای تۆدا گیانی خۆیان بکەنە قوربانی.

لە هەندێ نوسخەدا ئەم بەیتە نەهاتووە — وەك قزوینی — و لە هەندێ نوسخەشدا لەبری (روخسار) (دیدار) هاتووە. کە بەندە پێم وایە جیاوازییەکی ئەوتۆیان لە نێواندا نییە. حافظ دیداری رووخساری یار بە جەژن دەداتە قەڵەم کە قوربانیی دەوێت. دەڵێ: جەژنی دیاری رووخساری تۆ کەیە (کوا) تا عاشقان لە وەفای پەیمانێکدا کە بەتۆیان داوە گیانی خۆیان بکەنە قوربانی ئەو جەژنە.

**٩ — خوش برآی از غصّه ای دل کە اهلِ راز**

**عیشِ خوش در بوتەی هجران کنند**

بە خۆشی و شادییەوە لەخەفەت وەرە دەرێ، چونکە ئەهلی راز ژیانی خۆش لە قاڵبی هیجراندا بەسەر دەبەن.

برآی: دەرچوون، هاتنەدەرەوە، از غصە برآمدن: لە خەفەت رزگار بوون، زاڵبوون بەسەر خەفەتدا.

بوتە: بۆتە، قاڵب.

خواجە ئامۆژگاری دڵی خۆی دەکات و دەڵێ: کە لە خەفەتدای بە خۆشی بەسەری ببە و خۆتی لێ رزگار بکە و مەروخێ، چونکە عارفان (ئەهلی راز) لەنێو قاڵبی دووری یاردا بەخۆشی ژیاون، چونکە پوختە و کامڵ بوون. واتە: هەر کەسێ کامڵ بێت خەفەت بۆ مەینەت و خەفەتی دونیا و رێگە ناخوات.

**١٠ — سرمکش حافظ ز آهِ نیمشب**

**تا چو صحبت آینە رخشان کنند**

حافظ واز لە ئاهی نیوەشەو مەهێنە، تا وەك سپێدە ئاوێنەی دڵت رووناك کەنەوە.

سرمکش: وازمەهێنە.

رخشان: درەوشاوە، رووناك.

حافظ له گرنگی ئاهونووزی دڵەی نیوەشەوان ئەدوێت و بەخۆی دەڵێت : ئەم ئاهونووزە دڵەیە دەبێتەمایەی درەوشانەوە و رووناکبوونەوەی دڵی عارفان، وازی لێ مەهێنە تا وەك سپێدە دڵت ڕووناك بکەنەوە.



## غەزەلی سەد و نەوەد و پێنجەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفونی مەقسور**
**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلان)**

**١ – گفتم کَیَم دهان و لبت کامران کنند**
**گفتا به چشم هر چه تو گوئی چنان کنند**

گوتم کەی دەم و لێوت خۆشبەختم دەکەن، گوتی بەچاوان هەرچی تۆ بڵێیت وادەکەن.

گفتا: گوتی     به چشم: بەچاوان، بەسەرچاو     چنان: ئاوا، وا، ئەوە

زۆربەی بەیتەکانی ئەم غەزەلە گفتوگۆیە لەگەڵ (ئەو) دا کە لە شەرحەکاندا – بەتایبەتی عیرافانییەکان – بە مورشیدی کامڵ دراوەتە قەڵەم بەیارم گوت کەی دەم و لێوات خۆشبەختم دەکەن و (ماچێکم دەدەنێ یا پەیمانی دیدارێکم دەدەنێ) گوتی بەسەر چاو، هەرچی بڵێی پێیان دەڵێم وابکەن و وادەی وەسڵت بدەنێ، لەڕاستیدا تەواوی قسەکانی خواجە لەم غەزەلەدا لەسەر زمانی کەسێکی سادەی نێو دونیای عەشقەوە لە پرێك دەکرێت و ئەویش ژیرانە روونیان دەکاتەوە، ئەڵێی حافظ هەر مەبەستی بووە بەم شێوازەش ئەو مەسەلە عیرافانیانە روون بکاتەوە.

**٢ – گفتم خَراج مصر طلب می کند لبت**
**گفتا درین معامله کمتر زیان کنند**

گوتم لێوت داوایماڵیاتی میسر دەکات، گوتی لەم مامەڵەیدا کەمتر زیان دەکەن.

خراج: ماڵیات، باج و خەراج.     مصر: میسر     کمتر زیان کنند: هەرگیز زیان ناکەن.

خواجە دەڵێ: گوتم یار لێوت داوای حەقی زۆر دەکات و هێندەی ماڵیات و باج و خەراجی میسری لێم دەوێت، گوتی هەرکەس ئەم مامەڵەیە بکات لەبەرامبەر ماچێکدا (نەفەسێکیدا، پەیمانێکدا ) زەرەر ناکات.

**٣ – گفتم به نقطـەی دهنت خود که برد راه**
**گفت این حکایتیست که با نکتەدان کنند**

گوتم کێ پەی بە خاڵی دەمی تۆ بردووە، گوتی ئەمە چیرۆکێکە کە دەبێ بە نوکتە زانان بگوترێت.

نقطە ی دهن: خاڵی دەم، لە زاراوە عیرفانیدا خاڵی درکاندنی رازی عیشقە کە ئەسراری ئیلاهییە.

بردراه: پەی پێ برد، ڕێی لێ گرت

نکتەدان: نوکتە زان، کەسی ورد و بەسەلیقە.

وتم بەیار چ کەسێ پەی بە حاڵی دەمی تۆ بردووە یاخود لە رازی ئەسراری ئیلاهی کە لە دەمی تۆوە ئەدرکێنێ گەیشتووە، لە وەڵامدا گوتی: ئەم چیرۆکی راز و درکاندنی نهێنییە چیرۆکێکە کە دەبێ تەنیا لەگەڵ پوختە و کامڵەکاندا باسبکرێت ـ تۆ کە لە سەرتای رێگەی عەشقت دایت جێگەی متمانە نیت.

**٤ — گفتم صنم پرست مشو با صمد نشین**

**گفتا بەکویِ عشق هم این و هم آن کنند**

گوتم: مەبە بە بت پەرست، لەگەڵ (صمد) خودادا بە، گوتی لە کویی عەشقدا هەم ئەم هەم ئەویش دەکەن.

صنم پرست: بت پەرەست. صمد: یەکێکە لە ناوەکانی خودا و بەواتای: ئەوە دێ کەخودا پێویستی بەکەس نییە و جێگەی ڕاز و نیازی خەڵکییە.

((صنم)) بت لە عیرفاندا بەواتای: هەر شتێکە کە دڵی عاشق بۆ خۆی راکێشێت و مەبەست لێی جوانییەکانی دونیایە و هەر گەردێکی بوون کە دڵی عارف بۆ لای خۆی ڕاکێشی بتە. (صمد)یش خودایە. عارفەکان پێیان وایەکە تەواوی گەردیلەکانی بوون جوانی خودا و ئیمزای ئەون — بە گوتەی د.قمشەای — هەربۆیە عاشق بوون و شاردرانەوە لە جوانی هیچ دژایەتییەکی لەگەڵ عیرفاندا نییە، لێرەدا (صنم پرست) بەواتای جوانپەرست دێت. خواجە کەلەم شێوەدا لەسەرەتای عیرفاندایە، دەڵێ گوتم بە مورشیدی کامڵ کە جوانپەرست مەبە و تەنیا لەگەڵ خوادا بە، بەڵام ئەو، چونکە زانا بوو گوتی: لە کۆڵانی عەشقدا هەردووکیان دەکەن واتە: (هەم جوانپەرستی و هەم خواداپەرستی).

لەڕاستیدا ئەم بۆچوونە کە تەواوی جوانییەکان بە جیلوەی جەمالی حەق دەزانن و بەلایانەوە ئاساییە کە لە کاتی عەشقی ئیلاهیدا ئاوڕ لە جوانییەکانی بوون و دونیاش بدەنەوە گشتگیر نییە و زۆرێك لە عارفەکان لەو باوەڕەدان کە ئاوڕدانەوە لە جوانییەکانی دیکە دەبێتە مایەی (غیرە)ی ئیلاهی، بەتایبەت خاوەنی (تفسیر کشف الاسرار) چەندین نموونەی جیاواز دەهێنێتەوە، وەك نموونەی حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی یەعقوب، کە بەهۆی دڵدانیان بە ئیسماعیل و یوسف خودا دوچاری غەمی کردن، هەروەها (سنائی) لە شیعرێکدا دەڵێ:



ناتوانرێت بە دوو قیبلەوە بەڕێگەی تەوحیدا برۆیت. { سنائی، نوخوان ٩ / ٦٢ }. بەڵام حافظ لەگەڵ ڕای یەکەمدایە و پێی وایە لە عەشقدا هەردووکیان خواپەرستی و جوانپەرستی تەواوکەری یەکترن.

**٥ — گفتم هوای میکده غم می برد ز دل**

**گفتا خوش آن کسان کە دلی شادمان کنند**

گوتم هەوای مەیخانە غەم لە دڵ دەردەکات، گوتی: خۆش بە حاڵی کەسانێ کە دڵێك شادمان ئەکەن.

غم می برد ز دل: غەم لە دڵ دەردەکات.

خواجە دەڵێ: کە من گوتم حاڵ و هەوای مەیخانەی عەشق غەم لە دڵی ڕێبواران و عاشقاندا ناهێڵێت ئەویش گوتی: خۆزگە بە مورشید و پیرانی مەیخانە — خۆش بە حاڵیان — کە دڵێك شاد دەکەن و دەبنەمایەی لابردنی غەم.

**٦ — گفتم شراب و خرقه نه آیین مذهبست**

**گفت این عمل مذهبِ پیرِ مغان کنند**

گوتم: شەڕاب و خیرقە ڕێوڕەسمی ئاییناری نییە، گوتی بە مەزهەبی پیری موغان ئەم کارە دەکەن.

گوتم شەڕاب نۆشین و خیرقەی سۆفییانە پۆشین لە هەمان کاتدا — کە دژی یەکترن — لەگەڵ ڕێوڕەسمی ئاییندا یەکناگرنەوە و پێچەوانەی دین و مەزهەبن، گوتی لە مەزهەبی پیری موغان — مورشیدی مورشیدان — دا ئەم شتە دروستە و ئەوانەی ئەمە دەکەن پەیڕەوی لە مەزهەبی پیری موغان دەکەن.

**٧ — گفتم ز لعل نوشْ لبان پیر را چه سود**

**گفتا بە بوسەی شکرینش جوان کنند**

گوتم پیر چ سوودێك لە لێوی شیرینلێوان دەبینی، گوتی بە ماچێکی هەنگوینی جوانی دەکەنەوە.

نوش: نۆش، شیرین. نوش لبان: شیرین لێوان. جوانش کنند: جوانی دەکەنەوە، لاوی دەکەنەوە، گەنجی دەکەنەوە.

خواجە دیسانەوە لە مورشید دەپرسێت ماچی شیرین لێوان — کە جیلوەی جەمالی حەق — چ سوودێکی بۆ پیری پەککەوتە هەیە، گوتی چۆن بە ماچێکی هەنگوینی سەر لەنوێ گوڕ و تینی لاوی پێ دەبەخشنەوە.

وەک ئاشکرایە کە شەمسی تەبریزی — مورشید و موریدی مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی (مەولەوی) — لەسەردەمی پیریدا بوو کە عاشقی زڕکچی مەولانا بوو، گوڕ و تینی لاوێتی بۆ گەڕایەوە — هەرچەندە غیرەی عەشق ئازاری دا — { پلە پلە تا ملاقاتی خوا، زرین کوب } .

**٨ — گفتم که خواجه کی به سر حجله می رود**

**گفت آن زمان که مشتری و مَهْ قِران کنند**

گوتم خواجە / سەردار کەی دەچێتە پەردەوە، گوتی: ئەو کاتەی کە مشتەری و مانگ بکەونە هەمان کەلووەوە.

خواجه: سەردار، سەروەر، بەڕێز، گەورە.

حجله: پەردەی زاوایەتی، نوێنی ڕازاوەی بووک و زاوا، ژووری تایبەتی بووک و زاوا.

مشتری و مه: مشتەری و مانگ. قران کنند: بکەونە یەک کەلووەو، بکەونە بەرامبەر یەکترەوە، وەستانی دوو ئەستێرەی بەختە لەکاتی چاکدا، یەککەوتنەوەی مشتەری و مانگ چاکترین کاتە بۆ هەر جۆرە بڕیارێک بەتایبەتی بڕیاڕی ژن هێنان. {لاهوری، ج٢، ل٨٣٨} .

لاهوری لە شەرحی ئەم بەیتەدا نووسیویەتی: ((خواجە)) مورشیدی کاملە، کە دوو ئیشی هەیە، یەکێکیان کاروباری موریدانە و ئەوی دیکەیان خەڵوەت و ڕاز و نیازە لەگەڵ مەعشوقدا و (حجله) ئەو خەڵوەتخانەیە، مشتەری مەعشوق و مانگیش دڵی عاشقە.

خواجە لە مورشید دەپرسێت: کەی مورشید دەچێتە خەڵوەتخانە تا لەگەڵ خودا دا ڕاز و نیاز بکات و ئەویش دەڵێ ئەو کاتەی کە دڵی من و مەعشوق لە کەلویەکدا بن.

**٩ — گفتم دعای دولت تو وردِ حافظ است**

**گفت این دعا ملایکِ هفت آسمان کنند**

گوتم نزای خۆشبەختی تۆ، ئەبێتە وێردی سەر زمانی حافظ، گوتی فریشتەکانی حەوت ئاسمان ئەم نزایە دەکەن.

دولت: بەخت. ملایک: فریشتەکان.

خواجە بە (مورشید) دەڵێ: لەمەودوا بەردەوام دوعای ئەوەت بۆ دەکەم بەخت یاوەرت بێت و خۆشبەخت بێت و دەبێتە وێرد و تەسبیحاتی سەرزارم، ئەویش گوتی تەواوی فریشتەی حەوت ئاسمانەکان ئەم نزا و دوعایەم بۆ دەکەن.

لە زۆربەی نوسخەکاندا لەبری (تو) (او) هاتبووە بەڵام ئەو (تو)ە لەگەڵ مانای گشتی غەزەلەکەدا جوانتر دەگونجێ.



## غەزەلی سەد و نەوەد و شەشەم:

**بەحری ڕەمەلی هەشتی مەقسور**

**(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان)**

**١ — واعظان کاین جلوه در محراب و منبر می کنند**

**چون به خلوت می روند آن کار دیگر می کنند**

خوتبەخوێنان (واعیزان) کە لە میحراب و میمبەردا بەم جۆرە خۆیان دەردەکەن، کە دەچنە تەنیاییەوە ئەو کارەی تر دەکەن.

منبر: میمبەر.

آن کار دیگر: ئەو کارەی تر، لەڕاستیدا حافظ ئەو کارە خراپەی تری دەست نیشانەکردووە و هەر بەلێڵی هێشتوویەتیەوە ئیدی یا بەئەنقەست وایکردووە یاخود لەبەر کێشی شیعرەکە (ئەو / آن)ی هێناوە.

بەیتەکانی سەرەتای ئەم غەزەلە تانەیە لە خوتبەخوێن و واعیزەکان. کە لەسەر میمبەر و لە میحرابدا هێندە خۆیان بە چاک دەردەخەن و خەریکی ئامۆژگاری و نوێژ کردنن، کەچی کە دەچنە تەنیایی و لە بەر چاوی خەڵک دوور دەکەونەوە کاری خراپ و تاوان ئەنجامدەدەن، واتە واعیزان لەبەر چاوی خەڵک چاکن، بەڵام لەناخدا و لە تەنیایدا خراپکارن.

**٢ — مشکلی دارم ز دانشمندِ مجلس باز پُرس**

**توبه فرمایان چرا خود توبه کمتر می کنند**

پرسیارێکی گرانم هەیە، لە هۆشمەندی مەجلیس بپرسە، بۆچی ئەوانەی فەرمان بە تۆبە دەکەن خۆیان تۆبە ناکەن.

مشک: گرفت، گران. باز پرس: بپرسە، پرسیار بکە.

توبه فرمایان: ئەوانەی فەرمان بە تۆبە دەکەن.

دیسانەوە تانەیە لە — واعیزان — ی بەیتی یەکەم کە لێرەدا دەپرسێ ئەوان کە بەخەڵکی دەڵێن: تۆبە بکەن و واز لە گوناه بهێنن پێم سەیرە و بووەتە پرسیار بۆم کە بۆچی خۆیان تۆبە ناکەن.

**٣ — گوییا باور نمی دارند روزِ داوری**

**کاین هم قلب و دغل درکارِ داور می کنند**

ئەڵێی باوەڕیان بە ڕۆژی حیساب نییە، کە ئەم هەموو فڕوفێڵ و دەغەڵییە لەکاری خودادا دەکەن.

گوییا: ئەڵێی.　　　باوەر نمیدارند: باوەڕیان پێی نییە.
داوری: حیساب، جەزا.　　　قلب: ساختە، تەزویر.
داور: قازی، خودا.

خواجە پێی سەیرە کە واعیزان ئەم هەموو ساختە و فڕوفێڵە لە ئـایین — کـاری خـودا — دا دەکەن و هەر خەریکی تەزویر و ساختەن، ئەڵێی ئەسڵەن باوەڕیان بە رۆژی حیساب و قیامەت نییە کە خوا لە بەندەکانی دەپرسێتەوە.

**٤ — بندەی پیر خراباتم کە درویشان او**

**گنج را از بی نیازی خاك بر سر می کنند**

غولامی پیری خەراباتم کە دەروێشانی ئەو، لە بێ نیازیدا خۆڵ بەسـەر گەنجدا دەکـەن (بـە هیچی نازانن).

خاك برسر می کنند: خاکی بەسەردا دەکەن، دەیشارنەوە، لێـرەدا درکەیـە لـە: (بـەبێ بەها زانین).

خواجە لە گەوەریی پیری خەرابات (مورشیدی کامڵ) دەدوێ کە هێندە گەورەیـە تەنانـەت دەروێشەکانیشی هێندە لە دونیا و شتە دونیاییەکان بێ نیاز دەبـن گـەنج و گەوهـەر بـە هـیچ نازانن یاخود بێ نیازی ئەوان گەنج وگەوهەر دادەپۆشێت. پیری مەیخانەیەك کـەئاوا گـەورەبێت من دەبمە غولام و بەندەی.

**٥ — یا رب این نو دولتان را برخر خودْشان نشان**

**کاین همە ناز از غلامِ ترك و استر می کنند**

خواجە ئەم تازە پێگەیشتوانە بخەرەوە شوێنی خۆیان (بیانخەرەوە سەرکەری خۆیـان) کـە بـە بوونی غولام و وشتر ئەم هەموو ناز و فیزە دەکەن.

نو دولتان: تـازە پێگەیـشتوان، ئەوانـەی تـازە بـە تـازە شـتیان دەسـتکەوتووە و خۆیـان پێگەیاندووە و بە پلە و پایە گەیشتوون.

خر: گوێدرێژ　　　استر: وشتر.

بر خر خودشان نشان: بیانخەرەوە سەر کەری خۆیان (واتە: ریـسوایان کـە، بیانگەڕێنـەرەوە پلە و پایەی یەکەمی خۆیان . لە زۆربەی نوسخەکاندا (با خر خودشان نـشان) هـاتووە کـە لـە رووی ماناوە جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە، هەرچەندە (با) بەواتای (لەگەڵ)یش دێت و ئەوکاتـە ماناکەی زیاتر (نو دولتان) سووکتر دەکات و دەبێتە بیانکە هاودەمی کەری خۆیان.



(نو دولتان) هەمان واعیزانی بەیتی یەکەمە و ئەوانەی کە تازە بە تازە بە پلە و پایەیەك گەیشتوون، بەڵام هەربەوەی بوون بە خاون غولام و وشتر ئیدی ناز و فیزیان بۆ دروستبووە، بۆیە خواجە دوعا دەکات کە خوا بیانخاتەوە پلە و پایەی خۆیان و ریسوایان بکات.

**٦ — بردرِ میخانەی عشق ای ملك تسبیح گوی**

**کاندر آنجا طینتِ آدم مخمّر می کنند**

ئەی فریشتە لەبەر دەرگای مەیخانەی عەشقدا تەسبیحات بکە، چونکە لەوێدا قـوڕی ئـادەم خۆشدەکەن.

بردر: لە بەر دەرگای.　　　ملك: فریشتە، مەلەك.
تسبیح گوی: تەسبیحات بکە، خوداپەرستی بکە کڕنوش بەرە.
طینت: قوڕ، سروشت و ناخی ئادەم.

ئادەم و قوڕی ئادەم — لە روانگەی عیرفانییەوە — بەعەشقەوە شێلراوە و هەر ئەمەشە کـە ئادەم لە تەواوی بوونەوەری دیکە جودا دەکاتەوە و هەر ئەم عەشقەشی بوو، کـە بـووە مایـەی ئەوەی ئادەم باری ئەمانەتی ئیلاهی بخاتە سەرشانی خۆی، بۆیە خواجـە مەیخانـەی عەشـق بـە پیرۆز دەزانێت و بەردەرگای شیاوی ئەوە دەزانێـت کـە فریـشتەکان بـێن و خوداپەرسـتی تێـدا بکەن. بۆیە بە فریشتەکان دەڵێ ئەی فریشتە وەرە بەردەم دەرگای مەیخانەی عەشقی ئیلاهی — ئەو جێیەی کە ناخ و سروشتی ئادەمیان بە عەشـقی ئیلاهـی تێـدا خۆشـکرد و شـێلایان — و لەوێدا خواپەرستی و تەسبیحاتی خۆت بکە، چونکە جێیەکی پیرۆزە.

**٧ — حُسنِ بی پایانِ او چندانکە عاشق می کُشد**

**زمرەای دیگر بە عشق از غیب سر بر می کنند**

جوانی بێ پایانی ئەو هەرچەندە عاشق دەکوژێ، کۆمـەڵێکی دیکـە بەعەشـقی ئـەو سـەر لەغەیبەوە دەردەهێنن.

بی پایان: بێ پایان، بێ کۆتایی، دوایی نەهاتووە.　　　چندانکە: هەرچەندێ، ئەوەندەی کە.
از غیب سربر می کنند: لە غەیبەوە سەردەردەهێنن، پەیدا دەبن.

عاشقان هەمیشە لە عەشقی جوانی (جەمال)ی مەعشوقەدا دەژین و ئەم جوانییە بێ کۆتـا و دوایی نەهاتووەی مەعشوقیش دەبێتە قاتڵ و بکوژی عاشقان کەچـی خواجـە ئـەو ڕاسـتییە دەڵێ کە هەرگیز عاشقان کۆتاییان نایە و لەهەمان کاتدا کە عەشقی جـوانی یـار — خـودا — عارفان و عاشقان دەکوژێت هەر خودی عەشقەکە کۆمەڵێکی دیکە بەرهەم دەهێنێ کە عاشـق

بن و ڕێگەی در و خەتەرناکی عەشقی ئیلاهی بێ عاشق نابێت و سەرچاوەکەشی هەر جوانی مەعشوق و عەشقی ئەوە.

**٨ — ای گدایِ خانقه بَرْجَهْ که در دیرِ مغان**

**می دهند آبی و دلها را توانگر می کنند**

ئەی گەدای خانەقا هەستە کە لە دێری موغاندا، ئاوێك دەدەنێ و (بە هۆیەوە) دڵان بە هێز دەکەنەوە.

خانقه: خانەقا. برجه: هەستە. می دهند: دەبەخشن، دەیدەن.
آبی: ئاوێڵ مەبەست لەشەڕدایە. توانگر: بەتوانا، بەهێز.

خواجە سواڵکەر و گەدایانی خانەقا (سۆفی و دەروێش و واعیز... و هتد ڕەسمییەکان) ئاگادار دەکاتەوە و موژدەیان پێدەدا کە هەستن خانەقا بەجێ بهێڵن و وەرن بۆ دێری موغان (مەیخانەی عەشقی حەقیقی ئیلاهی)، چونکە لە مەیخانەی عەشقی ئیلاهیدا شەڕابی عەشقی حەقیقیتان دەدەنێ کە دەبێتە مایەی بەتوانایی و بەهێزی دڵ و دڵان بەهێز دەکات.

ئەکرێ (برجه) بەواتای لە خۆشیدا هەڵفڕن و بەرزببنەوەش بێت.

**٩ — خانه خالی کن دلا تا منزل سلطان شود**

**کاین هوسناکان دل و جان لشکر می کنند**

ئەی دڵ ماڵ چوڵ کە تاببێتە هەوارگەی سوڵتان، چونکە ئەم هەوەسبازانە دڵ و گیانیان دەکەنە ئۆردوی لەشکر.

خالی کن: چۆڵ بکە. هوسناکان / هەوسبازان، دونیاویستان. لشکر: لەشکر.

دڵێك کە پڕ بێت لە هەوەس و دونیاویستی هەرگیز نابێتە هەوار و مەنزڵی مەعشوق و سوڵتانی حەق، ئەو دڵێك دەگاتە مەنزڵگەی خۆشەویستی خۆی کە مەنزڵگەی هەوەس و ئەغیار و بێگانە نەبێت هەر ئەم ڕاستییە کە شاعیری گەورەی کورد — مەولەوی — دەڵێ:

**شەوەن خەڵوەتەن ماڵ بێ ئەغیارەن**
**عالەم گــرد و تەن دوس خەبەردارەن**
**شەوەن خەڵوەتەن ماڵ بێ ئەغیــارەن**
**عالەم هەموو نوستوون دۆست بەئاگایە**

خواجەش ئەم ڕاستییە چاك دەزانێ و بە ئاگایە لەوەی کە دڵـی دونیاویستان وەك ئۆردوی لەشکر وایە و لەشکرێك هەوەس و ئارەزووی دونیایی تێدایە و سوڵتانی حەقیش بە خۆشەویستی و عەشقییەوە ڕووناکاتە ئەم جۆرە دڵانەی کە جەنجاڵن لە هەوا و هەوەسی دونیایی



بۆیە بە دڵی خۆی دەڵێ، لەکاتێکدا ئەم هەوەسباز و دونیاویستانە دڵیان دەکەنە شوێن و ئۆردوگای لەشکری دونیا و حەزە دونیاییەکان، تۆ ماڵ چۆڵ بکە و بێگانەکان دەرکە تا سوڵتان و مەعشوقی حەق بیکاتە مەنزڵگەی خۆی.

**١٠ – صبحدم از عرش می آمد خروشی عقل گفت**

**قدسیان گویی که شعرِ حافظ ازبَر می کنند**

لەکاتی سپێدەدا لەعەرشەوە جۆش و خرۆشێك دەهات، عەقڵ گوتی: ئەڵێی فریشتە پیرۆزەکان شیعری حافظ لەبەر دەکەن.

صبحدم: کاتی سپیدە. خروش: دەنگە دەنگ و جۆش و خروش.
گویی: ئەڵێی. ازبر میکنند: لەبەر دەکەن.

لە نوسخەی لاهوریدا لەبری (عقل) (عشق) هاتووە کە لەگەڵ مەشرەبی (حافظ) دا زیاتر دەگونجێ و هەر عەشقیش زیاتر ئاگای لە بارودۆخی فریشتەکان هەیە و عەقڵ بەم حەرەمە نامەحرەمە و خودی حافظ لە چەندین شوێندا ئاماژەی بە نامەحرەمی عەقڵ داوە، بەڵام لەبەر ئەوەی لە زۆرینەی نوسخە باوەڕپێکراوەکان (عقل) هاتبوو، بەناچاری عەقڵمان داناوە گەرنا بەندەش لەگەڵ ئەو ڕایەدام کە عەشق جوانترە، بەڵام بەڵگەیەکم دەست نەکەوت.

بەهەر حاڵ خواجە شانازی بە شیعرەکانی خۆیەوە دەکات کە هێندە بەرزن و حیکمەتی عیرفانی و عاشقانەیان تێدایە، کە فریشتە پیرۆزەکانی ئاسمان لەبەریان دەکەن، تەنانەت بەیانییەك زوو وەك چۆن فەقێکانی حوجرە چرپە چرپ و هاتووچۆ و دەنگە دەنگ دەکەن و خەریکی شت لەبەرکردنن ئاوا خرۆش و دەنگە دەنگێ لە ئاسمانەوە بەرگوێ دەکەوت، عەشق (عەقڵ بە پێی بەیتەکە) گوتی: ڕەنگە فریشتە پیرۆزەکانی شیعری حافظ لەبەرکەن (لە گەورەیی و بڵندیدا).

## غەزەلی سەد و نەوەد و حەوتەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفونی مەقسور**
**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلان)**

**١ — دانی که چنگ و عود چه تقریر می کنند**
**پنهان خورید باده که تعزیر می کنند**

ئەزانی چنگ و عود چ قسەیەك دەدرکێنن، بە دزییەوە شەڕاب بخۆنەوە، چونکە (تەعزیر)تان دەکەن.

چنگ: چەنگ، جۆرە سازێکە.          تقریر می کنند: دەدرکێنن.

تعزیر: سەرزەنشت، تەمێ دان، لێدان.

لە ئایینی ئیسلامدا هەندێ گوناه (حەد)ی هەیە، بۆیە حەدی زینا رەجمکردن یا داری حەددە، بەڵام هەندێ گوناهی دیکە هەیە کە حەدی دیاریکراوی نییە و لە قورئان یاخود فەرموودەدا بەڕاشکاوی سنووری حەدەکەی دیارینەکراوە، بەڵام هەر قازی یاحاکمێك دەتوانێت جۆرە تەمێ کردنێك بەکاربهێنێت بۆ سزادانی تاوانبار کە لە روو گرژ کردن و چاو سوور کردنەوەوە دەست پێدەکات تا سەرزەنشت کردن و لێدانیش (بە قامچی یا بەتاکە پێڵاو) بەم جۆرە تەمێکردنە کە سنووری لە قورئاندا بە ئاشکرا دیاری نەکراوە و لە حەد کەمترە دەگوترێت (تەعزیر). د.خرمشاهی لە (حافظ نامە)دا روونکردنەوەیەکی جوانی سەبارەت بە (تعزیر) خستۆتەڕوو. {حافظ نامە، ج ١، ل ٧٢٨}.

لە زۆربەی نوسخە دێرینەکاندا (تکفیر) هاتووە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە لە هیچ سەردەمێکدا حەدی مەی خواردنەوە نەگەیشتۆتە تەکفیر، ساغکەرەوەکانی دیوانی حافظ (تعزیر)یان بەدروستتر زانیوە.

مەیخواردنەوە (کۆڕی عەشق و مەینۆش) بە ئاوازی ساز و عودەوە زیاتر سەرنجڕاکێش و شادی بەخشە، بەڵام لەسەردەمێکدا کە مەیخواردنەوە دەبێتە مایەی لێدان و تەمێ کردن ئیدی بەبێ ساز و چنگ چاکترە، بۆیە خواجە دەڵێ:

لەم سەردەمەدا کە مەیخواردنەوە (عەشقی و خۆشەویستی زاتی) زۆر بەتوندی قەدەغە کراوە و نەیارانی لە دەسەڵاتدان. ئەزانی زمانی حاڵی ساز و عود دەیانگوت چی ؟ دەیانگوت، بە پەنهانی و بە بێ ساز و عود بادەبنۆشن بۆ ئەوەی حاکم تەمێتان نەکات و دوچاری (تعزیر) نەبن.



لەڕاستیدا ئەم شیعرە لە سەردەمێك ئەدوێ کە بەتوندی بەرنگاری مەیومەیخانە (عیرفان و عەشق) بوونەتەوە.

**٢ — ناموسِ عشق و رونق عشّاق می برند**
**عیبِ جوان و سرزنشِ پیر می کنند**

ناموسی عەشق و رەونەقی عاشقان دەبەن رەخنە لەلاو دەگرن و سەرزەنشتی پیردەکەن.

ناموس : ناموسی، ئابڕوو، شەرەف.          رونق: رەونەق.

هەر لە دوی بەیتی یەکەم و ئامۆژگاری عود و سازەکە لە شەرحی لاهوریدا بە (مورشید کامڵ و کاملی عامل) دراونەتە قەڵەم — ناهێڵن و رەخنە لە لاوانی عاشق دەگرن و سەرزەنشتی پیرانی تەریقەت دەکەن و بە هەموو شێوەیەك لۆمەی عەشق و عاشق دەکەن چ پیر و چ لاو، چ کامڵ و چ تازەکار.

**٣ — جز قلب تیره هیچ نشد حاصل و هنوز**
**باطل درین خیال که اکسیر می کنند**

جگە لە سکەی تەزویری رەش هیچیان دەستگیر نەبووە، هێشتاش لەم خەیاڵە پووچەدان کە کیمیا (ئیکسیر) دروستدەکەن.

قلب: سکەی تەزویر و ساختە.          تیرە: رەش.

نشد حاصل: دەستگیر نەبوو، حاصل نەبوو، بەدەست نەهات.

اکسیر: ئیکسیر، کیمیا.

(قلب سیاه) جگە لە سکەی ساختەی رەش هەڵگەڕاو بەواتای دڵی رەش هەڵگەڕاویش دێت، (ئەوان) مەبەست لەوکەسانەیە کە مەینۆشان دارکاری دەکەن و ناموس و رەونەقی عاشقان و عەشق دەبەن و رەخنە لە لاو دەگرن و سەرزەنشتی پیر دەکەن (کەمەبەست لێیان ئەوکەسانەن کەبانگەشەی دینداری دەکەن و تەنیا رووخساری ئایینیان گرتووە و دژایەتی تەریقەت دەکەن و عەشق و عارفان بەکەم سەیر دەکەن و دژایەتییان دەکەن).

جگە لە دڵێکی رەش یا سکەیەکی ساختەی رەش هەڵگەڕاو هیچی دیکەیان بە دەست نەهێناوە کەچی لەو خەیاڵە پوچەدان بەم کارەیان ئیکسیر و کیمیایان بەدەستهێناوە (چاکترین مادده و شت).

**٤ — گویند رمز عشق مگویید و مشنوید**
**مشکل حکایتیست که تقریر می کنند**

دەڵێن ڕەمزی عەشق مەڵێن و گوێی لێ مەگرن (باسی مەکەن)، بەڕاستی باسی حیکایەتێکی زۆر ناڕەحەت دەکەن.

مشکل: ناڕەحەت، سەخت.

ئەوانەی کە دارکاری مەینۆشانی عەشق دەکەن دەڵێن: بە هیچ شێوەیەك باسی عەشق مەکەن و نە باسی ڕازەکانی بکەن و نەگوێشی لێ بگرن، خواجە دەڵێ ئەمە زۆر ناڕەحەتە و ئەم قسە و باسەی کە دەیکەن زۆر بە ناڕەحەتی ئەنجامئەدرێ و مەحاڵە ڕەمز و ڕازی عەشق باس نەکرێت.

**٥ — ما از برونِ درشده مغرورِ صد فریب**

**تا خود درونِ پرده چه تدبیر می کنند**

ئێمە لە دەرگادا بە خەیاڵی سەد فریوەوە لەخۆبایی بووین، ئاخۆ لە ژوورەوە بیر لە چی دەکەنەوە.

لەم بەیتەدا دیسانەوە نێو پەردە و دەرەوەی پەردە هاتووە کە ئەکرێ پەردەی وجود و پەردەی قەدەری ئیلاهی بێت. ئێمە تەواوی مرۆڤەکان لە دەرەوەی حەوشەی ڕاز و تەقدیرداین و بەکردەوەی خۆمان فریومان خواردووە و لە خۆبایی بووین، بەڵام نازانین و بێ ئاگاین لەوەی کە لە نێو پەردەی قەدەردا و لەودیو ئاگایی ئێمەوە چ بڕیارێك دەدەن و بیر لە چی دەکەنەوە و چارەنووسمان بۆ کوێ دەبەن.

**٦ — تشویشِ وقتِ پیرِ مغان می دهند باز**

**این سالکان نگر که چه با پیر می کنند**

دیسانەوە کاتی پیری موغان تێکدەدەن، سەیری ئەم ڕێبوارەنە کە چی لەگەڵ پیردا دەکەن.

تشویش: تێکدان.

وقت: کات، وەقت لە ڕوانگەی عیرفانەوە بارودۆخی حاڵ و مەقاماتە کەلەرابردوو و داهاتوو بێ ئاگا دەبن و لە ئێستادا دەژین.

سالکان: ڕێبوارانی ڕێگەی تەریقەت و عیرفان.

نگر: سەیرکە.

تێکدانی ئەم حاڵەتە ڕۆحانییانە لە پیری موغان (مورشید) یا پیرانی تەریقەت لەلایەن تازە ڕێبوارانەوە لای خواجە ستەمە لە حەقی پیر و لە تازەیی و هەرزەییەوە سەرچاوە دەگرێت و ڕەخنە لەم حاڵەتە دەگرێت، دەڵێ سەیرکە چ ستەمێك لەگەڵ پیردا دەکەن کە دیسانەوە کاتی لێ تێکدەدەن.



**٧ — صد مُلكِ دل به نیم نظر می توان خرید**

**خوبان درین معامله تقصیر می کنند**

ئەتوانرێ بە نێو نیگایەك (میهرەبانانە) سەر موڵکی دڵی بکڕدرێت، بەڕاستی جوانان لەم مامەڵەیەدا کەمتەرخەمی دەکەن.

ملك: کوڵك، وڵات.   میتوان خرید: ئەتوانرێ بکڕدرێ.

تقصیر می کنند: کەمتەرخەمی دەکەن.

خواجە پێی وایە کە تەنیا بە جۆرێ سەیر کردن ئەتوانرێ دڵان ڕازی بکرێت یاخود بۆلای خۆڕاکێشرێت کەچی پێی سەیرە جوانان ئەم شتە ناکەن و لەم مامەڵەیەدا درێغی دەکەن، واتە: جوانان نیگای میهرەبانانەیان نییە. ئەگەرنا بە نیو نیگای میهرەبانانە سەد وڵاتی دڵ دەکڕدرێت.

**٨ — قومی به جدّ و جهد نهادند وصلِ دوست**

**قومی دگر حواله به تقدیر می کنند**

کۆمەڵێك وەسڵی دۆست بە هەوڵ و کۆشش دەزانن و کۆمەڵێکی دیکە دەیدەنە دەست قەدەر.

جد و جهد: هەوڵ و کۆشش.   نهادند: زانین، فەرز کردن، دانە قەڵەم.   حواله: دانەپاڵ.

واتە هەندێ کەس (گرووپێك) پێیان وایە مرۆڤ بۆ ئەوەی بگات بە وەسڵی یار — خودا — پێویستە هەوڵبدات و کۆشش بکات، بەڵام گرووپێکی دیکە ئەمە دەدەنە پاڵ قەدەر پێیان وایە پێشتر بڕیاری لەسەر دراوە.

**٩ — فی الجمله اعتماد مکن بر ثَباتِ دهر**

**کاین کارخانه‌ایست که تغییر می کنند**

هەر چۆن بێ پشت بە نەگۆڕی ڕۆژگار مەبەستە، چونکە ئەمە کارخانەیەکە کە گۆڕانی بەسەردا دەهێنن.

فی الجمله: هەر چۆن بێت، دواجار.   ثبات: مانەوە، نەگۆڕی.

تغیر می کنند: دەیگۆڕن، گۆڕانی بەسەردا دەهێنن ئێستا لە فارسی نوێدا لەبری (تغیر میکنند) (تغیر می دهند) بەکار دەهێنرێت.

خواجە دەڵێ هەرچۆن بێت، دواجار تۆ بڕوا بە خۆڕاگری و نەگۆڕی ڕۆژگار و زەمانە (دونیا) مەکە، چونکە زەمانە کارخانەیەکە بەردەوام دیگۆڕن، هەرگیز پشتی پێ مەبەستە.

**١٠ – میْ ده که شیخ و حافظ و مفتی و محتسب**

**چون نیک بنگری همه تزویر می کنند**

مەیمان بدەرێ، چونکە گەر بەوردی سەیر کەیت شێخ و حافظ و موفتی و موحتەسیب هەموویان ساختە و تەزویر دەکەن.

مفتی: موفتی، فتوادەر. نیك بنگری: بەوردی سەیرکەیت، وردبیتەوە.

(شێخ و حافیز و موفتی و موحتەسیب) رەمزی دەوڵەت و ئاییینداری رواڵەتیانەن کە بەرگری لە عەشق و خۆشەویستی و مەی نۆشی دەکەن. خواجە دەڵێ مەی خۆشەویستی حەقمان بدەرێ، چونکە گەر بەوردی سەیر بکەیت لەناخی شێخ و حافزی قورئان و موفتی و موحتەسیب وردبیتەوە هەموویان خەریکی خراپە و ساختەن. واتە: ئەوانیش پاك نین و تەنیا رواڵەتن گەرچی بانگەشەی پاکی دەکەن.

هروی پێی وایە (حافظ) خودی شاعیرە و خۆشی دەخاتە ریزی ئەوانەوە. { هروی، ج ٢، ل١٤٧} بەڵام ئەم رایە رێی تێناچێت.



## غەزەلی سەد و نەوەد و هەشتەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی مەقسور**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلان)**

**١ – شرابِ بی غش و ساقیِّ خوش دو دام رَهَند**

**که زیرکانِ جهان از کمندشان نرهند**

شرابی بێ غەش و ساقی سەرنجڕاکێش دوو داوی سەرەڕێن، کە زیرەکەکانی جیهان لە کەمەندیان رزگار نابێ.

خوش: (خۆش ئەندام) جوان و سەرنجڕاکێش، دلڕفێن

رهند: لەبنەڕەتدا (راه هستند) کە بەواتای (رێگەن)ە.

زیرکان: زیرەکان، عاقڵان.

نرهند: رزگاریان نابێ لە چاوگی (رستن) وەرگیراوە بەواتای رزگار بوون، نەجاتبوون.

خواجە لە شەڕابی ساف و ساقی و سەرنجڕاکێش ئەو دوانە ئەدوێ کە وەك داوی سەرەڕێن و هێندە سەرنجڕاکێش و دلڕفێن کە دڵی هەموو خەڵکی ئەسیری خۆیان دەکەن، تەنانەت عاقڵ و زیرەکەکان (زۆرزان)ەکانی دونیاش ناتوانن خۆیان لە دەستیان رزگار بکەن.

لە زاراوەی عیرفانیدا ساقی مورشید و شەڕاب عەشق و خۆشەویستی حەقە، کە ئەمە دوو هێندە سەرنجڕاکێش تەنانەت عاقڵان (زاهید و سۆفییە رەسمییەکانیش) ناتوانن لە داوی عەشقی حەقیقی رزگاریان ببێ.

**٢ – من ارچه عاشقم و رند و مست و نامه سیاه**

**هزار شکر که یارانِ شهر بی گُـنَهَند**

گەرچی من عاشق و رەندە و مەست و نامەڕەشم، هەزار شوکر کە هاوڕێیانی شار بێ گوناهن.

ارچه: گەرچی. نامه سیاه: نامەڕەش، تاوانبار.

بی گنهند: بێ گوناهن.

ئەم بەیتە توانج و پلارە لە زیرەکانی بەیتی پێشوو کە لێرەدا بە هاوڕێیانی شار ناویان دەبات و سەرزەنشتی خواجە دەکەن بەوەی کە تەریقەتی رەندی و مەستی و عاشق گرتووە و گوناهبارە، بە پلارەوە پێیان دەڵێ: من گوناهبارم تەنیا سوپاس بۆ خوا کە ئێوە بێ گوناهن!!

**٣ – قدم منه به خرابات جز به شرط ادب**

**که ساکنان درش محرمان پادشهند**

به بێ شەرتی بە ئەدەبی پێ مەنێرە مەیخانە (خرابات)ەوە، چونکە ئەوانەی لەبەر دەرگایـدا دادەنیشن مەحرەمی پادشان.

قدم منه: هەنگاو مەنێ.

خەرابات ڕەمزی شوێنی عەشقە و عارفان بەخەڵوەتخانەی پیرانی دەزانن، خواجە دەڵێ: بەبێ لەبەرچاوگردنی ئەدەب پێ مەخەرە مەیخانە و خەراباتی عەشقەوە، چونکە تەنانەت ئەو هەژارانەی لەبەردەم دەرگاکەیدا دادەنیشن لە نزیك و مەحرەمەکانی پادشای حەقن. واتە: مەیخانە عەشق پیرۆزە و بەبێ ڕەچاو کردنی ئەدەب مەڕۆ بۆ ئەوێ.

**٤ – جفا نه پیشه‌ی درویشی است و راهروی**

**بیار باده که این سالکان نه مردِ رهند**

ستەم پیشەی دەروێشی و ڕێبواری نییە، بادە بهێنە، چونکە ئەم ڕێبوارانە پیاوی ڕێگە نین.

راهروی: ڕێبواری و دەروێشی.      نەمرد رهند (مرد ره نیستند): پیاوی ڕێگە نین.

دەروێش و ڕێبواری ڕاستەقینەی ڕێگەی حەق ستەم لە خەڵك و لە یەکتری ناکەن، ئەوەی کە زوڵم دەکات سۆفیلکەی دەروونییە (سالکان) و زاهید و زیرەکەکانی بەیتی یەکەمین کە خۆیان بە ڕێبواری ڕێگەی حەق داوەتە قەڵەم. مادام وایە ئێمەی دەروێشان ئەهلی زوڵم و ستەم نین، بادەی عەشق بهێنە با عاشق بین و خۆمان بە سۆفیلکە و ڕێبوارە درۆزنەکانەوە خەریك نەکەین، چونکە ئەوان پیاوی ڕێگەی عەشق نین.

**٥ – مبین حقیر، گدایانِ عشق را کاین قوم**

**شهانِ بی کمر و خسروانِ بی کُلَهند**

بەسووکی سەیری هەژارانی عەشق مەکە، چونکە ئەم کۆمەڵەیە، پادشای بێ کەمەربەند و تاجن.

مبین حقیر: بەسووکی سەیر مەکە، بەسووکی لێیان مەڕوانە.      شهان/ شاهان: پاشایان.

کمر: کەمربەندی تایبەت بە پادشا.      کله / کلاه: کڵاو، تاجی پاشایەتی.

خواجە ڕووبەکەسی سێیەم (غائب – کە ئەکرێ زیرەکانی بەیتی یەکەم، یا ئەوانەی ڕەخنە لە عارفان دەگرن) دەکات و دەڵێ: بە سووکی لە هەژار و گەدایانی عەشق مەڕوانە، چونکە ئەم کۆمەڵەیە (عارفان / عاشقان) پادشا و سوڵتانن، بەڵام تاج و کەمەربەندیان نییە، واتە گەورەیی پادشایانیان هەیە، بەڵام ڕواڵەتیان وەك ئەوان نییە.



**٦ – به هوش باش که هنگام بادِ استغنا**

**هزار خرمنِ طاعت به نیم جو نخرند**

هۆشیاربە کە کاتێ بای بێ نیازی (استغنا) هەڵکات هەزار خەرمانی خواپەرستی (تاعەت) بە لەتە جۆیەك وەرناگرن.

بە هۆش باش: هۆشیاربە، بەئاگابە.      هنگام: کاتی.

استغنا: بێ نیازی خوا لە بەندەکانی، کە هیچ پێویستییەکی بە عیبادەتی مرۆڤ نییە.

ننهند: وەرناگرن، ناگۆڕنەوە (بێگومان لێرەدا ئەم واتایانە دەدات لە بنەڕەتدا نهادن: - دانان، نان- ە).

تەواوکەری بەیتی پێشووە و بەوکەسانەی کە هەمیشە خەریکی عیبادەتی وشکن دەڵێ: ئاگادار و هۆشیار بن سەردەمێ کە بای ئیستیغنای خودا –کە پێویستی بە عیبادەتی کەس نییە – هەڵکات هەزار خەرمان خواپەرستی و وشکە تاعەت لەتە جۆیەك ناکات.

لە مجالس {ج ١، ل ٣٤ }دا هاتووە: (لە ڕۆژی قیامەتدا پێغەمبەران و بەندە و پیاوچاکەکان دەهێننە پێشەوە، بەڵام ئیبلیس (شەیتان) ناهێنن و عیبادەت و (طاعت)ی حەوت سەد هەزار ساڵی دەهێننە پێشەوە بایەکی توندی لەلای بێ نیازی- ئیستیغنا- ی خوداوە هەڵدەکات و بەبای دەدات.

{دیوانی حافظ نسخەی فریدون میرزای تیموری، بە اهتمام، احمد مجاهد، ل ٣٠٩ سال ١٣٧٩، چاپ اول تهران} .

**٧ – مگو که کوکبەی دلبری شکسته شود**

**چو بندگان بگریزند و چاکران بِجَهَند**

مەڵێ: کاتێ بەندە و غوڵامان هەڵهاتن و پشتیان هەڵکرد، گەورەیی و شەوکەوتی دولبەری تێکدەشکێت.

کوکبە: گەورەیی، شان و شکۆ.      شکسته شود / شکسته می شود: دەشکێت.

چو: کاتێ، گەر.      بگریزند: هەڵبێن.      بجهند: پشت هەڵکەن، رابکەن.

جگە لە شەرحی (لاهوری) دا لە نوسخەکانی دیکەدا لەبری (مگو) (مکن) هاتووە کە مانای بەیتەکە بەتەواوی دەگۆڕێت.

گەر (مکن) بێت مانای بەیتەکە دەبێتە: مەکە (خراپە مەکە)، چونکە گەر بەندە و غوڵامانی دەوروبەرت هەڵبێن و پشتت تێبکەن گەورەیی و شان و شکۆت نامێنێ و گەورەیی و شەوکەتت بەندە بە بوونی بەندە و غوڵامەکانی دەوروبەرتەوە بۆیە لەگەڵیان چاکبە تا وازت لێ نەهێنن.

ئەم مانایە کێشەیەك دەنێتەوە کەلەگەڵ بۆچوونی حافظ و تەواوی عارفان و تەنانەت دیندارانیشدا یەکناگرێتەوە. کە ئەویش پێویستی دوڵبەر یا دوڵبەرییە بە غوڵام و چاکران واتە تا عاشق نەبێ مەعشوقیش هیچ نییە. ئەمەش لەگەڵ سیفەتی بێ نیازی موستەغنی — خودادا پێچەوانەیە. (مکن) کاتێ راستە کە خواجە ئەم قسانە بە (زیرەکان) و پادشا و سوڵتانانی دونیایی بڵێت، هەر بۆیە لە یەکێ لە نوسخەکانی فریدون میرزادا لەبری (دلبر) (خسروی) هاتووە، لە راستیدا (خسروی / پادشایی) ئەم کێشەیە دەڕەوێنێتەوە، بەڵام (دلبری) کێشە دروستدەکات.

بەڕای بەندە (مگو)، (دلبری) لەگەڵ واتای گشتی غەزەلەکە و بیری عارفانەی خواجەدا زیاتر یەکدەگرێتەوە و بەیتەکەش زیاتر شەرح و درێژ کردنەوەی بەیتی پێشووە و مانای (ئیستیغنا) زیاتر روون دەکاتەوە.

رایەکی فەلسەفیانە هەیە کە بریتییە لەوەی کە خوایەتی خوا بەندە بە بوونی بەندەکانەوە ئەگەرنا مانای نییە؟ عارفان ئەم رایە بەتەواوی رەتدەکەنەوە و پێیان وایە کە بوونی بەندە و غوڵامان یا هەڵاتن و راکردنیان هیچ کاریگەرییەکی لەسەر گەورەیی و شان و شکۆی دوڵبەری نییە و خواجە بە زیرەکان دەڵێ: هەرگیز مەڵێن کاتێ بەندە و غوڵامان رایانکرد و پشتیان هەڵکرد لە شان و شکۆی دوڵبەری کەم دەبێتەوە.

**٨ — غلامِ همّتِ دُردی کشانِ یکرنگم**

**نه آن گروه که ازرق لباس و دل سیَهَند**

غوڵامی هیمەتی مەینۆشانی یەکڕوم نەئەو کۆمەڵەی کە جل شین (بەرکی سۆفییان) و دڵڕەشن.

ازرق لباس: جل شین (بەرگی تایبەتی سۆفییان).    دل سیه: دڵڕەش.

یەکرنگم: یەکڕوو، یەکڕەنگ، رێك و راست.

خواجە عاشقانی رێگەی حەق و سۆفییە رەسمییەکان لە یەکدی جودا دەکاتەوە و خۆی دەکاتە غوڵامی عاشقانی یەکڕەنگ، ئەو سۆفییەکان (سۆفیلکە ریابازەکان کە تەنیا لە رواڵەتدا سۆفین) بە جل شین و دڵڕەش ناوزەد دەکات و ئامادە نییە خۆی بکاتە غوڵامیان.

**١٠ — جنابِ عشق بلند است همّتی حافظ**

**که عاشقان ره بی همّتان به خود ندهند**

دەرگای عەشق بەرزە، حافظ هیمەتێ بکە، چونکە عاشقان جێگەی بێ هیمەتان ناکەنەوە.

جناب / دەرگا، ئاستانە.    بلند: بەرز.    همتی: هیمەتێ بکە.

ره به خود ندهند: لەگەڵ خۆیاندا شوێنیان ناکەنەوە، ئامادەنین لەگەڵیاندا بن.



عەشق دەرگا و ئاستانەیەکی بەرزی هەیە و گەیشتن بەو ئاستانەیە کارێکی ئاسان نییە و هەوڵ و هیمەتێکی دەوێ، جگە لەمەش عاشقان ئامادە نین جێگەی بێ هیمەت و ترسنۆکان بکەنەوە، بۆیە حافظ خۆی ئاگادار دەکاتەوە کە ئەگەر دەتەوێ لە زومرەی عاشقان بیت و بە دەرگای عەشق بگەیت هیمەتێ بکە.

## غەزەلی سەدونەوەد و نۆیەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەصلەمی موسبغ**
**(فعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**۱ — بود آیا که در مکیده‌ها بگشایند**
**گره از کارِ فروبسته‌ی ما بگشایند**

بلێی دەرگای مەیخانەکان بکەنەوە و گرێ کوێرەی کاری ئێمە بکەنەوە.

بود آیا: بلێی ؟ بگشایند: بکەنەوە. فروبسته: بەستراو.

کاتێ کە دەرگای مەیخانەکانی داخراون، گرێ لەسەر کار و مرازەکانی دڵی خواجە و ئەربابانی دراوە، ئێستا بەکردنەوەی دەرگای مەیخانەکانی عەشق ئەوگرێ کوێرەیە دەکرێتەوە، بۆیە ئاوات دەخوازێ یا دەپرسێ و دەڵێ: بلێی دەرگای مەیخانەکانی عەشق بکرێنەوە بەم کرانەوەیەش گرێ کوێرەی سەر کاری ئێمە بکرێتەوە.

**۲ — اگر از بهرِ دلِ زاهدِ خودبین بستند**
**دل قوی دار که از بهرِ خدا بگشایند**

ئەگەر لەبەر خاتری دڵی زاهیدی خۆویست دایانخستووە، نائومێد مەبە کە لەبەر خوا دەیکەنەوە.

از بهر: لەبەر، لەبەر رەزامەندی. خودبین: خۆویست.

بستند: دایانخستووە. دل قوی دار: نائومێد مەبە.

خواجە ئومێد دەخاتە دڵی عاشقانەوە (یا خۆیەوە) کە کاتێ لەبەر خاتری دڵی زاهیدی خۆویست دەرگای مەیخانەکانی عەشقیان داخستووە لەبەر رەزامەندی خوا (بەویست و هێزی ئەو) دەیکەنەوە.

**۳ — به صفای دلِ رندانِ صبوحی زدگان**
**بس درِ بسته‌به مفتاحِ دعا بگشایند**

سوێند بە پاکی دڵی رەندان کە بادەنۆشن، زۆر دەرگای داخراو بە کلیلی نزا و پاڕانەوە دەکرێنەوە.

به: بە، بۆ سوێند خواردنە.

صبوحی زدگان: بادەی بەیانی نۆشان، عاشقانی بەرەبەیانی، عاشقانی شەوبێدار.



مفتاح: کلیل.

خواجە سوێند بە پاکی دڵی عارفانی، عاشق (ئەوانەی کە بەرەبەیان بادەی عەشق دەنۆشن) دەخوات کە کلیلی نزا و پاڕانەوە هەزاران دەرگای داخراو دەکاتەوە و کێشە چارەسەر دەکات.

**٤ — نامه‌ی تعزیتِ دخترِ رز بنویسید**
**تا حریفان همه خون از مژه‌ها بگشانید**

پرسەنامەی کچی رەز (مێو) بنووسنەوە تا هاودەمان (بادەنۆشان) هەموویان خوێن لە برژانگیان بڕژێنن.

نامه‌ی تعزیت: تازێنامە، پرسەنامە. دختر رز: کچی مێو، مەبەست لە ترێ یا شەڕابە

تازێنامەی شەڕاب (داخستنی دەرگای مەیخانەکان و قەدەغەکردنی مەی و شەڕابە — کچی رەز..) ئەم تازێنامەی شەڕابە کاریگەری زۆری لەسەر بادەنۆشان و عاشقان دەبێت، بۆیە خواجە دەڵێ: تازێنامەی شەڕاب و مەسەلەی قەدەغەکردنی بنووسنەوە تا بەخوێندنەوەی بادەنۆشان هێندە بگرین لەبەری فرمێسك خوێن لە برژانگەکانیان بتکێ.

**٥ — گیسویِ چنگ ببرّید به مرگِ میِ ناب**
**تا همه مغبچگان زلفِ دو تا بگشانید**

پرچی چەنگ (ساز) ببڕن بە مەرگی شەڕابی بێ غەش تا هەموو موغبەچەکان پرچی دووتا بئالۆسکێنن و بڕنن.

ببرید: ببڕن. بگشانید: (لێرەدا) بئالۆسکێنن، بڕنن.

بەیتەکە ئاماژەیە بە تازییە و مەراسیمی پرسەی ژنان کە لە کاتێ مەرگی خۆشەویستێکدا پرچ دەڕنن و تەنانەت پرچ دەبڕن. جاران باوبووە کە تازیەدار پرچی دەبڕێ و هاودەم و هاوڕێیانیش بۆ دەربڕینی هاودەردی و هاوخەمی پرچی خۆیان دەڕنی.

خواجە لەم بەیتەدا (چەنگ / ساز) بە کەسی شەڕاب دەزانێت و موغبەچە و منداڵە موغەکانیش بە هاوڕێ و هاوخەمانی (چەنگ) دەزانێت. بۆیە دەڵی بە مەرگی مەی بێ غەش کە قەدەغەکردنی مەی و داخستنی دەرگای مەیخانەیە پرچی چەنگ ببڕن تا منداڵە موغانەکانیش بۆ دەرخستنی هاوخەمی پرچی رووتاو پەلکەی خۆیان بڕنن و بیئالۆسکێنن.

لە هەندێك نوسخەدا وەك قەزوینی، و سودی، خرمشاهی... میسراعی دووەمی ئەم بەیتە و بەیتی پێشوو جێگۆڕکێیان پێ کراوە.

**۶ –درِ میخانه ببستند خدایا مپسند**

**که درِ خانەی تزویر و ریا بگشانید**

دەرگای مەیخانەیان داخست، خوایە پەسەندی مەکە، دەرگای ماڵێ تەزویر و ریا بکەنەوە.

ببستند: داخست.   مپسند: پەسەندی مەکە، قەبوولی مەکە.

در بگشانید: دەرگا بکەنەوە.

خواجە قەبوولی مەکە کە دەرگای مەیخانەیان داخستووە تا دەرگای ماڵی تەزویر و ریابازی بکەنەوە، لێرەدا خواجە مەیخانە بە ماڵی پاکی و سادەیی داناوە و لەبەرامبەریشدا ماڵی زوهدی بەماڵی تەزویر و ریابازی داناوە، دەڵێ ئەوان کە دەرگای مەیخانە دائەخەن دەرگای زوهد ئەکەنەوە کە پاکی و سادەیی نامێنێ و ساختە و ریابازی دەستپێدەکات.

**۷ – حافظ این خرقه که داری تو ببینی فردا**

**که چه زنّار ز زیرش به دغا بگشایند**

حافظ بەیانی دەبینی لە ژێر ئەم خرقەیەی کە تۆ هەتە، چەندە زوناری فڕوفێڵ و دەغەڵی لە ژێریدا دەکەنەوە.

فردا: بەیانی.   به دغا: دەغەڵی و خراپەکاری.

واتە: حافظ بەزوویی دەبینی کە لە ژێر ئەم خرقەیەی لەبەرت کردووە (بۆ خەڵەتاندن و فریودانی خەڵکی) بتەوێ و نەتەوێ چەندە پیشتوێن و زوناری فڕوفێل و دەغەڵی دەکەنەوە و ریسوا دەبیت. مەبەست لەوەیە کە ژێر خرقەی زوهد و زاهیدان پڕە لە پشتوێنی دەغەڵی و خراپەکاری.



## غەزەلی دووسەدەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسڵەمی موسبەغ**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**۱ – سالها دفترِ ما در گروِ صهبا بود**

**رونق میکده از درس و دعایِ ما بود**

ساڵانێك دەفتەری ئێمە بارمتەی شەڕاب بوو، رەونەقی مەیخانەش لە دەرس و پاڕانەوەی ئێمەوە بوو.

دفتر: دەفتەر، دەفتەری شیعر.   صهبا: مەی، شەراب.

خواجە دەڵێ ساڵانێکی دەفتەری شیعری ئێمە کە سۆزی پاکی دڵ و هزرمان بوو، لەبری شەڕاب و مەی (خۆشەویستی و عەشق) دادەنا و مەیخانەکان بەدەرس خوێندن و نزا و پاڕانەوەی ئێمە رەونەقیان بۆ پەیدا دەبوو.

**۲ – نیکیِ پیرمغان بین که چو ما بَدْمَستان**

**هر چه کردیم به چشم کرَمَش زیبا بود**

سەیری چاکی پیری موغان کە ئێمەی بەدمەستان هەرچیمان کرد بە چاوی کەرەم و گەورەیی لێی روانی و لای جوان بوو.

نیکی: چاکی.   بدمستان: بەد مەستان، کەسانێ کە بە تەواوی مەست و سەرخۆش دەبن.

پیری موغان خاوەن مەیخانەی عەشقە کە (قطب الاقطاب)ە یاخود مورشیدی کامڵە لە عیرفان و سۆفیگەریدا (بەد مەستان)یش ئەو سۆفی و دەورێشانە (عاشقانە)ن کە لە بادەی عەشقدا بە تەواوی مەست دەبن و دەگەنە سنووری (شطحات) و قسە و رەفتاری مەستانە و دوور لە نەریتیان لێ دەبینرێت.

خواجە لە گەورەیی پیری موغان ئەدوێ دەڵێ: بەڕاستی پیری موغان (مورشیدی کامڵ)ی ئێمە زۆر گەورەیە کاتێ کە ئێمە بە تەواوی مەستی بادەی عەشق بووین و لەخۆیەوە قسەمان کرد ئەو بەگەورەیی خۆی هەرچیمان وت و هەرچیمان کرد بە جوانی وەریگرت و رەخنەی لێ نەگرتین.

**۳ – دفترِ دانشِ ما جمله بشویید به می**

**که فلك دیدم و در قصدِ دلِ دانا بود**

هەموو دەفتەری زانستی ئێمە بەمەی بشۆن، چونکە فەلەکم بینی و بەنیازی لەناوبردنی دڵی دانا بوو.

دانش: زانست.          بشوييد: بشۆن.

فلك ديدم: فەلەكم بينى، ئەستێرەم گرتەوە (لە زانستى گەردوونناسيندا).

در قصد دل دانا بوو: دەيويست دڵى دانا و هۆشيار لەناو بەرێت.

فەلەك و رۆژگار يار زەمانە هەميشە مرۆڤى هيچ و پوچ لەباردانەبوو گەشە پێ دەدات و مرۆڤى دانا و وشيار و پياوچاكان لەناو دەبات (لێرەدا ئەم عاقڵى و زانستە جياوازە لەو عەقڵ و زانستەى كە خواجە لەكاتى باسى عيرفاندا بە نێگەتيڤى باسياندەكات).

خواجە دەڵێ: من فەلەكم ديوە و زەمانە خۆشيى لە مرۆڤى دڵ وشيار نايەت و بەنيازە لەناوى ببات، ئێمەش دڵمان هۆشيارە و دەفتەرمان لە زانستە، جا بۆ ئەوەى فەلەك لە ناومان نەبات دەفتەرى زانستمان بەمەى بشۆن، واتە: هێندە مەيمان بدەنێ كەمەست بين و زانست لەسەرماندا نەمێنێ تا فەلەك لەناومان نەبات.

بە كورتى: فەلەك بەوەى كە هيچ و پوچان گەورە دەكات و دژايەتى تێدايە بووەتە و دەبێتە خۆرەى مێشكى عەقڵان جا چاكتروايە مەست بين و خۆمان لەخەوى گەورەيى دواليزم و دژايەتييەكانى فەلەك و زەمانە لەياد كەين.

**٤ – از بتان آن طلب ار حُسن شناسى اى دل**

**كاين كسى گفت: كه در علمِ نظر بينا بود**

ئەى دڵ گەر جوانناسى داواى خوێنگەرمى لە ياران بكە، چونكە ئەمە كەسێ گوتوويەتى، كە لە جوانناسيندا شارەزا بووە.

آن: خوێنگەرمى، خوێن شيرينى.          حسن شناسى: جوان ناس.

علم نظر: زانستى جوانيناسى.          بينا بود: شارەزا بوو.

مەرجى ياران و دولبەران و بوتان لاى خواجە خوێنگەرمى و خوێن شيرينييە، لاى ئەو يار و دولبەر و ئەوەى نييە كە كەمەرى باريك و قژى درێژى هەبێت، بەڵكو ئەوەى كە خوێن شيرينە (شاهد آن نيست كەمويى و ميانە دارد) لەم بەيتەشدا بە دڵى خۆى دەڵێت:

ئەى دڵ گەر جوانناسيت داواى مەرجى خوێنگەرمى بكە لە دولبەر و ياراندا نەوەك جوانى جەستەيى، چونكە ئەم قسەيە كەسێك كردوويەتى (مەرجى جوانى خوێنگەرمييە) كە لە جوانى ناسيدا شارەزا بووە.

**٥ – دل چو پرگار بەهر سو دَوَرانى مى كرد**

**واندر آن دايرە سرگشتەى پابرجا بود**

دڵ وەك پەرگاڵ بە هەموو لايەكدا دەسوڕايەوە، لەو بازنەيەشدا سەرلێشواوى جێگير بووە.



پرگار: پەرگاڵ.          سرگشتە: سەر لێشێواو.          پابرجا: جێگير.

حافظ زۆر جار پەرگاڵى بۆ دروستكردنى وێنەى شيعرى ياخود هونەرەكانى رەوانبێژى هێناوەتەوە. پەرگاڵە كە دوو(سەر)ى هەيە، بەردەوام يەكێكيان دەسوڕێتەوە ئەوى ديكەيان لەنێوبازنەكەدا جێگيرە، واتە: لە هەمانكاتدا سەرێكى سەرلێشێواوە سەرێكى ديكەى جێگيرە (ياخود بەردەوامە)

ئەو بازنەيەى لەم بەيتەدا هاتووە، بازنەى عەشقە، دڵى خۆى لە بازنەى عەشقدا بە پەرگاڵێك ئەداتە قەڵەم كە بەهەموولايەكى ئەو بازنە دا دەڕوات و سەرلێشێواوە و جێگير و بەردەوام وازى لێ ناهێنێ، واتە دڵم لە كاتێكدا كە لە بازنەى عەشقدا سەرلێشێواوە جێگيرە و لێى راناكات.

**٦ – مطرب از دردِ محبّت عملى مى پرداخت**

**كە حكيمانِ جهان را مژە خون پالا بود**

موتريب لە دەردى خۆشەويستييەوە ئاوازێكى لێدەدا كە برژانگى حەكيمان جيهان دەبووە پاڵاوگەى خوێن.

عمل: لە زاراوەى مۆسيقادا ئاواز و داهێنانى ئاوازى نوێيە.     ميپرداخت: لێدەدا، دەژەند.

خون پالا: پاڵاوگەى خوێن، خوێن برژێن.

موتريب – كە مۆسيقا ژەن و گۆرانى بێژە – لە دەردى عەشق و خۆشەويستييەوە ئاوازێكى هێندە كاريگەر و غەمبارانەى دەژەند كە حەكيمانى دونيا لە خەمدا هێندە دەگريان فرمێسكيان دەبووە خوێن و بە برژانگەكانياندا دەپرژا ياخود برژانگەكانيان دەبووە پاڵاوگەى خوێن.

**٧ – مى شكفتم ز طرب زانكە چوگل بر لبِ جوى**

**بر سرم سايەى آن سروِ سهى بالا بود**

لە خۆشيدا دەپشكوتم، چونكە وەك گوڵ بووم لەسەر كەنارى جۆگەلە و ئەو سەروە بەژن رێكە سێبەرى سەر سەرم بوو.

جوى: جۆگەلە، جۆگە.          برسرم: بەسەرمەوە.          سهى بالا: بەژن رێك.

خواجە خۆى بە گوڵ و يارى بە دارسەروى بەژنرێكى سێبەر چڕ چواندووە، ئەڵێ: كاتێ من وەك گوڵ لەكەنار و رۆخى جۆگەلەدار وا بووم لە خۆشيدا دەگەشامەوە، چونكە يارى بە ژنرێك – كەلەسەرو دەچێت – سێبەرى بەسەرمەوە كردبوو.

**٨ — پیرِ گلرنگِ من اندر حقِ ازرق پوشان**

**رخصت خبث نداد ار نه حکایتها بود**

پیری رووخسار وەك گوڵی من مۆڵەتی نەدا بە خراپە باسی سۆفییان (شین پۆشان) بکەم ئەگەرنا بەسەرهات و چیرۆکێکی زۆر بوو.

گلرنگ: گوڵ رووخسار، ئەو کەسی کە رووخساری وەك گوڵ جوانە.

ازرق پوشان: سۆفییان — کە خرقەی شینیان لەبەر کردووە.

رخصت: مۆڵەت. خبث: خراپە. ارنە: ئەگەرنا.

خواجە دەربارەی سۆفیلکەکان بەسەرهاتی فرِوفێڵ و خراپەکانی زۆر دەزانێت، بەڵام دەڵێت: پیری جوانی، رووخسار پاك و دڵ پاکی نەیهێشت من دەرحەق بەوان خراپە بکەم (و غەیبەتیان بکەم) ئەگەرنا گەر باسی فرِوفێڵی سۆفیلکەکانم بکردایە دونیایەك چیرۆك و بەسەرهات هەبوو.

د. زرین کوب (پیرگلرنگ) بە شەرابی پیر و ماوە (می باقی) دەزانێت، واتە عەشق رێگەی نەدام غەیبەتی سۆفیلکەکان بکەم.

لاهوری (پیر گلرنگ) بە پیرێکی شاری شێراز ئەداتە قەڵەم کەلەسەردەمی حافظدا ژیاوە. {لاهور، ج ٢، ل ١٣٢٨}.

هەرچۆن بێت پیر (گەر شەراب یا پیرێکی تایبەت یا هەر پیرێکی رەمزی وەك پیری موغان بێت) لای حافظ گەورەیە و بە گوێی دەکات.

(خبث) خراپە و خراپە گوتن لەم بەیتەدا ئەکرێ مەبەست لە غەیبەت بێت.

**٩ — قلبِ اندودەی حافظ بر او خرج نشد**

**کە معامل بە همە عیب نهان بینا بود**

سکە دڵی رتوشکراوی حافظ لای ئەوخەرج نەکرا، چونکە مامەڵەچی، شارەزای هەموو عەیبە شاراوەکان بوو.

اندودە: روپۆشکراوە، رتوشکراوە، تەزویر. بر او: لای ئەو. خرج نشد: خرج نەکرا.

مهامل: مامەڵە کەر. عیب نهان: عەیبی شاراوە.

(قلب) لێلی تێدایە و بەواتای دڵ و سکەی تەزویر دێت، دڵی حافظ یا سکەی حافظ کە لە ناوەوە چاك نەبوو، بەڵام چینێکی چاکی بەسەردا درابوو (روپۆشکرا بوو) لای ئەو خەرج نەکرا و نەیویست و هیچی نەکرد، چونکە ئەو کە مامەڵەچی بوو، ئاگای لە تەواوی عەیبە شاراوەکانی دڵ / سکەی حافظ بوو.



لەم بەیتەدا ئەو ئەکرێ پیر یا مەعشوقی حەق بێت کە ئاگایان لە دڵی عاشقان هەیە و پێویست بە فرِوفێڵ شاردنەوە ناکات.

## غەزەلی دووسەد و یەکەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسڵەمی موسبەغ**
**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**١ — یاد باد آنکه نهانت نظری باما بود**
**رقم مهرِ تو برچهرەی ما پیدا بود**

یادیان بەخێر ئەو رۆژانەی کە بە پەنهان چاوێکت لە ئێمە بوو، نیشانەی میهر و خۆشەویستی تۆ بە نێو چاوانی ئێمەوە بوو.

یاد باد: یادیان بەخێر. نهانت: بە پەنهانی. نظری باما بود: چاوێکی لێمان بوو.
رقم: نیشانە. پیدا بود: دیار بوو.

پێشتر باسمان لە لێڵی غەزەلەکانی حافظ زۆری روانگەکانی شەرحی شیعری حافظ کردووە، کە خواجە لە عارفێکی - لسان الغیب و شەهید- ەوە تا مەینۆش و عەیاشێك دەبەن. لەم غەزەلەدا روانگەیەکی سەیرتر بەرچاو دەکەوێت، کە ناوزەد کردنی حافظ بە (میترا پەرستی) د. هروی لەشەرحی ئەم غەزەلەدا و بە پشتبەستن بە دایەکانی هاشم رضا (آئین مهر، میترایسم) پێی وایە کە ئەم غەزەلە ئاماژەی تێدایە بۆ میتراپەرستی یا خۆرپەرستی یا میهر پەرەست بوونی حافظ یا هەر هیچ نەبێت زانیاری ئەو سەبارەت بەم ئایینە — هەر چەندە د. هروی پشتگیری لەم رایە ناکات گومانی لێدەکات — بەڵام رایەکی هاشم رضا نەقڵ دەکات — ئەڵبەت رەتی دادەتەوە — کە دەڵێ: ((گومانی تێدا نییە کە حافظ ئەم غەزەلەی ئاماژە بە ئایینی میترا نووسیوە کە خۆی یەکێك بووە لە شوێنکەوتوانی)). {هروی، ج ٢، ل ٨٥٨}.

سەیر لەوەدایە زۆرینەی راڤەکانی — راستتر وایە تەواوی راڤەکانی — دیوانی حافظ هێندە لەم بەیتە یاخود گەر لایەنی عیرفانی غەزەلەکە فەرامۆش بکەین غەزەلەکە شەرحێکی مێژوویی بۆ کراوە کە بۆ (شا شێخ ابو اسحاق) نووسراوە (غنی) {خرمشاهی، ج ١، ل٧٤٣}.

لە لایەکی دیکەوە سەیرتر ئەوەیە کە حافظ ئەو دونیا غەزەلە ئاشکرایەی هەیە کە بە ئاشکرا موسڵمانییەتی و تەنانەت ئەشعەری بوون و سونی بوون و شافعی بوونی ئەخاتەڕوو کەچی (هاشم رضا) بەم تەنیا بەیتە یا غەزەلە کە رەنگە لە دوورترین مانای بارکراویدا بەو رایانەی ئەو بگاتەوە دەکاتە بەڵگەی رەها و یەکلاکەرەوە بۆ میترایی بوونی حافظ.



خواجە لێرەدا وەسفی زاتێك — گەورە و سەردارێك — دەکات، کە لە شەرحە عیرفانییەکان بە زاتی حەق دراوەتە قەڵەم — و لەشەرحی مێژووییەکانیشدا بە (شا شێخ ابو اسحاق) یاخود (قوام الدین صاحب عیاری وەزیر) دراوەتە قەڵەم و تیایدا لە میهر و خۆشەویستی ئەو بۆ خۆی دەدوێت و دەڵێ: یادیان بەخێر ئەو رۆژانەی کە لوتف و کەرەمی بەسەرمەوە بوو، بە پەنهانی هەمیشە چاوی کەرەمت لێم بوو، نیشانەی خۆشەویستی بەنێو چاوانمەوە بوو.

**٢ — یاد باد آنکه چو چشمت به عتابم می کشت**
**معجزِ عیسویت در لبِ شکّرخا بود**

یادیان بەخێر ئەو رۆژانەی کە چاوانت بە عیتاب دەیکوشتم و موعجیزەی عیسایییش لە لێوی شیرینتدا بوو.

بە عتابم میکشت: بە عیتاب دەیکوشتم. معجز: موعجیزە.

عیسوی: عیسایی، موعجیزەی حەزرەتی عیسای مەریەمە ـ د.خ ــ کە مردووی زیندوو دەکردەوە.

شکرخا: شەکر کرمێن مەبەست (شیرین)ە.

لێرەدا غەزەلەکە زیاتر بە ئاقاری عیرفانیدا دەچێت و باس لە چاو و لێوی مەعشوقی حەقە چاوانی یار و ناز و عیتابی چاوانی یار کە شهودی جەلال و جەمالی حەقە دەبێتە مایەی بێ ئارام کردنی عارفان و عاشقان، ئەم بێئارامییە عاشقان دەکوژێت بە هیچ شتێ ئۆقرە ناگرێ جگە لە فەیزی رەحمانی کە لە لێوی مەعشوقەوە دەردەچێت، هەر بۆیە لێو گیانبەخش و زیندووکەرەوەیە.

خواجە ئەم یارییە عاشقانەیە لەگەڵ چاوی قاتڵ و لێوی شیفابەخشی یاردا دەکات و دەڵێ: گەر ناز و عیتابی چاوت دەمانکوژێ، موعجیزەی عیسایی لێوی شیرینت زیندوومان دەکاتەوە.

هەر ئەم واتایە لە (گوڵشەنی راز) دا هاتووە:

**ز چشم او همه دلها جگر خوار**
**لب لعلش شفای جان بیمار**
**از دیك غمزه و جان دادن ما**
**از ویك و بوسه و دستان ما**

- لە چاوی دڵان بێ رامن و لێوی یاقوتینی شیفای گیانی بیمارە.
- یەك غەمزەی چاوی گیاندانی ئێمە، یەك ماچی لێوی هەستانەوەمان. {لاهوری، ج٣، ل ١٦٦٠}.

لەڕاستیدا ئەو مەعشوقێکە کە هەم برین و هەم بەرهەمە، هەم قاتڵ و هەم گیانبەخشە.

**٣ — یاد باد آنکه صبوحی زده در مجلسِ انس**

**جز من و یار نبودیم و خدا با ما بود**

یادیان بەخێر ئەو رۆژانەی کە جگە لە من و یار بەمەستی (بادەی بەیان) لە مەجلیس هاودەمی (ئونس) دا کەسی دیکە نەبوو خوداش لەگەڵ ئێمە بوو.

صبوحی زده: مەستی بادەی بەیان.   خودا باما بود: خوا لەگەڵمان بوو، خوا پشتمان بوو.

یار سیفاتی جوانی حەق و خواش زاتی حەقە کە لە گشت شوێنێکدا هەیە، خواجە یادی ئەو رۆژانە دەکاتەوە کە تەنیا و تەنیا خۆی و مەعشوق / یار و لە مەجلیس و کۆڕی هاودەمیدا بوون و لەکاتێکدا کە حاڵی مەستی بادەی بەیانی و ماوەدا بوون نەبووە، یاخود خودا پشتگیر و لایەنگریان بووە — لایەنگری عاشق و عارفان.

**٤- یاد با آنکه رخت شمعِ طرب می افروخت**

**وین دلِ سوخته پروانەی ناپروا بود**

یادیان بەخێر ئەو رۆژانەی رووت مۆمی شادی دادەگیرساند و ئەم دڵە سووتاوەش پەروانەی بێ باك بوو.

رخت: رووت.   میافروخت: دادەگیرسا، هەڵدەگیرسا.

ناپروا: بێ پەروا، بێ باك.

رووی یار هەمیشە مایەی شەوق و شور و بێ ئارامی دڵی سووتاوی عاشقان بووە و بە جیلوەی جەمالی مەعشوق دڵانی بێ ئارام خۆیان بە گڕ و بریسکی ئەو جیلوەیەدا ئەدەن، خواجە یادی ئەو رۆژانە دەکاتەوە کە رووی یار مۆمی بەزم و تەربی عاشقانەی دادەگیرساند و دەبووە مایەی گەرم بوونی کۆڕی عاشقان و بەم گەرم بوونەشی ئیدی دڵی سووتاوی عاشقان بێ باك لە سووتان پەروانە ئاسا بەدەم گڕی عەشقەوە دەچوو.

**٥ — یاد باد آنکه در آن بزمگهِ خلق و ادب**

**آنکه او خندەی مستانه زدی صهبا بود**

یادیان بەخێر ئەو رۆژانەی کە لەو بەزمگەی ئەخلاق و ئەدەبەدا، ئەوی کە خەندەی مەستانەی دەکرد شەراب بوو.

بزمگه: بەزمگا، شادی گا، شوێنی بەزم و شادی.

خلق: بەئەدەبی، ئەخلاق.

خندەی مستانه: خەندەی بزێوانە، خەندەی گوستاخ و بێ شەرمانە.



یادیان بەخێر ئەو رۆژانەی کە هەموان لە زەماوەندگە و کۆڕی شادیدا بە ئەدەب و ئەخلاقەوە دانیشتبوون و تەنیا کەسێ (لێرەدا خواجە بۆ شەڕاب (ئەو)ی داناوە کە ئێستا تەنیا بۆ مرۆڤ بەکاردێ) کە بێ ئەدەبانە پێدەکەنێ و ئەدەبی دەشکاند تەنیا شەڕاب بوو.

واتە: لە حزوری یەکتایی حەقدا بە ئەدەبەوە وەستا بوون تەنیا عەشق بوو کە خەندەی مەستانەی لەسەر لێو بوو.

**٦ — یاد باد آنکه چو یاقوتِ قدح خنده زدی**

**در میانِ و لعل تو حکایتها بود**

یادیان بەخێر ئەو رۆژانەی کە (مەی) یاقوتی پێك بزە دەیگرت لەنێوان من و لێوی یاقوتینی تۆدا بەسەرهاتی زۆر هەبوو.

چو: کاتێ، کە.

یاقوت قدح: یاقوتی پێك، شەرابی سووری یاقوتینی نێوپێك.

خنده زدی: بزە دەیگرت، خەندەی دەکرد.

یادیان بەخێر ئەو رۆژانەی کە دوای ئەوەی مەی/ شەڕابی عەشق و خۆشەویستی مەعشوق پێدەکەنی و خەندە دەیگرت، ئیدی من لەگەڵ لێوی شیرینی تۆدا دەکەوتمە گێڕانەوەی بەسەرهاتی عەشق و دونیایەك بەسەرهات لە نێوان من و لێوی تۆدا هەبوو.

**٧ — یاد باد آنکه مه من چو کله بربستی**

**در رکابش مه نو پیك جهان پیما بود**

یادیان بەخێر ئەو رۆژانەی کە کاتێ یارم کڵاوی لەسەردەنا (بۆجیلوەکردن) مانگی تازە لەڕێکابیدا قاسیدی جیهانگەرد بوو.

مە: مانگ.   کله: کڵاو.   بربستی: لەسەر دەنا.

رکاب: ئەو شوێنەی کە بە زینەوەیە و سوار لەکاتی سواربوونی ئەسپدا پێدەخاتە ناوی (بەکوردی: رکێف، ئاوزەنگی).

نو: نوێ، تازە، یەکشەوە.   پیك: قاسید، نامەبەر (کەبە پێ دەڕوا).

جهان پیما: جیهانگەرد، دونیاگەڕ.

خواجە لە جوانی و جەماڵی مەعشوق ئەدوێت و دەڵێ: یادیان بەخێر ئەو رۆژانەی (رۆژانی عەشق) کە کاتێ یارم کڵاوی لەسەردەنا نیازی دەرخستنی جوانی و جەماڵی هەبوو، هێندە جوان بوو کە مانگی تازەی یەکشەوە لەژێر پێیدا قاسیدێکی جیهانگەڕ بوو.

لە هەندێ لە نوسخەکاندا میسراعی یەکەم بەم شێوەیەیە:

**یاد باد آنکه نگارم چو کمر بربستی**

واتە یادیان بەخێر ئەو ڕۆژانەی کە کاتێ یارم کەمەربەند و پشتوێنی سەفەری دەبەست.

**٨ — یاد باد آنکه خرابات نشین بودم و مست**

**و آنچه در مسجدم امروز کم است آنجا بود**

یادیان بەخێر ئەو ڕۆژانەی کە مەیخانەنشین و مەست بووم و ئەوەی ئەمڕۆ لە مزگەوتدا لێی بێ بەشم لەوێ هەمبووە.

آنچە: ئەوشتەی کە. کم است: لێم کەمە، لێی بێ بەشم. آنجا: لەوێ.

وەك گوتمان خواجە یادی ڕۆژانی عەشق و مەیخانەی عەشق (مەقامی واحدیەت) دەکاتەوە لەوێ شتێکی هەبووە کە ئەکرێ ئامادەیی ڕۆح بێت لە حزوری حەقدا و لەپلە و پایەی واحدیەتدا و دوور لە جەستەی عاشق و مەعشوق لە ژوانی بەردەوامدان، بەڵام ئەمڕۆ لە مزگەوت و جەستەدا لەو شتە بێ بەشە، بۆیە دەڵێ: یادیان بەخێر ئەو ڕۆژانەی کە لە مەیخانە و خەراباتی عەشقدا بوین و مەستی بادەی ئەزەلی بووین و ئەوەی کە لێرە لە دونیای جەستەدا نیمانە لەوێ هەمانبوو.

**٩ — یاد باد آنکه به اصلاحِ شما می شد راست**

**نظم هر گوهرِ ناسفته که حافظ را بود**

یادیان بەخێر ئەو ڕۆژانەی کە شیعری وەك مرواری ڕێکەنەکراوە (کون نەکراوە) ی حافظ بە چاککردنەوە تۆ (ئەی یار) ڕێك دەکرا.

اصلاح: چاککردن. ناسفته: کون نەکراو.

گوهر ناسفته: مەبەست لە شیعرەکانی خۆیەتی کە وەك مروارین، بەڵام هێشتا بێ عەیب نین.

خواجە یادی ئەوڕۆژانە دەکاتەوە کە شیعرەکان بە ڕێنمایی و ڕەحمەتی مەعشوقی حەق دەگەنە لوتکەی جوانی. لێرەدا شیعرەکانی خۆی بەمرواری گرانبەها دەزانێ، بەڵام لەهەمان کاتدا دانیش بەوەدادەنێ کە گەر بە چاککردنەوە و ڕەحمەتی مەعشوق نەبێ ئاوا جوان و چاك دەرناچن و وەك مرواری کون تێ نەکراو وان.



## غەزەلی دووسەد و دووەم:

**بەحری ڕەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسڵەمی موسبەغ**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**١ — تا ز میخانه و می نام و نشان خواهد بود**

**سرِ ما خاكِ رهِ پیرِ مغان خواهد بود**

تا ناونیشانی مەی و مەیخانە مابێت، سەری ئێمەش خاکی سەر ڕێی پیری موغان دەبێت.

(خواهد بود: دەبێت لە داهاتوو دا) لە زمانی فارسیدا ڕانەبردوو بۆ ڕانەبردووی گشتی و داهاتوو، دابەشدەکرێت و پێکهاتەی داهاتوو بریتییە لە [ خواه (ڕەگی چاوگی خواستن) + جێناوە کەسییە لکاوەکان + قەدی ئەو کارەی کە گەردان دەکرێت ].

بۆ نموونە (رفتن) دەبێتە: خواهد رفت (لە داهاتوودا دەڕوات).

لە زمانی کوردی —زار ستاندەر — دا داهاتوو ڕێژەی تایبەتی نییە و بە ئاوەڵکاری کات دیاریدەکرێت.

خواجە لەم بەیتەدا لە تەواوی غەزەلەکەدا پەیمانی عەشقی حەقیقی نوێ دەکاتەوە و لەبەردەوامی مەسەلەکە لەو ڕازە عیرفانی و ئیلاهییەکان دەدوێت ئامادەیە تا دوایین ساتەکانی ژیانی و تەنانەت تا دواڕۆژیش لەسەر ئەم پەیمانە و وەفایە بمێنێتەوە، لەهەر بەشێکدا بە جۆرێك و لە بۆتەیەکی جوانی شیعری حافظدا ئەم واتایە دەخاتەڕوو.

لێرەدا دەڵێ: تا ئەوکاتەی کە مەیخانەی عەشق ناونیشانی مەیی خۆشەویستی و موحیبەتی عیرفانی هەیە.

**٢ — حلقەی پیرِ مغان از ازلم در گوش است**

**بر همانیم که بودیم و همان خواهد بود**

لە ئەزەلەوە ئەڵقەی پیری موغانم لەگوێ دایە، لەسەر ئەوەین کە بووین هەرواش دەمێنینەوە.

حلقه: ئەڵقە.

(ئەڵقە لە گوێدا بوون) لەوەوە وەرگیراوە کە جاران بەندەکان ئەڵقەیان لە گوێ دەکرا تابناسرێنەوە کە ئازاد نین، لێرەدا هەر لە ئەزەلەوە بەندە و غوڵامی مورشیدی کامڵم (پیری موغان) ئەمە قاعیدەی سروشتی ئێمە بووە و هەرواش دەمێنێتەوە هەر بە بەندە و ئەڵقە لە گوێی ئەو دەمێنێتەوە.

**٣ – بر سرِ تربتِ ما چون گذری همّت خواه**

**که زیارتگهِ رندانِ جهان خواهد بود**

کاتێ بەسەر گۆڕی ئێمەدا تێپەڕیت داوای هیمەت بکە، چونکە دەبێتە زیارەتگای ڕەندانی جیهان.

تربت: گۆڕ، ئارامگا.　　گذری: گوزەر بکەی، تێپەڕیت.　　همّت: هیمەت، ئیرادە.

زیارتگە: زیرەتگا.

بەڕاستی ئەکرێ ئەم بەیتە بەیەکێ لە موعجیزەکانی حافظ بزانین و بیکەینە بەڵگە بۆ (لسان الغیب) بوونی دیوانەکەی، چونکە لەم بەیتەدا خواجە لە داهاتوویەکی دوور ئەدوێت، داهاتوویەك کە گۆڕەکەی ئەبێتە زیارەتگای عاشقان و ڕەندانی دونیا – هەر وەك ئەمشەو لە (٢٠)ی میهردا کە ساڵڕۆژی ئەو زاتەیە گۆڕەکەی زیارەتگای ڕەندان بوو، بەردەوامیش وایە – (١١ / ١٠ / ٢٠٠٤)، لێرەدا خواجە بە هاوسەردەمانی ئەوانەی کە هێشتا پەیان بە گەورەیی و پلەی ڕاستەقینەی ئەو نەبردووە دەڵێ: ئەگەر مردم و ڕێت کەوتە سەرگۆڕەکەم داوای ئیرادە و هیمەت بکە، چونکە ئەم گۆڕە (یا ئەم زاتەی نێو ئەم گۆڕە) هێندە گەورەیە کە لە داهاتوودا گۆڕەکەی ئەبێتە زیارەتگای عاشقان و ڕەندانی جیهان. (لەڕاستیدا حافظ و گۆڕی ئەو ئێستا زیارەتگای ڕەندانی جیهانن).

**٤ – برو ای زاهدِ خودبین که ز چشم من و تو**

**رازِ این پرده نهانست و نهان خواهد بود**

بڕۆ ئەی زاهیدی خۆپەرست، چونکە ڕازی ئەم پەردەیە لە چاوی من و تۆ شاراوەیە و بە پەنهانیش دەمێنێتەوە.

خودبین: خۆبین، خۆپەرست، خۆبین (بەواتای روکاربین).

ڕازی پەردە، نهێنی و ئەسراری ئیلاهییە، ئەو ڕازانەی کە زاهیدی خۆپەرست تەنیا بانگەشەی زانینیان دەکات، بۆیە خواجە پێی دەڵێ: ئەی زاهیدی خۆپەرست تۆ کە لە خۆپەرستیدا تەنیا خۆت دەبینی و ئاگات لە کەسانی دەیکە نییە، تا بگات بە ئەسراری ئیلاهی، دڵنیابە کە ڕازی نێو پەردەی غەیب تەنانەت لە من – کە ئەهلی ڕازم لە تۆش شاراوەیە و هەتاهەتایە هەرواش دەمێنێتەوە.

**٥ – ترکِ عاشق کُشِ من، مست برون رفت امروز**

**تا دگر خونِ که از دیده روان خواهد بود**



تورکی عاشق کوژی من ئەمڕۆ بە مەبەست چوویە دەرەوە، تابزانین چ خوێنێکی دی لە چاوان دێتە خوارێ.

ترك: تورك، یاری جوانی دولبەر، کە بە تورك وەسفدەکران.

عاشق کش: عاشق کوژ، بێ ڕەحم، ئارامی هەڵگری دڵی عاشقان.

برون رفت: ڕۆیشتە دەرەوە، چووە دەرەوە.　　تا: تابزانین، بابزانین.

روان خواهد بود: دێتە خوارەوە.

خواجە دەزانێ کە یاری جوانی ئارامی ڕفێنی دڵان لەماڵ بچێتە دەرەوە کەسێك یا چەندەها کەس عاشقی خۆی دەکات و لەبێ ئارامیدا فرمێسك لەچاویان دەبارێ و دەبێتە خوێن. دەڵێ: ئەمڕۆ یار بەمەستی و جوانی لەڕادەبەدەرەوە جیلوەی کرد و خۆی دەرخست ئاخۆ چەندەها کەس عاشق دەبن و لە بێ ئارمیدا فرمێسکی خوێنین لە چاوان دەبارێنن.

یار لەم بەیتەدا مەعشوقی حەقە و لە (فەرموودەی مثنوی)دا هاتووە کە (هەرکەس عاشقم بێت عاشقی دەبم عاشقی هەر کەسیش بووم دەیکوژم – من عشقنی فعشقتە و من عشقتە فقتلە){لاهوری، ج ٢، ل ٩٠٥}. بێگومان تورك و عاشق کوژ و مەست و چوونەدەرەوە لە مانا عیرفانییەکاندا بەکار هاتووە.

**٦ – چشمم آن شب که به شوق تو نهد سر به لَحَد**

**تا دم صبحِ قیامت نگران خواهد بود**

چاوانم ئەو شەوەی کە بە شەوقی تۆوە سەری ئەدا لە بەردی ئەلحەد، تا ساتی بەیانی قیامەت سەیری جوانی تۆ ئەکات و چاوەڕوانە.

آن شب: ئەوشەوەی.　　نهد: دەخاتە.　　حد: گۆڕ.

نهد سر بەحد: سەر دەخاتە نێو گۆڕەوە –واتە – دەچێتە ژێر خاك لە کوردیدا ئیدیەمێکسی هاوشێوە هەیە کە (سەرم ئەدا لە بەردی ئەلحەد)ە واتە دەمرم.

نگران خواهد بود: لە حاڵەتی سەیر کردندا دەبێت. بەردەوام سەیر دەکات و چاوەڕێیە.

لە هەندێ نوسخەدا لەبری (نهد) – (نهم) هاتووە، واتە لەبری ئەوەی سەری چاوانم بدات لە بەردی ئەلحەد، سەری خۆم بدات لە بەردی ئەلحەد، بەهەر حاڵ لە ڕووی واتاوە هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە، بەڵام لە ڕووی جوانی و واتایی و زمانەوە (نهد) جوانترە هەر چەندە ڕەخنەی ئەو گیراوە کە چاو نامرێت خودی مرۆڤ دەمرێت، بەڵام وا پێدەچێ خواجە ڕۆحی بە چاوانیدا بێت ئەو بەیاری حەق دەڵێ: لەو شەوەوە کە دەمرم و چاوانم بەشەوقی دیداری تۆوە

لێك دەنێم تا ڕۆژی قیامەت و بەچاوە پڕ لە شەوقی دیدارەوە سەیری جەمالی تۆ دەکەم و چاوەڕوانی لیقای یەکجاری و حەقیقی تۆ دەکەم.

ئەمە لەو سەرچاوەوە هەڵدەقوڵێت، کە کاتێ مرۆڤی موسڵمان دەمرێت گۆڕەکەی دەبێتە باخچەیەك لە باخچەکانی قیامەت و تا ڕۆژی قیامەت تیایدا دەژی، خواجەش دەڵێ: لەو بەهەشتەمدا سەیری جەمالت ئەکەم.

**٧ — بختِ حافظ گر ازین گونه مدد خواهد کرد**

**زلف معشوقه به دست دگران خواهد بود**

ئەگەر بەختی حافظ بەم شێوەیە یارمەتی بدات، زوڵفی مەعشوق بەدەستی خەڵکی ترەوە دەبێت.

ازین گونه: لەم شێوەیە. مدد خواهد کرد: یارمەتی دەدات (لە داهاتوودا).

خواجە گلەیی لە بەختی خۆی دەکات کە هیچ جۆرە یارمەتییەکی نادات ئەسڵەن دۆستی وات هەبێت دوژمنت ناوێ: گەر بەخت بەم شێوە یارمەتیم بدات — کەنایدات — زوڵفی یار و کەشف و نزیکی لە حەقا ئەبێتە بەشی خەڵکی تر و منی لێ بێ بەش دەبم.



## غەزەلی دووسەد و سێیەم:

**بەحری ڕەمەلی هەشتی مەقسور**
**(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان)**

**١ — پیش ازینَت بیش ازین اندیشەی عشاق بود**

**مهرورزیِّ تو با ما شهرەی آفاق بود**

بەرلەمە لەمە زیاتر لە بیری عاشقاندا بوویت و عەشقی تۆ لەگەڵ ئێمەدا لە جیهاندا بەناوبانگ بوو.

پیش ازین: بەرلەمە، لەمەوبەر. بیش ازین / لەمە زیاتر.

اندیشه: بیر، لەبیری. مهروزی: عاشق. شهره: ناوبانگ.

آفاق: جیهان (وشەیەکی قورئانییە لەبەرامبەر (انفس) دا هاتووە بەواتای جیهانی دەرەوەی مرۆڤ).

بەیتەکانی سەرەتای ئەم غەزەلە لە شادی سەرەتای مرۆڤ — بەر لەوەی بێتە نێو قەفەسی جەستە و مەینەت — ئەدوێت، بە مەعشوق دەڵێ: بەر لەوەی ژیان و جەستە دروستبکەیت (ئەی یاری حەق) زیاتر لەبیری عاشقدا بوویت و زیاتر لێیان نزیك بوویت و ئێمە لە حزوری تۆدا شاد بووین، تەنانەت عەشق و موحیبەتی تۆ بۆ ئێمە لە جیهاندا دەنگی دابووەوە.

**٢ — یادباد آن صحبتِ شبها که با نوشین لبان**

**بحثِ سرِّ عشق و ذکرِ حلقەی عشّاق بود**

یادیان بەخێر هاودەمی ئەو شەوانەی کە لەگەڵ شیرین لێوان، باسی نهێنی عەشق و ئەڵقەی عاشقانمان دەکرد.

یاد باد: یادیان بەخێر. نوشین لبان: شیرین لێوان، شەکر لێوان.

حلقه: ئەڵقە، کۆڕ.

خواجە یادی سەردەمی زێڕینی مرۆڤ دەکاتەوە ئەو کاتەی کە هێشتا نەخرابووە نێو زیندانی جەستە و زەوییەوە دەڵێ: یادیان بەخێر ئەو شەوانەی تەمەنمان کە لەگەڵ مەلەکوتی عەشقدا کە قسەیان وەك شەکرە لێو شیرینن و باسی نهێنی عەشقی ئیلاهی و کۆڕ و مەجلیسی عاشقانمان دەکرد.

**٣ – پیش از این کین سقفِ سبز و طاق مینا برکشند**

**منظرِ چشم مرا ابرویِ جانان طاق بود**

بەر لەوەی کە ئەم سەقفە سەوز و تاقەمینایییە دروستکەن، تەنیا تاقی برۆی یار تابلۆی سەیرکردنی چاوانی من بوو.

سقف سبز و طاق مینایی: مەبەست لە ئاسمانە. برکشند: دەربهێنن، برِازێننەوە، دروستبکەن.

طاق: تەنیا، بێ وێنە.

خواجە لەم بەیتەدا عاشق بوونی خۆی بۆ حەق دەباتەوە بۆ سەرەتای بەر لە دروستکردنی جیهانی ماددە و ئاسمانەکان ئەو دەڵێ: چاوانی منی مرۆڤ لە جیهانی ئەرواحدا بەر لە دروستکردنی ئاسمانەکان روو لە برۆی یار بووە و عاشقی بووە.

**٤ – از دم صبحِ ازل تـــا آخرِ شام ابد**

**دوستیّ و مهر بر یک عهد و یک میثاق بود**

لە ساتی بەیانی ئەزەلەوە تا کۆتایی شەوی (ئەبەد)ەوە، دۆستی و عەشق لەسەریەك عەهد و پەیمان بووە.

شام: شەو.

خواجە ئەزەلی بە بەیانی و (ئەبەد)یش بە شەو داوەتە قەڵەم و دەڵێ: لە سەرەتای بەیانی ئەزەلەوە تا کۆتایی شەوی ئەبەد، واتە لە ئەزەلەوە تا ئەبەد، خۆشەویستی و دۆستی لەسەر یەك عەهد و پەیمان بووە و دەمێنێتەوە کە ئەویش پەیمانی عەشقی ئیلاهییە و لەسەر وەعد و پەیمانی (بلا)ی (الست بربکم)ە کە ئەمە نهێنی و سرِی وجودە.

**٥ – سایەی معشوق اگر افتاد بر عاشق چە شد**

**ما بە او محتاج بودیم، او بە ما مشتاق بود**

گەر سێبەری مەعشوق کەوتە سەر عاشق سەیر نییە (هیچ نابێ)، چونکە ئێمە موحتاجی ئەو بووین و ئەویش تامەزرۆی ئێمە بوو.

چەشد: چی ئەبێ، هیچ سەیر نییە.

سێبەر کەوتنە سەر کەسێك، لوتف و رەحم پێکردنیەیی، واتە گەر ئێمەی عاشق کەوتینە بەرسێبەری لوتف و میهری مەعشوق و ئەو لوتفی لەگەڵ کردین هیچ سەرسورهێنەر نییە، چونکە ئێمە موحتاجی لوتفی ئەوین و ئەو تامەزرۆی ئەم لوتف و میهرەیە لەگەڵ ئێمەدا.



مەعشوق لەم بەیتەدا زاتی حەقە کە موحتاجی مرۆڤە کە رووکاری جیلوەی ئەسماء و سیفاتی حەقە، لە شەرحە عیرفانییەکانی ئەم بەیتەدا هاتووەکە مرۆڤ و خودا هەردووکیان پێویستیان بە یەکتری هەیە، چونکە مرۆڤ پێویستی بە خوا هەیە کە لوتف و کەرەمی لەگەڵ بکات خواش پێویستی بە مەزهەر و روکارێك هەبوو تا جیلوەی ئەسماء و سیفاتی تێدا بکات بۆ ناساندن، بەڵام لاهوری پێیوایە خواجە لەبەر ئەدەب ئەم (پێویستی)یەی کردووە بە تامەزرۆیی، چونکە لەگەڵ زاتی حەقدا ناگونجێ. لەراستیدا وشەی پێویستی فەلسەفییانە و لە ئەدەبی عارفانە دوورە. بەهەر حاڵ ئەم بەیتە (وەك محمدی دارابی کە شەرحکەری سەرەتایی حافظ دەڵێ: { د. خرمشاهی لە حافظ نامەدا نەقلی کردووە } ئاماژەیە بە فەرموودەی بەناوبانگی (کنت مخفیا ناصببت ان اعرف مخلقت الحق لکیِ اعرف) بە چاوپۆشی لە ئێشکالە فەلسەفییەکانی ئەم فەرموودەیە – هەروەك حافظیش وایکردووە – خۆشەویستی و تامەزرۆیی خوا بۆ مرۆڤ دەخاتەروو. بۆیە سەیر نییە کە رەحم و لوتفی لەگەڵ بکات.

**٦ – حسنِ مهرویان مجلس گرچە دل می بُرد و دین**

**بحثِ ما در لطفِ طبع و خوبی اخلاق بود**

گەرچی جوانی جوانانی مەجلیس دڵ و دین دەبات، قسەی لەسەر سروشت رێکی و خۆش ئەخلاقی بووە.

مهرویان: روومانگان، جوانان. لطف طبع: خۆش سروشتی. خوبی: چاکی.

گەر چی جوانانی مەجلیس هێندە جوان بوون کە دڵ و دینیان بە غارەت و تاڵان دەبرد، بەڵام ئێمە زیاتر باسمان لە خودی زاتی ئەوان بوو کە سروشت پاك و خۆش ئەخلاق بوون، واتە: لەگەڵ جوانی جیلوەی جەمالی حەقدا ئێمە بیرمان لای خودی حەق بوو.

**٧ – بر درِ شاهم گدایی نکتەای در کار کرد**

**گفت بر هر خوان کە بنشینم خدا رزّاق بود**

لەبەر دەرگای پادشادا رۆژێ گەدایەك نوکتەیەکی بۆ باسکردم و گوتی: لەسەرهەر سفرەیەك دانیشتووم خوا رەزاق بووە.

بردر: لەبەر دەرگا. درکار کرد: گێرِانەوە، هێنایەناوەوە، باسیکرد.

خوان: سفرە، خوان.

لەراستیدا ئەم بەیتە بنەمایەکی گرنگی مەسەلەی رزق و رۆزییە کە خوا رۆزیدەری ئەسڵییە و تەواوی مەخلوقات ناتوانن رۆزیدەر یا رۆزیگرە وەبن. ئەو دەڵێ رۆژێ کەلەبەر دەرگای

پادشایەکدا بووم گەدایەك نوکتەیەکی زۆر جوانی گوت کە کاری تێکردم ئەویش ئەوە بـوو کـە گوتی: لەسەر هەر سفرەیەك دانیشتی دڵنیابە کە خوا رۆزیدەری حەقیقییە نەوەك خاوەن سفرە.

**٨ — رشتەی تسبیح اگر بگسست معـذورم بِدار**

**دستم اندر ساعد ساقیِّ سیمین ساق بود**

گەر بەنی تەسبیحەکەم پچڕا لێم مەگرە، چونکە دەستم لە قۆڵی ساقی سیمین ئەندامدا بوو.

رشتە: پەت، بەن. بگسست: پچڕا.

معـذورم بدار: لێم مەگرە. اندر: لەناوی، لە. ساعد: قوڵ.

سیمین: سپی، زیوی. ساق: قاچ.

خواجە زاهیدی روکار بین دەڵێ: گەر وازم لە تەسبیحات هێنا و لە بیێ ئاگاییدا تەسـبیحاتم پچڕاوە لێم مەگرە، چونکە لە دوای یـار و مەعـشوقی حەقـدا بـووم و خـەریکی موشـاهدەی جەمالی ئەو بووم.

**٩ — در شبِ قدر ار صبوحی کردە ام عیبم مکن**

**سرخوش آمد یار و جامی برکنارِ طاق بود**

گەر لەشەوی قەدردا شەڕابی بەیانیم نۆشیوە رەخنەم لێ مەگرە، چونکە یار بـە سەرخۆشـی هات و پێکێك لەکەناری طاقچەکەدا بوو.

صبوحی کردن: پێکی بەیانیان خوردانەوە.

عیبم مکن: رەخنەم لیێ مەگرە، عەیبەم لیێ مەگرە.

برکنار: بەسەر لێوار، کەنار.

دیسانەوە بە زاهید دەڵێ: گەر لە شەوی قەدردا — کە بەقسەی تـۆ بێـت دەبـێ بەندایـەتی وشك بکەم- بادەم نۆشیوە و سەرخۆشی عەشقی یاری حەق بووم، رەخنەم لـێ مـەگرە، چـونکە یارم بەمەستی جیلوەی جەمال کرد و بادە و شەرابیش ئامادە بوو، وەك ئەوەی کەلەسەر لێواری تاقچەکە دانرابێ تا من بچمە نێو دونیای عەشقەوە و هەمووشتێ لەبیربوو.

**١٠ — شعرِ حافظ در زمانِ آدم اندر باغِ خلد**

**دفترِ نسرین و گل را زینتِ اوراق بود**

لەو سەردەمەی کە ئادەم لە باغی بەهەشتدا بووە شـیعری حـافظ بـۆ جـوانی دەڕازانـدەوە بەسەر پەڕە گوڵ و نەسرینی نووسرا بوو.

خلد: نەمری. باغ خلد: باخی نەمری، بەهەشت.

زینت: رازێنەرەوە.



خواجە شانازی بە شیعرەکانییەوە دەکات و بەهی سەردەمی رۆحیان دەزانێ، ئەو کاتەی کە هێشتا ئادەم نەهاتبووە سەر زەوی و هێشتا لەبەهەشتدا بوو، دەڵێ: لەسـەردەمی رۆحـدا کـە ئادەم لەبەهەشتدا بوو شیعرەکانی حافظ مایەی جوانی گوڵ و نەسرین بوون.

## غەزەلی دوو سەد و چوارەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسڵەمی موسبەغ**
**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**١ — یاد باد آنکه سرِکویِ توأم منزل بود**
**دیده را روشنی از خاکِ دَرَت حاصل بود**

یادیان بەخێر ئەو رۆژانەی کە سەر کوچەی تۆ مەنزڵ و هەوارگەم بوو، رووناکی دیدەم لە خاکی بەردەرگای تۆوە بوو.

منزل: هەوارگە، مەنزڵ. حاصل بود: حاڵ دەبوو، بەدەستدەهات.

حافظ ناسان پێیان وایەکە ئەم غەزەلە بۆ شا شێخ ئەبو اسحاب اینجو (٧٢١ — ٧٥٧) نووسراوە {حافظ نامە، ج ١، ل ٧٥٤ ـ شرحی هروی، ج ٢، ل ٧٨٣، صدای سخن عشق انوری، ل ٢٦٠، گزیدەی غزلهای حافظ رحیم ذوالنور، ل ١٦٥} کە دەتوانین بڵێین: ئەم رایانە لە کتێبی (تاریخ عصر حافظ)ی د. غنی وەرگیراون.

بەهەرحاڵ خواجە زۆر بە قووڵی مەدح و ستایشی شێخ ئەبو ئیسحاق شا دەکات بەڵام ئەمانە بەڵگەی ئەوەنین کە بگوترێ تەواوی غەزەلەکە لەو دەدوێت و مۆرکێکی مێژوویی تەواو بە غەزەلەکە بدەین، چونکە تەنیا لە بەیتی هەشتەمدا بە ئاشکرا لێی دواوە.

لەم بەیتەدا خواجە — وەك غەزەلەکانی پێشوو باس لە مەقامی واحدییەت یەکبوویی — دەکات ئەو سەردەمی کە هێشتا لە مەعشوق دوور نەکوتبووەوە و دەڵێ. یادیان بەخێر ئەو رۆژانەی کە نزیك بووین لێت و هەوارگە و مەنزڵمان سەرکۆڵان و کووچەی تۆ بوو. رووناکی چاوانیشمان لەو گەرد و غوبارەی خاکی بەردەرگاتەوە وەردەگرت — کە سورمەئاسا لە چاومان دەکرد-.

گەر ئەم بەیتە بۆ شێخ ئەبو ئیسحاق شا بێت زیادەڕۆییەکی زۆری تێدا کراوە.

**٢ — راست چون سوسن و گل از اثرِ صحبتِ پاك**
**بر زبان بود مرا هر چه ترا در دل بود**

رێك وەك سەوسەن و گوڵەباخ بە هۆی کاریگەری هاوڕێیەتی پاکەوە، هەرچی لە دڵتدا بوو بەسەر زمانی منەوە بوو.

راست: رێك، دروست. از اثر: بەهۆی کاریگەری.



صحبت پاك: هاوڕێیەتی و هاودەمی پاك.

واتە لەو مەقامی — واحدییەتدا — هێندە لەیەك نزیك بووین و بەهۆی کاریگەری هاودەمی هاوڕێیەتی پاکی دوور لە ریا و غەشەوە هێندە لە دڵی یەکتر ئاگادار بووین کە من وەك سەوسەونی دە زمان هەرچی بە دڵی تۆدا ختوورە دەکرد و لە دڵتدا بوو — کە وەك گوڵ بوویت — بەسەر زمانی منەوە بوو، ئەوەی لە دڵی تۆدا بووە دەمگوت یا ئەوەی من دەمگوت لە دڵی تۆشدا بوو.

**٣ — دل چو از پیرِ خرد نقلِ معانی می کرد**
**عشق می گفت به شرح آنچه بر او مشکل بود**

کاتێ دڵ لە پیری عەقڵەوە حەقیقەت و مەعنای نەقڵ دەکرد، ئەو حەقیقەتەی مەعنای گران و نارەحەت بوایە عەشق بۆی شەرحدەکرد.

خرد: عەقڵ. نقل می کرد: نقڵ دەکرد. معانی: حەقیقەت و مەعنا.
می گفت به شرح: شەرح دەکرد. مشکل: گران، سەخت، نارەحەت.

وەك هەمیشە حافظ عەشق لە عەقڵ بە حەقیقەت زان تر و قوولتر ئەداتە قەڵەم و دەڵێ: کاتێ کە دڵ لە پیر و مورشیدی عەقڵەوە حەقیقەت و راستییەکانی نقڵ دەکرد و دەگواستەوە، هەرچی حەقیقەتێك بۆ عەقڵ دژوار و سەخت بوایە و نەیزانییایە عەشق بۆی شەرح دەکرد.

لاهوری لە شەرحەکەیدا لەبری (خرد) (موغان) و لەبری (او) (مرا) ی نووسیوە واتە: کاتێ دڵ ئەو حەقیقەتانەی لە پیری موغانەوە نقڵ دەکرد، هرچی بۆ من گران بوایە عەشق بۆی شەرح دەکردم.

**٤ — آه از آن جور و تطاول که درین دامگه است**
**آه از آن ناز و تنعم که در آن محفل بود**

ئاهـ لە دەست ئەم زوڵم و ستەمەی کە لەم داوگەیەدایە و ئاه لە دەست ئەو نازو خۆشییە و لە کۆڕکەدایە.

جور و تطاول: زوڵم و ستەم. دامگە: داوگە، مەبەست لە داوگەی دونیایە.
ناز و تنعم: خۆشی و ناز.

خواجە بەراوردی دادگەی دونیا ئەکات بە مەقامی واحدییەت دەکات کە دونیا پڕە لە زوڵم و ستەم و کۆڕی عاشقانیش لەوێ پڕ بوو لە نازی مەعشوق و خۆشی.

لە ساغکردنەوەی میسراعی دووەمی ئەم بەیتەدا جیاوازییەکی زۆر لە نێوان نوسخەکاندا دەبینرێ بۆ نموونە لە بری (واه) (وای وآه) هاتووە و لەبری (ناز و تنعم) (سوز و نیازی) یا (ناز و تجمل) هاتووە.

**٥ — دردلم بود که بی دوست نباشم هرگز**

**چه توان کرد که سعیِ من و دل باطل بود**

لە دڵمدا بوو کە هەرگیز بێ دۆست نەبم، چی ئەکرێ، هەوڵی من و دڵ بێ هوودە بوو.

دردلم بود: لە دڵما بوو، نیاز وابوو. نباشم، نەبم. چه توان کرد: ئەتوانرێ چی بکرێت.

سعی: هەوڵ. باطل بود: بێ هوودە بوو، بێ ئەنجام بوو.

خواجە لێرەدا دەردەدڵی خۆی ئەکات و ئەڵێ: من نیازم وابوو — لە دڵی خۆمدا — کە هەرگیز بێ یار و دۆست نەبم، بەڵام لەگەڵ قەدەر و ویستی ئەزەلیدا ئەتوانرێ چی بکرێت کە هەوڵی من و دڵی من بێ هوودە بوو، سەرئەنجام بێ یار مامەوە.

**٦ — دوش بر یادِ حریفان به خرابات شدم**

**خُم میْ دیدم خون در دل و سر در گـِل بود**

دوێنێ شەو بەیادی هاوپێکانەوە ڕۆیشتم بۆ مەیخانە خۆمم دەبینی کە خوێن لە دڵ و سەری لەگڵدا بوو.

بر یاد: بەیادی. به خرابات شدم: ڕۆیشتم بۆ مەیخانە. خم: کۆپەڵەی شەراب.

خون در دل: خوێن لە دڵ، ئەم ئیدیەمە بەواتای غەمگین و خەفەتبار دێت هەر چەندە لێلێشی تێدایە و ئەکرێ (خون) بە شەراب لێکدرێتەوە واتە (شەرابی لەناودا بوو).

سر در گل: سەر لە گەڵدا، واتە: سەرەونخون، سەرەوژێر، سەر بە قوڕ.

شەوی ڕابردوو خواجە بەیادی ڕۆژانی زوو، هاوپێك و حەریفانەوە چووەتە مەیخانەی عەشق، بەڵام مەیخانەی عەشق چۆڵ بووە و کەسی تێدا نەبووە تەنیا کوپەڵەی شەڕاب نەبێ کەبە دۆش داماوە و بە خەفەتبارییەوە سەری لە قوڕوگڵدا بووە (تۆز بەسەریەوە بووە).

**٧ — بس بگشتم که بپرسم سببِ دردِ فراق**

**مفتیِ عقل درین مسئله لایعقل بود**

زۆر گەڕام تا بپرسم هۆی دەردی فیراق چییە، موفتی عەقل لەم مەسەلەیدا بێ توانا و نەزان بوو.

بگشتم: گەڕام. مفتی: موفتی- ئەو کەسەی کە شتی زۆر دەزانێت و دەگاتە ئاستی فتوادان-



لایعقل: نەزان، بێ توانا.

عەقڵ گەر ڕێنمایی عەشق نەبێت هیچ شتێ لەبارەی عەشقەوە نازانێت با موفتی و شارەزاش بێت لەمەسەلەکانی عەشقدا دەستەوسانە و بێ توانایە بۆیە خواجە دەڵێ: بە عەقڵ زۆر گەڕام تاوەك هۆی دەردی فیراق لە مەقامی حضور و واحدییەت کە مەقامی ئەسڵی مرۆڤە بزانم، بەڵام عەقڵ لەم مەسەلەیدا هیچی نەزانی و دەستەوسان بوو.

**٨ — راستی خاتمِ فیروزەی بواسحاقی**

**خوش درخشید ولی دولتِ مستعجل بود**

بەڕاست ئەنگوستیلەی پیرۆزیی ئەبوئیسحاقی جوان درەوشایەوە، بەڵام دەوڵەت و سەڵتەنەتێکی بەپەلە بوو.

راستی: بەڕاست.

بو اسحاق: مەبەست لە شێخ ئەبو ئیسحاق پاشایە کە سەڵتەنەت و حکوومەتەکەی بەپەلە و کورتخایەن بوو کە لە (٧٤٤ — ٧٥٤) بوو. {هەوری، ج ٢، ل ٧٨٦ }.

خوش درخیشد: جوان درەوشایەوە. مستعجل: بەپەلە، کورت خایەن، زوو تێپەڕ.

ئەنگوستیلەی پیرۆزیی مەبەست لە حکوومەت و پاشایەتی ئەبوئیسحاقە و درەوشانەوەش سەرکەوتن و برەوسەندنیەتی، خواجە دەڵێ: بەڕاست ئەو دەوڵەتەی چاك برەوی سەند بەڵام زۆر زوو لەناوچوو تەمەنێکی کورتی هەبوو.

**٩ — دیدی آن قهقەی کبكِ خرمان حافظ**

**که ز سر پنجەی شاهینِ قضا غافل بود**

حافظ ئەو قاقای کەوی خۆشڕەفتارەت بینی، کەلەسەر پەنجەی شاهێنی قەزا بێ ئاگا بوو.

کبك خرامان: کەوی خۆشڕەوت کە لێرەدا مەبەست لە شا شێخ ئەبوئیسحاقە.

قهقه: قاقای پێکەنین مەبەست لە خۆشگوزەرانی شایە.

غافل بود: بێ ئاگا بوو.

گوتراوە کە شا شێخ ئەبوئیسحاق پادشایەکی خۆش گوزەران بووە لە کاتێکدا کە نەیارەکەی، ستەمکار یا جەنگاوەرێکی بە جەرگی وەك (ئەمیر مبارزالدین) بووە، بەڵام ئەو گوێی بەمە نەداوە بۆیە دواجار بە دەستی ئەمیر مبارزالدین دەستگیر کراو لە مەیدانی شاردا بە فەرمانی ئەو لە تۆڵەی خوێنی (ئەمیر حاجی) کەلە سەردەمی شادا و بە فەرمانی ئەو کوژرا بوو کوژرایەوە و لەلایەن کوڕە بچووکی (ئەمیر حاجی)یەوە سەری لەلاشەی جیاکردەوە. {رحیم ذوالنور به نقل از تاریخ عصر حافظ، ل ١٦٥ }.

بۆیە حافظ دەڵێ: لە کاتی خۆشگوزەرانیدا لە چـنگی شـاهینی قـەزا و قـەدەر کەچـی بـۆ ئامادە کردووە بێ ئاگا و غافڵ بوو.

خوالێخۆشبوو لاهوری لەشەرحەکەیدا بـەم چـیرۆکە کەلـە انـوار سـهیلی- دا وەریگرتـووە شەرحی (قاقای کەو) دەکات، کورتـەی چـیرۆکەکە بـەم شـێوەیەیە: جارێـك کـەوێك لـەبناری چیایەکدا دەخوێند و بازێکیش بەئاسمانەوە گوێی لە دەنگی بوو، لە قاسپەیەوە کەوەکەی خـۆش ویست  داوای لێکرد ببتە هاوڕێی پـاش ئـەوەی کەوەکـە سـەرەتا رازی نـەبوو — چـونکە دوو دوژمی دێرینەن- دواجار هەر چۆن بێت رازی بوو، بوونە هاوڕێ و پێکەوە ژیـان، پـاش ئـەوەی کەوەکە دڵنیا بوو لە هاوڕێیەتی بازەکە بێ پەروا قسەی دەکرد و رۆژێکیان لە کاتی قسەدا قاقا پێکەنی بازەکە بەم قاقایە کینەی کەوتە دڵ وەك ئەوەی کە بێ شەرمی لەگەڵ کرا بێت، دواجار بازەکە لە بیانوویەك دەگەڕێ کە کەوەکە بخوات، شەوێك بە تووڕەییەوە پێی دەڵێ: مـن لـە بـەر هەتاودا بم تۆ لە سێبەردا، کەوەکەش دەڵێ: بەم شەوە کوا سێبەر و هەتاو هەیە، بازەکە دەڵـێ: تۆ من بە درۆزن ئەزانی و پڕی دەداتێ دەیخوات.

لەم بەیتەدا مەبەست لەوەیە کە ئەو بێئاگا بوو لە چنگی تیژی بازی قەزا بۆیـە ئـاوا قاقـا پێکەنی و سەری بە هیلاك دا. { لاهوری، ج ٣، ل ١٦٥٦ — ١٦٥٧ }.



## غەزەلی دوو سەد و پێنجەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی مەحزوف**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)**

**١ — خستگان را چو طلب باشد و قوّت نَبُوَد**

**گر تو بیداد کنی شرطِ مروّت نَبُوَد**

گەر بریندارانی عەشق داوای وەسڵ بکەن و توانایان نەبێ، گەر تۆ سـتەم بکـەیت مـەرجی جوامێری نییە.

خستگان: برینداران، داماوان. قوت: توانا، دەسەڵات.

بیداد: ستەم، زوڵم. مروت: جوامێری.

خەستە و بریـنداران عاشـقانی رێگـەی تەریقـەتن، تـۆ — مورشـید-، خواجـە دەڵـێ: گـەر بریندارانی رێگەی عەشقی یار (ئەی یار) داوای وەسڵ و دیـداری ئـەو بکـەن و بیانـەوێ بـە ئـەو بگەن، بەڵام توانای ئەو مەقام و پلە بەیان نەبێ تـۆ دەسـتیان دەگریـت، چـونکە گـەر تـۆ (ئـەی مورشید) لەڕووی میهرەبانییەوە دەستیان نەگریت ئەمە مەرجی جوامێری نییە و تۆش جوامێری.

**٢ — ما جفا از تو ندیدیم و تو خود نپْسندی**

**آنچە در مـذهبِ اصحاب طریقت نَبُوَد**

ئێمە ستەممان لە تۆ نەدیوە و تۆش خـۆت ئـەوەی لـە مەزهـەبی یـارانی تەریقەتـدا نـەبێ پەسەندی ناکەیت.

نپسندنی: پەسەندی ناکەیت.

ئەهلی تەریقەت و یارانی تەریقەت زوڵم و ستەم پەسەند ناکـەن و مورشـیدیش لـە یـارانی تەریقەت و ئەهلی  دڵە، دەڵێ: ئەی مورشید ئێمە زوڵـم و سـتەممان لـە تـۆ نـەدیوە و زوڵـم و ستەمیش لە مەزهەب و شێوازی یارانی تەریقەتدا نییە تۆش (کە یارانی تەریقەتی) ئـەو شـتە قەبووڵ ناکەیت — ستەم و جەفا — کە پێچەوانەی بۆچوون و مەزهەبی ئەهلی دڵە.

**٣ — خیره آن دیده کە آبش نبرد گریەی عشق**

**تیره آن دل کە در و شمعِ مُحَبّت نَبُوَد**

ئەبڵەق بێ ئەو چاوەی کە گریانی عەشق ئاوی وشك نەکرد، تاریك بێ ئەو دڵەی کە مـۆمی خۆشەویستی تیا نەبوو.

خیرە: ئەبڵەق، کوێر (چاوێ بە هۆی رووناکی زۆرەوە هیچ نەبینێ)، سەرگەردان و بێ شەرم (هروی)، تاریك و سەرگەردان (لاهوری).

تیرە: تاریك.          درو: لەودا، تیایدا.

خواجە گریانی عەشق و مۆمی خۆشەویستی بە مایەی جوانی و چاکی چاو و دڵ دەزانێ، بۆیە چاو و دڵ لای خواجە بە بێ ئەم دوانە بۆ کوێر بوون و تاریك بوون چاکە، ئەو دەڵێ: سەرگەردان و کوێر بێت ئەو چاوەی هێندە بۆ عەشق ناگری تا فرمێسکەکانی وشك بێت و گریانی عەشق فرمێسکەکانی وشك ناکات و تاریك و نوتەك بێت ئەو دڵەش کە مۆمی خۆشەویستی تیادا ناگرێ.

**٤ — دولت از مرغِ همایون طلب و سایەی او**

**زانکه با زاغ و زغن شهپرِ دولت نَبُوَد**

داوای بەخت و ئیقباڵ لە باڵندەی هوما و سێبەری ئەو بکە، چونکە زاغ و قەلەباچکە شاپەڕی بەختیان نییە.

مرغ همایون: باڵندەی هوما، باڵندەی بەخت.          زاغ: زاغ، قەلەڕەشە.

زغن: قەلەباچکە، شکگر.          شهپر: شاپەڕ.

لەم بەیتەدا مرغ همایون درکەیە لە مورشیدی کامڵ و پاك — بەسیفەتەکانی بەیتی پێشوو و زاغ و قەلەباچکەش، دووباڵندەی سووك و بێ بەهان و خەریکی گەندەخۆرین درکەیە لە زاهید و سۆفیلکەی رواڵەتی و ریاباز، خواجە دەڵێ: تۆ — رێبواری رێگەی عەشق و تەریقەت — داوای بەخت و هیمەت لە مورشیدی کامڵ و پیاوی ئەهلی دڵ کە — و داوای بکە سێبەری ئەو بەسەر سەرتەوە بێت و هەرگیز ئەم داوایە لە زاهید و سۆفیلکە درۆزنەکان مەکە، چونکە ئەوان لەم فەیزی شاپەڕەی بەختە بێ بەشن.

یاخود لێکدانەوەیەکی کۆمەڵایەتیدا: داوای یارمەتی لە مرۆڤی گەورە و خانەدان بکە نەوەك چلکاوخۆر و سووك.

**٥ — گر مدد خواستم از پیرِ مغان عیب مکن**

**شیخِ ماگفت که در صومعه همّت نَبُوَد**

گەر داوای یارمەتیم لە پیری موغان کرد رەخنەم مەگرە، چونکە شێخی ئێمە گوتی: هیمەت لە خانەقا دا نییە.

مدد خواستم: داوای یارمەتیم کرد.          همّت: هیمەت و پیاوەتی، هاوکاری.



(صومعە) کە شوێنی پەرستشە و لای خواجە بۆ خانەقایەك بەکاردێت کە زاهید وشکە سۆفی ریابازی تێدابێت دەڵێ: گەر داوای یارمەتیم لە پیری موغان — مورشید — کرد رەخنە مەگرە، چونکە شێخی ئێمە کە هەمان پیری موغانە گوتوویەتی: هیمەت و پیاوەتی و هاوکاری لە خانەقادا نییە، ریابازانی خانەقا پیاوی هاوکاری نین . لێرەدا مانای بەیتی پێشوو زیاتر روون دەبێتەوە کە (مرغ همایون) و (پیر مغان) و (زاغ و زغن)یش ریابازانی نێو خانەقان.

**٦- چون طهارت نبود کعبه و بتخانه یکیست**

**نبود خیر در آن خانه که عصمت نَبُوَد**

کە پاکی نەبێت کەعبە و بتخانە یەکێکن، خەیر لەوماڵەدا نییە کە پاکیزەیی تێدا نەبێ.

طهارت: پاکی، خاوێنی.          عصمت: پاکیزەیی، داوێن پاکی.

پاکی پاك و خاوێنی جەستە و پاك و خاوێنی دڵ و گیانە لە غەیری حەق. عارفەکان زۆر جەخت لەسەر ئەم پاکێتی دەروونییە دەکەنەوە و لای ئەوان کەعبە و بتخانە بە بێ ئەم پاکێتییە هیچ جیاوازییەکیان نییە و هەر ماڵێکیش کە داوێنپاکی و پاکیزەیی تێدا نەبێت بەرەکەت و خەیری تێدا نییە و بێهودەییە.

**٧ — حافظا علم و ادب ورز که در مجلس خاص**

**هرکه را نیست ادب لایقِ صحبت نَبُوَد**

ئەی حافظ خەریکی زانست و ئەدەب بە، چونکە لە کۆڕی تایبەتی پاشادا هەر کەس ئەدەبی نەبێ لایقی هاودەمی و هاوڕێیەتی نییە.

ورز: خەریکی دەستهێنانی بە، هەوڵی بۆ بدە، لە چاوگی (ورزیدن)ەوە هاتووە کە بەواتای کارکردن، هەوڵدان، بەردەوام بوون لە کارێکدا بێت.

مجلس خاص: کۆڕی تایبەتی پادشایان کە لەمەحرەمان و زۆر نزیکان پێکدێ بۆئەوەی لەکاتی بێ ئاگاییدا رەچاوی ئەدەب بکەن.

هر کەرانیست ادب: هەرکەسی ئەدەبی نییە.

لەهەندێ نوسخەدا — وەك قەزوین — (مجلس شاە) هاتووە، کە جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە، مەبەست لە شا لەم بەیتەدا کۆڕی مورشیدانی کامڵە خواجە بە خۆی دەڵێ: هەر کەس بێ ئەدەب و روودار بێت لە کۆڕی تایبەتی مورشیداندا شیاوی هاودەمی نییە، بۆیە تۆ هەوڵێ بەدەستهێنانی زانست و ئەدەب بدە تا شیاو بیت.

## غەزەلی دوو سەد و شەشەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی مەقسور**
**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلان)**

**١ — قتل این خسته به شمشیر تو تقدیر نَبُوَد**
**ورنه هیچ از دل بی رحم تو تقصیر نَبُوَد**

قەدەر بڕیاری کوژرانی ئەم بریندارەی بەشمشێری تۆ نەدابوو، ئەگەرنا دڵی بێ ڕەحمی تۆ هیچ کەمتەرخەمیی (بۆ کوشتنی من) نەبوو.

تقدیر نبود: قەدەر وابوو، بڕیار و ویستی خوای لەگەڵدا نەبوو.

تقصیر: تەقسیر، کەمتەرخەمی.

واتە دڵی بێڕەحمی تۆ ئەیویست منی برینداری عەشق بکوژێ و هیچ تەقسرێکی نەبوو لە کوشتنی مندا، بەڵام قەدەر نەیکرد و ویست و ڕەزای خوای لەسەر نەبوو.

لەشەرحی عیرفانی ئەم بەیتەدا — بە دەرچوون لەخود گەیشتن بە فنانی الله لێکدراوەتەوە و (تۆ)ش بە مورشید کامڵ. مانای بەیتەکەش — وەك لەلاهوریدا هاتووە — بەم شێوەیەیە دەڵێ: بێ ڕەحم لە کوشتنی منەکاندا و گەیاندنیان بەفنا — میهرەبان و پڕ لوتفی تۆ هیچ کەمتەرخەمییەکی نەبوو لە کوشتنی مندا، بەڵام ویستی پەروەردگار وانەبوو.

هەر لە ڕوانگەی عیرفانییەوە ئەکرێ تۆ — مەعشوق — بیت و بەیتەکە لە ناز و بێ نیازی ئەو بدوێت سەبارەت بە عاشقان.

**٢ — من دیوانه چو زلفِ تو رها می کردم**
**هیچ لایقترم از حلقەی زنجیر نَبُوَد**

منی دێوانە کە وازم لە زوڵفی تۆ دەهێنا، هیچ شتێك لەوە شیاوتر نەبوو کە بخەنە بەندی زنجیرەوە.

رها می کردم: وازم لێ هێنا. لایق: شیاو.

لای خواجە ئەو کەسەی کە واز لە زوڵف و پرچی یار بهێنێ حەتمەن دێوانە و شێتە و پێویستە بە زنجیر ببەسترێتەوە، بۆیە دەڵێ: من گەر یاخود ئەو کاتەی کە وازم لە پرچی تۆ — حبل المتین —ی تۆ هێنا بێگومان شێتم جگە لەوەی کە بمخەنە نێو زیندان و بەزنجیر بمبەستنەوە هیچی دیکە شیاوم نییە.



**٣ — یارب آئینەی حسن تو چه جوهر دارد**
**که در او آه مرا قوّت تأثیر نَبُوَد**

پەروەردگارا ئاوێنەی جوانی تۆ چ جەوهەرێکی هەیە کە ئاهی من نەیتوانی کاری لێ بکات.

جوهر: ناوەڕۆك، ئەسڵ و ڕەسەنایەتی.

قوت تأثیر: هێزی کاریگەری، توانای کارتێکردنی.

(یارب) بۆ سەرسوڕمان بەکاردەهێنرێت، بە سەرسوڕمانەوە دەڵێ: پەروەردگار ئەم ئاوێنەی جوانیی تۆیە — کە یاری زەمینییە ئێوەی حەزرەتی موحەممەد ﷺ یا مورشید یاخود هەر یارێکی دیکە — کە جوانی تۆی تێدا دیارە چ جەوهەر و ئەسڵێکی هەیە کە ئاهی من — کە کێو لەبن دێنێ — بە هیچ شێوەیەك کاری لێ ناکات و ئاوڕم لێ ناداتەوە.

گەر مەبەست لەیار (محمد ﷺ) بێت ئەوا (ئاهـ) سەرپێچی و قسەی ڕەقە کە هیچ جۆرە کاریگەرییەکی لە حەزرەت نەدەکرد.

**٤- سر ز حیرت به درِ مکیدەها برکردم**
**چون شناسای تو در صومعه یك پیر نَبُوَد**

لەتاو حیرەت سەرم کرد بە دەرگای مەیخانەکاندا، چونکە لە خانەقادا پیرێك نەبوو کە تۆ بناسێت و ئاشنا بێت.

سر برکردن: سەرکردن، ڕوو کردن. شناس: ئاشنا، ناسیار.

پێشتر لە حیرەت دواین، حیرەت کە لەڕووی واتاوە حەیران و سەرگەردانییە و لەڕووی عیرفانیشەوە حیرەتە لە کەماڵ و جەمال و.... هتد حەقدا. خواجە دەڵێ کە حیرەت دەیگرتم لە خانەقادا پیرێك نەبوو کە عارف بێ بە تۆ _ حەق و تۆ بناسێت بۆیە ناچار سەرم دەکرد بە مەیخانەکانی عەشق و خۆشەویستیدا.

لەڕاستیدا (حیرت) یەکێك — گەر گرنگترینیان نەبێت — لە گرنگترین پایەکانی هزری عیرفانی حافظە و بونیادێکی بنچینەیی باکگراوندی شیعری خواجەشە.

**٥ — نازنینتر ز قدت در چمن ناز نَرُست**
**خوشتر از نقش تو در عالم تصویر نَبُوَد**

نازەنین تر لە قەدت لە مێرگوزاری نازدا نەڕوا و جوانتر لە نەخشی ڕووی تۆش لە جیهانی خەیاڵدا نەبوو.

نرست: نەڕوا، سەوز نەبوو. نقش تو: نەخشی ڕووخسار. عالم تصویر: جیهانی وێناکردن و خەیاڵ.

یاری نازدار و نازەنین و جوانی حافظ هێندە نازدار و جوانە کە لە وێنەی نییە و لە مێرگوزاری نازدا لەو نازدارتر نییە، دەڵێی هەر نەڕواوە و جوانتر لە جوانی رووی ئەویش ئەسڵەن بە خەیاڵی هیچ کەسێکیشدا نایەت نەك هەر ئەوەی لە جیهانی ماددەدا لەو جوانتر نییە لە خەیاڵیشدا لەو جوانتر بەخەیاڵی کەسدا نایەت.

**۶ – تا مگر همچو صبا باز به کوی تو رسم**

**حاصلم دوش بجز نالەی شبگیر نَبُوَد**

تا بەڵکو هەروەك سروە دووبارە بگەمەوە بە کویی تۆ، دوێنێ شەوی رابردوو جگە لە ناڵەی سەحەر هیچی دیکەم نەکردووە.

مگر: بەڵکو      باز: دووبارە.      رسم: بگەم.      شبگیر: سەحەر، دەمی بەیان.

وەك هەمیشە حافظ گریان و زاری بە دەروازەی گەیشتن بە گوێی یار ئەداتە قەڵەم دەڵێ: دوێنێ شەوی رابردوو کار و پیشەم ئاه و ناڵەی سەحەری بووە تا بەڵکو بە هۆی ئەم ئاه و ناڵەی شەوانە و سەحەرگاهانەوە وەك سروەی بەیان بگەمەوە کۆڵان و کوچەی تۆ (بچمەوە حزوری تۆ).

**۷- آن کشیدم ز تو ای آتش هجران که چو شمع**

**جز فنای خودم از دست تو تدبیر نبود**

ئەی ئاگری دابڕان ئەو عەزابەم لە دەستت کێشاوە، کە وەك مۆم جگە لە فەنای خۆم بۆ رزگاری لە دەستی تۆ هیچ چارەیەکم نەبوو.

کشیدم: کێشام، بینیم (عەزاب کێشان، رەنج کێشان، نارەحەتی بینین).

از دەست تو: لەسەر دەستی تۆ.      تدبیر: چارە.

دەردی دووری لەیار و ئاگری دابڕان لەو رەنج و عەزابی نەبڕاوە بە عاشقان دەدات، دابڕان لە مەعشوق کە ئاگرێکە و (تا دنیا بەردەوام بێت و عاشق زیندوو بێت بەردەوام) بەردەوام عاشقان دەسووتێنێ، تەنیا رێگە چارە لە دەرچوون لەم ئاگرە گەیشتنە بەمەقامی (فنا) و (بقاء باللّه)ە کە دوا مەنزڵی عیرفانە. خواجەش دەڵێ: بەرلەمە هێندە عەزاب و رەنجم لەدەست دابڕان بینی بۆیە تەنیا (فەنا) رێگە چارەم بوو، وەك ناوم خۆم نەکرد.

**۸- آیتی بود عذاب انده حافظ بی دوست**

**که بَرِ هیچکسش حاجتِ تفسیر نَبُوَد**

خەفەتی حافظ بێ دۆست ئایەتێکی عەزابی وابوو کە لای هیچ کەس پێویستی بە تەفسیر نەبوو.



آیتی: ئایەتێك.      اندە / اندوە: خەفەت، غەم.      بر: لای.      حاجت: پێویستی.

واتە خەم و خەفەتی حافظ لە دووری دۆست هێندە نارەحەت و خەفەت هێنەر بوو وەك بەڵگە و ئایەتێکی ئاشکرا و بێ پێچ و پەنای عەزاب و نارەحەتی بوو کە هێندە رۆشن بوو لای هیچ کەس پێویستی بە تەفسیر و روونکردنەوە نەبوو.

## غەزەلی دوو سەد و حەوتەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی مەقسور**
**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلان)**

**١ — دوش در حلقەی ما قصەی گیسویِ تو بود**
**تا دلِ شب سخن از سلسلەی مویِ تو بود**

دوێنێ شەوی رابردوو لە کۆڕ و ئەڵقەی ئێمە باسی پرچی تۆ بوو، تا نیوەشەو لە بارەی زنجیری (ئەڵقە ئەڵقەی) زوڵفتەوە قسە دەکرا.

حلقە: ئەڵقە، کۆڕ. دل شب: دڵی شەو درکە بە لە نیوەشەو، ناوەنی شەو، درەنگە شەو
سلسلە: زنجیر، ئەڵقە ئەڵقە.

خواجە لەگەڵ یاری حەقدا دەدوێ و دەڵێ: دوێنێ شەوی رابردوو ئێمە لە کۆڕ و ئەڵقەی عارفاندا تا نیوەشەوێکی درەنگ باسی پرچی تۆ ئەڵقە ئەڵقەی پرچی تۆ (رێگەی طلب و حبل المتین) مان دەکرد و قسە درێژەی کێشا.

**٢ - دل کە از ناوكِ مژگانِ تو درخون می گشت**
**باز مشتاقِ کمانخانەی ابروی تو بود**

دڵ کە لە تیری تۆی لە خوێندا دەگەوزا، کەچی دیسانەوە موشتاقی برۆی کەوانی تۆ بوو.

ناوك: تیر. درخون می گشت: لە خوێندا دەگەوزا، نغرۆی خوێن بوو.
کمانخانە: شوێنی کەوان. کمانخانە ابرو: برۆی کەوانی.

دڵ کە لە تاو حیجاب و پەردەی رووی تۆ (کە دەبووە هۆی ئەوەی من بەرووت بگەم) زۆر خەمبار و خەمناك بوو، لەگەڵ ئەوەشدا موشتاقی مەنزەلەت و مەقامی قوربی تۆ بوو.

یاخود لەگەڵ ئەوەی کە برژانگی تۆ دەبووە مایەی لە خوێن گەوزانی دڵ، بەڵام هەر وازی نەدەهێنا موشتاقی چاو و برۆی تۆ بوو.

**٣ — هم عفاالله صبا کز تو پیامی می داد**
**ورنە در کس نرسیدیم کە از کویِ تو بود**

خوا لەسەبا خۆش بێ کە پەیامێکی تۆ دەهێنێ، ئەگەرنا بەکەس نەگەیشتین کە لە خەڵکی کۆڵانی تۆ بێت.

عفاالله: خوا لێی خۆش بێ. نرسیدیم: نەگەیشتین.



جگە لە سەبا کەس خەڵکی کۆڵان و کوچەی یار نییە و هیچ هەواڵ و خەبەرێك لە بارەوە ناهێنێ، بۆیە خواجە دۆعای خێر بۆ سەبا دەکات کە لەلایەن یارەوە پەیام و هەواڵێك دەهێنێ ئەگەرنا بە کەس نەگەیشتووین کە بە هەوڵ و کۆشش هەواڵ و خەبەری تۆی یاری حەق بهێنێ و بزانێ.

**٤ — عالم از شور و شرِ عشق خبر هیچ نداشت**
**فتنەانگیز جهان غمزەی جادویِ تو بود**

جیهان هیچ ئاگای لە شور و غەوغای عەشق نەبوو، غەمزەی جادوو بازی تۆ بووە ئاشوبگێڕی دونیا.

شور شد: شور و غەوغا. خبر نداشت: بێ ئاگا بوو، بێ خەبەر بوو

واتە: بەرلەوەی جیهان جوانی و حوسنی بێ پایانی تۆ (یاری حەق) ببینێ یاخود هەستی پێ بکات هیچ ئاگای لە غەوغا و شەوق و شوری عەشق نەبوو، ئەوەی کە شەوق و شوری عەشق خستە دونیاوە جوانی حوسنی تۆ بوو.

**٥ — منِ سرگشتە هم از اهلِ سلامت بودم**
**دام راهم شکنِ طرّەی هندوی تو بود**

منی سەرگەردانیش ئەهلی سەلامەت بووم، بەڵام بروای سەرەڕێم چینی پرچی رەشی تۆ بوو.

سرگشتە: سەرگەردان. شکن: چین. هندوی: رەش.

لەڕاستیدا خواجە سەرەتا باس لە خۆی دەکات بەرلەوەی عەشق شەوق و شور بخاتە نێو جیهانەوە — جیهانی خواجە دەڵێ: هەر وەك چۆن دنیا لە شەوق و شوری عەشق بێ بەش بوو منیش لە شەوق و شوری عەشق بێ بەش بووم و لە کۆمەڵی ئەهلی سەلامەت بووم، بەڵام چینی پرچی رەشی تۆ (کە پرچی عارفەکان رەمزی زۆری و نهێنی ئیلاهییەکانە) بووە داوی سەرەڕەیێ منی سەرگەردان و منی راکێشایە نێو دونیای عیرفانەوە.

**٦ — بگشا بندِ قبا تا بگشاید دلِ من**
**کە گشادی کە مرا بو ز پهلویِ تو بود**

خۆتم پیشاندە تا دڵم بکرێتەوە، چونکە کرانەوە و شادی دڵی من لەلایەن تۆوەیە.

بگشا: بکەرەوە. بگشاید: بکرێتەوە، شاد بێت. ز پهلو: لەلایەن.

خواجە بەیاری حەق دەڵێ بەندی حیجاب بکەرەوە و بێ پەردە خۆتمان پێ نیشانبدە تا دڵمان شاد بێت و بکرێتەوە، چونکە دڵی ئێمەی عاشقان تەنیا لەلایەن تۆوەیە و تۆ ئەتوانی شادمان کەیت.

**٧ – بەوفایِ تو که بر تربتِ حافظ بگـذر**

**کز جهان می شد و در آرزوی روی تو بود**

تۆ وەفای خۆت بەسەر گۆڕی حافظـدا ڕەت بە، چونکە لە کاتێکدا کە لە دونیا دەرئەچوو بە ئاواتی ڕووی تۆوە بوو.

بەوفای تو: سوێند بێت بە وەفاداریت، تو وەفای خۆت.    تربـت: گـۆڕ.

می شد: دەڕۆیشت.

ئەی یاری حەق کە وەفاداریت، بەو وەفادارییەی خۆت سـوێندت ئـەدەم کـە پـاش مـەرگی حـافظ زیارەتی گۆڕەکەی بکە (تەجەلی بۆ بکـە)، چـونکە ئەوکاتـەی چـاوەکانی لێـك دەنـا و دونیای بە جێ هێشت بەهیوا و ئاواتی ڕووی تۆوە بوو.



## غەزەلی دوو سەد و هەشتەم:

**بەحری ڕەمەلی هەشتی مەخبونی مەقسور**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلان)**

**١ – دوش می آمد و رخساره برافروخته بود**

**تاکجا باز دلِ غمزده‌ای سوخته بود**

دوێنێ شەو دەهات و ڕوخساری ڕازانـدبووەوە، ئـاخۆ دیـسانەوە لـەکوێ دڵـی غـەمباری سووتاند بوو.

رخسارە: ڕوخسار.    برافروختە بود: داگیرساند بوو، هەڵکردبوو، ڕازاندبووەوە.

تا: ئاخۆ، تابزانین.

ڕوخسار ڕازاندنەوەی مەعشوق دەبێتە مایەی ئەوەی ئاگر بەربداتە دڵی عاشـقانەوە، بۆیـە دوێنێ شەو کە یار بەروخساری جوانی _ جلال یا جمال)ەوە جیلوەی کردووە خواجە دڵنیـا بـووە کە دڵێکی سووتاندووە، بەڵام شوێنەکەی نـازانێ و دەپرسـێ ئـاخۆ دڵێکـی غـەمباری ئـاگری تێبەرداوە.

عارفەکان ئەم غەزەلە و غەزەلی دواییش لە ڕێژەی ڕابردووی دوور را بەکار هاتوون.

**٢ – رسم عاشق کشی و شیوەی شهر آشوب**

**جامەای بود که بر قامتِ او دوختە بود**

ڕەسمی عاشق کوژی و شێوەی ئاشوب خستنە شارەوە، کراسێك بوو کە بۆ باڵای ئەو دورا بوو.

عاشق کشی: عاشق کوژی.    شهر آشوبی: ئاشوب و فیتنەگێڕی شار.

جامە: کراس.    دوختە بود: دروا بوو، دورا بوو.

(بر قامت او دوختە بود) واتە پڕبەری ئەو بوو، واتە گەر عاشـقکوژی فیتنەئـەنگیزی شـار کراسێك بێت پڕ بەبەری بەژن و باڵای یارە، یار لە عاشـق کـوژی و فیتنـە ئـەنگێزی لەشـاردا وێنەی نییە.

**٣ – جان عشّاق سپندِ رخ خود می دانست**

**و آتشِ چهره به این کار برافروختە بود**

گیـانی عاشـقانی بـە (ئەسـفەند)ی ڕووی خـۆی دەزانـی و ئـاگری ڕوخـساری بـەم کـارە داگیرساندبوو.

سپند: ئەسفەند، ئەسپەند.          میدانست: دەزانی.

بۆ گێڕانەوەی بەلاَ و نەهامەتی (سپەند) لەسەر ئاگر دەکرێت تا بسووتێت و دووکەڵەکەی بلاَو بێتەوە، خواجە لە بێ ڕەحمی مەعشوق ئەدوێ بەرامبەر بە عاشقان، دەڵێ: مەعشوقی ئێمە گیانی عاشقان بە ئەسپەند و (بەلاَ لابەر یا قوربانی) ڕووی خۆی دەزانێت و هەر بەمەش تا بێت ئاگری (جوانی و رازاوەیی) ڕووی خۆی زیاتر دەکات.

لە هەندێ نوسخەدا بەری (رخ)، (رە) هاتووە، کە لەڕووی واتاوە جیاوازییەکەی ئەوتۆیان نییە.

**٤ — کفر زلفش ره دین می زد و آن سنگین دل**

**در رهش مشعلی از چهره برافروخته بود**

کوفری پرچی دینی تالاَن ئەکرد و ئەو دڵڕەقەش، لەڕێگەیدا مەشخەڵێکی لە رووخساری خۆی داگیرساند بوو.

کفر: تاریکی.          ره دین می زد: ڕێگری دین بوو، کە تالاَنی دەکرد.

سنگین دل: دڵ وەك بەرد.          مشعله: مەشخەڵ.

کوفر و تاریکی زولفی (کە ڕەمزی زۆری حیجابە) ڕێگری دین و ئیمان بوو، واتە کاتێ کە تاریکی زولفی و حیجاب و پەردەکان لەنێوان مەعشوق و مەخلوقدا دەبووە تالاَنکەری ئایین، ئەو مەعشوقە لەبری ئەوەی کە پرچی لادات کەچی ویست و ئیرادە یا (مەشیئەتی) وابوو کە ئەم کارە زیاتر سەر بگرێ و لەڕێی ئەو ڕێگرەدا رووخساری وەك مەشخەڵ دادەگیرساند تا زیاتر ڕێگە ببینێت و دین و ئیمان تالاَن بکات.

**٥ — گرچه می گفت که زارت بکُشم می دیدم**

**که نهانش نظری با منِ دلسوخته بود**

گەر چی دەیگوت بە نارەحەتی دەتکوژم، بەلاَم دەبینی بەپەنهانی چاوێکی لوتفی لەمنی دڵسووتاو بوو.

گرچه: گەرچی.          زارت بکشم: بەزراییەوە دەتکوژم، بەنارەحەتی و سەختییەوە دەتکوژم.

واتە گەرچی یار لە ڕوودا دەیگوت بە گریە و زاری دەتکوژم، بەلاَم کە بە وردی سەرنجمدەدا بە دزییەوە یا بە شاراوەیی و پەنهان چاوێکی لوتفی لە منی دڵسووتاو بوو.

**٦ — دل بسی خون به کف آورد ولی دیده بریخت**

**اللّه اللّه که تلف کرد و که اندوخته بود**



دڵ خوێنی زۆری بە دەستهێنا، بەلاَم چاو ڕژاندنی، سەیرە کێ بە بای دا کێ بۆی کۆی کردبووەوە.

بەکف آورد: بەدەستهێنا، کۆی کردەوە.          بریخت: ڕژاندی.

الله الله: بۆ خاتری خوا ! بۆ سەرسوڕمانە.          تلف کرد: بەبای دا، بەهەدەری دا.

اندوخته بود: کۆی کردبووەوە.

خوێن کۆکردنەوە ڕەنج و عەزاب کێشانە، خواجە دەڵێ: لە ڕێگەی عەشقدا دڵ دنیایەك ڕەنج و عەزابی کێشا و هەوڵیدا و ماندوو بوو کەچی چاو هێندە گریا هەموو هەوڵ و کۆششی ڕەنجەکەی دڵی بەبادا و لە شێوەی فرمێسکی خوێنیندا دایە دەرەوە، سەیرە بزانە کێ هەوڵیدا و کۆی کردەوە و کێ بەبای دا.

واتە ئەو ڕەنجە نادیارەی دڵ لە ڕێگەی عەشقدادای (کە لە عەشقدا بێدەنگی پێویستە) چاو بەفرمێسك ڕژاند ئاشكرا کردنی لەناوی برد و دای بە بادا.

**٧ — یار مفروش بەدنیا که بسی سود نکرد**

**آنکه یوسف به زرِ ناسره بفروخته بود**

یار مەفرۆشە بە دونیا، چونکە ئەو کەسەی یوسفی بەسکەی تەزویر قەڵب فرۆشتبوو زۆر قازانجی نەکرد.

مفروش: مەفرۆشە.          سود نکرد: قازانجی نەکرد.          ناسره: تەزویر، قەڵب.

بفروخته بود: فرۆشتبوو.

لەم بەیتەدا خواجە ئاماژە بە چیرۆکی حەزرەتی یوسف دەکات علیه السلام، ئەو کاتەی کە براکانی بە پارەیەکی زۆر کەمی بێ نرخ فرۆشتیان وەك خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ: (وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍ بَخْسٍ دَرَاهِمَ مَعْدُودَةٍ وَ كَانُوا فِيهِ مِنَ الزَّاهِدِينَ) سورەتی یوسف ئایەتی (١٢) بەلاَم دواجار مەجبوری لای یوسف ـ د.خ ـ بوونەوە و پەشیمان بوونەوە لەو کارەیان.

لێرەدا خواجە (یوسف)ی بە ڕەمزی یار داناوە و دەڵێ: یار مەدە بە دونیا، چونکە ماڵی دونیا هیچ نییە و ئەو برایانەی یوسف کە حەزرەتی یوسفیان فرۆشت بە دونیا هیچ قازانجیان نەکرد.

واتە: دونیا وات لێنەکات کە لە یاری حەق بێئاگا بیت و ئەوت لەبیر بباتەوە.

لەم نوسخەی لاهوریدا ئەم بەیتە بەم شێوەیەیە:

**آن که یک لحظه وجانش به دو عالم بفروخت**

**یوسف خود به زر ناسره بفروخته بود**

واتە: ئەوکەسەی کە یەك سات ژوانی حەق بە هەردوو عالەم (دونیا و ئاخرەت) بفرۆشی یوسفی خۆبە سکەی قەڵبی تەزویر فرۆشتووە.

**٨ — گفت و خوش گفت برو خرقه بسوزان حافظ**

**یارب این قلب شناسی زکه آموخته بود**

گوتی: (چەند جوانی گوت) حافظ برۆ خرقە بسووتێنە، خواجە ئەم (قەڵب ناسی)یە لە کێ فێر ببوو.

خوش گفت: چەندە جوانی گوت. قلب: دل، قەڵب و تەزویر.

آموخته بود: فێر بوو. قلب شناسی: ناخناسی، دەروونناسی، قەڵب و تەزویر ناسی.

(قلب) وەك ئاماژەمان پێداوە لێڵی تێدایە و بە هەردوو مانای دڵ و قەڵب و قلب ناسیش بەهەمان شێوەیە، بەڵام مانای دووەمیان (قەڵب ناسی) زیاتر لەگەڵ مەشرەبی حافظدا یەكدەگرێتەوە.

دوێنێ شەو یار قسەیەكی زۆر جوانی کرد و گوتی حافظ، ئەزانم ئەم خرقەی سۆفییانەت پڕە لە تەزویر و ریا، برۆ بیسووتێنە و واز لە ریا بهێنە، خوایە ئەم تەزویر و قەڵبناسییە لە کێ فێر بووە. وا هێندە جوان خرقەی قەڵب و تەزویرەکەی منی ناسی.



## غەزەلی دووسەد و نۆیەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەقسور**

**(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان)**

**١ — یک دو جامم دی سحرگه اتّفاق افتاده بود**

**و ز لبِ ساقی شرابم در مذاق افتاده بود**

دوێنێ بەیانی یەك دوو پێکم هەڵدابوو، لە لێوی ساقیشەوە تامی شەڕابم کردبوو.

اتفاق افتاده بود: رووی دابوو، لێرەدا بەواتای (خواوەندەوە) هەڵدان، هاتووە.

مذاق: هەستی تامکردن، تام.

دوێنێ لە زاراوەی عیرفانیدا رۆژی ئەزەلە و مەی خۆشەویستییە. خواجە دەڵێ: لە رۆژی ئەزەلدا کە کاتی جیلوەی رەحیمی و میهرەبانی حەقە یەك دوو پێکی خۆشەویستی یارم هەڵداوە و بەوەش زیاتر تامی ماچی لێوی ساقی (قسەی ساقی)م کردبوو — لێرەدا ساقی یاری حەقە (جل شأنه)-

**٢ — از سرِ مستی دگر با شاهدِ عهدِ شباب**

**رجعتی می خواستم لیکن طلاق افتاده بود**

لە مەستیدا جارێکی دیکە دەمویست لەگەڵ یاری سەردەمی لاوێتیدا پەیوەندی ببەستمەوە، بەڵام تەڵاق کەوتبوو.

شاهد عهد شباب: یاری سەردەمی لاوی، یاخود یارم کە سەردەمی لاوییە واتە سەردەمی لاوی بەیار داوەتە قەڵەم.

رجعت: گەڕانەوە، پەیوەندی بەستنەوە. طلاق افتاده بود: تەڵاق کەوتبوو.

(رجعت) لێرەدا مەبەست لەو گەڕانەوەیە کە لە نێوان ژن و مێردی (تەڵاق کەوتوودا) هەیە، خواجە سەردەمی لاوی بەیار ئەداتە قەڵەم و دەڵێ: دەمویست بگەڕێتەوە بۆلای، بەڵام تەڵاقم کەوتبوو، ئیدی نەمتوانی واتە سەردەمی لاوی ناگەڕێتەوە و ناکرێ بگەڕێتەوە.

ئەکرێ (شاهد عهد شباب) یاری سەردەمی لاوی بێت، کە لێرەدا واتاکە بەتەواوی کۆنگرێتی دەبێتەوە و دەبێت خواجە لەسەردەمی لاویدا یارێکی هەبووە کە حەڵاڵی بووە و بەجێی هێشتووە و ئێستا بە پیری ویستوویەتی بگەڕێتەوە بۆلای، بەڵام سەیر دەکات تەڵاقی کەوتووە.

لە هەر یەك لەم واتایانەدا، بەیتەكە تەواوكەری بەیتی یەكەم و لەو یەكدەوپێكەی دوێنێی ئەزەل دەدوێ ئەو دەڵێ: كە مەست بووم، لە مەستیدا بگەڕێمەوە بۆ سەردەمی ئەزەلی خۆم و یاری ئەزەلیم لە خۆم نزیك بكەمەوە، بەڵام ئەوكارە ئەستەمە و هەرگیز نایەتە دی، چونكە ئێستەی مرۆڤ لەو دونیایە دەرچووین و هاتینە ئێرە. وەك ئەوەی كە تەڵاقمان لەسەردەمی ئەزەلی خۆمان كەوتبێ.

**۳ – در مقاماتِ طریقت هرکجا کردیم سیر**

**عافیت را با نظری بازی فراق افتاده بود**

لەمەقاماتی تەریقەتدا لە هەرشوێنێكدا تێپەڕی (چووینە هەر مەقامێكەوە) بینیمان سەلامەتی لە عەشق بازی جودا بووەتەوە.

سیر: تێپەڕین، تەی كردن. عافیت: سەلامەتی. فراق افتاده بود: جودا بوو بووەوە.

(عافیت) سەلامەتی و بێ گرفتییە و سەردەمی قوومی مرۆڤە و (نظری بازی) ش عەشق و عەشقبازی عارفانەی حەوث)ە، خواجە دەڵێ: بەهەر مەقامێكی تەریقەت گەیشتین و لێی ورد بووینەوە كە عەشق و سەلامەتی بێ گرفتی – كە سیفەتی ئەزەلە – لە یەك دوورن و بەیەكەوە كۆنابنەوە.

**٤ – ساقیا جام دمادم ده که در سیرِ طریق**

**هرکه عاشق وَش نیامد در نفاق افتاده بود**

ئەی ساقی پێك لە دوای پێكمان بدەرێ، چونكە لە تەی كردنی ڕێگەدا هەر كەس عاشق ئاسا ڕەفتاری نەكرد كەوتبوو نێو دووڕوویی یەوە.

دمادم: یەكلەدوای یەك، لەسەریەك. ده: بدە، بماندەرێ.

عاشق وش: عاشق ئاسا. در نفاق افتاده بود: كەوتبووە نێو دووڕوویییەوە، دوچاری دووڕوویی و نیفاق بووبوو.

ساقی لێرەدا واسطە و مورشیدە، لێرە لە دونیای ماددییاتدا مەرجی تەی كردنی ڕێگەی عەشق و عیرفان ئەوەیەكە عاشقانە و عاشق ئاسا بڕۆیت و سەروماڵ بەختبكەیت، هەركەس وانەكات كەوتووەتە نێو خەندەقی دووڕوویی و نیفاقەوە، ئەم تەیكردنە عاشقانەیەش مەستبوون و شەراب – ئاگادار كردنەوەی بەردەوامی ڕۆحانی – دەوێت، بۆیە خواجە بەساقی دەڵێت: یەك لە دوای یەك پێكم بدەرێ تا مەست بم و عاشقانە و ڕاستگۆیانە مەقاماتی تەریقەت تەی كەم.

**۵- نقش می بستم که گیرم گوشه ای زان چشم مست**

**طاقت و صبر از خم ابروش طاق افتاده بود**



خەیاڵم وابوو كە لەو چاوەمەستانە گۆشەگیری بكەم (دووركەومەوە) بەڵام كەوانی بڕۆی توانا و تاقەتی ئارامی و سەبری منی بڕیبوو.

نقش می بستم: بێ هاوتابوو (زۆ زۆر ببوو).

طاقت و صبر طاق بودن: سەبرم توانا و تاقەتی لەبەر بڕابوو.

چاوی مەعشوقی حەقە توانای لەبەر سەبر و ئارامم هەڵگرتبوو و نەمتوانی لێی دووربكەومەوە.

**۶- ای معبّر مژده‌ای فرما که دوشم آفتاب**

**در شکرْ خوابِ صبوحی هم وثاق افتاده بود**

ئەی خەولێكدەرەوە مژدە بدە، دوێنی شەو لە خەوێكی شیرینی بەیانیدا هەتاو لەگەڵمدا ببووە هاوماڵم.

معبّر: خەولێكدەرەوە. فرما: بفەرموو، بدە.

وثاق: ماڵ، چادر. هم وثاق: هاوماڵ، واتە هەردووكیان لەیەك ماڵدا /چادردا.

شكرخواب صبوحی: خەوی شەكرینی /شیرینی بەیانی.

دوێنی بەیانی خواجە خەوێكی زۆرشیرینی (شەكرینی) دیوە كەتیادا هەتاو لەگەڵ ئەمەدا لەماڵێكدا پێكەوە ژیاون، ئێستا ئەو بە خەولێكدەرەوە دەڵێ، مژدەم بدەرێ و ئەم خەوە خۆشەم بۆ لێكدەرەوە.

**۷- حافظ آن ساعت که این نظم پریشان می نوشت**

**طایرِ فکرش بەدام اشتیاق افتاده بود**

حافظ ئەو سەعاتەی كەئەم شیعرە پەشێو و پەرێشانەی دەنوسی، مەلی هزری كەوتبووە نێوداوی تاسە و تامەزرۆییەوە.

نظم پریشان: شیعری پەشێو و تێكەڵ و پێكەڵ. مینوشت: دەنووسی.

لەم بەیتەدا خواجە باسی حاڵی فیكریی خۆی دەكات لە كاتی نووسینی ئەم شیعرەدا و دەڵێ: لەوسات و سەعاتەدا كە حافظ ئەم شیعرە تێكەڵ و پێكەڵەی دەنووسی بیری بەندی تاسە و شەوقی نیشتیمانی ڕەسەنی خۆی بوو- كەبەهەشت و ئەزەلە-

## غەزەلی دوو سەد و دەیەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی مەقسور**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلان)**

**١ — گوهرِ مخزنِ اسرار همان است که بود**

**حُقّەی مِهر بدان مُهر و نشانست که بود**

گەوهەری مەخزەنی نهێنی هەر ئەوەیە کە بوو، بوخچەی میهر هەر بەو مۆر و نیشانەیە کە بوو.

کە بود: کە پێشتر وابوو، کەوا بوو. حقە: بوخچە، سندووقچە. مهر: مۆر.

مەخزەنی نهێنی و ئەسرار دڵی عاشق و عارفانە و گەوهەرەکەش عەشق و خۆشەویستییە، خواجە لەم بەیتەدا جەخت لە نەگۆڕی عەشق دەکاتەوە کە گەوهەرێکە لە دڵی دایە و دەڵێ: گەوهەری مەخزەنی نهێنی و رازی دڵی من هەر ئەو گەوهەرەیە کە لە ئەزەلدا هەبوو، سندووقچەی خۆشەویستیش (کە هەر دڵی منە) هەر سەربەمۆرەکەی جارانە و هەر ئەو مۆر و نیشانەیەی عەشقی ئەزەلی پێوەیە.

**٢ — عاشقان زمرەی ارباب امانت باشند**

**لاجرم چشمِ گهربار همانست که بود**

عاشقان لە زومرەی ئەربابی ئەمانەت (ی عەشق) بن بەناچار چاوانی گەوهەربار هەر ئەو چاوانەیە کە هەبوو.

ارباب امانت: ئەربابی ئەمانەت، ئەو کۆمەڵەیەی کە ئەمانەتی عەشقیان قەبووڵکردووە.

لاجرم: ناچار، بێ شك، لابە.

خواجە ئەمانەت و چاوانی فرمێسکاوی (گەوهەربار) پێکەوە دەبەستێتەوە و پێی وایە باری ئەمانەت کە بەناچاری چاوان پڕ لەگریان دەکات، بۆیە لێرەشدا دەڵێ: مادام عاشقانی حەق لە گرووپ و زومرەی ئەربابی ئەمانەتی عەشقن ئەوا بەناچاری چاوانیان هەمان چاوانی گریاو و گەوهەرباری (فرمێسکی خوێنین باری) جاران دەبێت · بێگومان لە ترسی بە جێ نەگەیاندنی ئەمانەتی عەشقدا.

**٣ — از صبا پرس که ما را همه تادم صبح**

**بویِ زلف تو همان مونس جان است که بود**

لە سەبا بپرسە، ئێمە هەموو شەوێ تا بەرەبەیان، بۆنی پرچی هەمان هاودەمی گیانمانە کە پشتوان بوو.



پرسی: بپرسە. مونس: هاودەم.

بەیار دەڵێ: ئێمە ئێستاش وەك جاران هەموو شەوێك تابەرەبەیان هاودەمی گیانمان بۆنی پرچی تۆیە سەباش دەزانێت، لەسەبا بپرسە.

واتە: سەبا حاڵی ئێمە دەزانێ کە هەموو شەوێ تا بەرەبەیان بۆنی پرچی تۆ دەکەین و تابەرەبەیان مەشغوڵی راز و نیازین لەگەڵ تۆدا.

**٤ — طالبِ لعل و گهر نیست و گرنه خورشید**

**همچنان در عملِ معدن و کانست که بود**

کەس داواکەری لەعل و گەوهەر نییە، ئەگەرنا خۆر هەروەك جاران خەریکی دروستکردنی لەعل و گەوهەر لە کانزاکانە.

طالب: داواکەر، خوازیار.

جاران پێیان وابوو کە خۆر کانزا و توخمەکانی دیکە بۆ دوڕ و گەوهەر دەگۆڕێت. خواجە خۆری بەواتای فەیزو رەحمەت و هیدایەتی ئیلاهی و دوڕ و گەوهەریشی بە دڵی پاك و نووردانراوە و دەڵێ: کەس تالبی ئەوە نییە کە ببێتە دوڕ و گەوهەر، ئەگەرنا هیدایەتی ئیلاهی هەروەك جاران ئامادەیی تێدایە هێدایەتی بەندەکانی بدات بۆ بوونە گەوهەر.

**٥ — کشتەی غمزەی خود را به زیارت دریاب**

**زانکه بیچارە همان دل نگرانست که بود**

کوژراوی غەمزەی خۆت بەسەرکەرەوە، چونکە ئەو بێچارە ئێستاش هەمان نیگەران و چاوەڕێکەرەکەی جارانە کە بوو.

بە زیارت دریاب: بەسەرکەرەوە، سەردانی بکە. دل نگران: نیگەران، هەراسان.

عاشقان کوشتەی غەمزە و — اسغنا — ی یاران، خواجە بە مەعشوقی حەق دەڵێ: ئەم کوژراوی غەمزەیەی خۆت بەسەرکەرەوە و سەرێکی لێ بدە، چونکە ئەو بێچارەیە ئێستاش وەك جاران نێگەران و چاوەڕوانی دیدارێکی تۆیە.

**٦ — رنگِ خونِ دل ما را که نهان می داری**

**همچنان در لبِ یاقوت تو عیانست که بود**

رەنگی خوێنی دڵی ئێمە کە دەیشاریتەوە، هەروا وەك جاران بە لێوی یاقوتینی تۆوە دیارە.

نهان میداری: دەیشاریتەوە. عیانست: دیارە.

تۆ کە قاتڵی ئێمەیت و خوێنت رژاندووین بەردەوام رەنگی خوێنی دڵی ئێمە دەشاریتەوە کەچی لە قسەتدا دەردەکەوێت کە تۆ قاتڵی ئێمەیت یاخود خوێنی ئێمە بە لێوی سوورتەوە دیارە.

لاهوری پێی وایە ئەم بەیتە بێ ئەدەبی عاشقە بەرامبەر مەعشوقە، بەڵام هەرخۆشی — بە پشت بەستن بەڕای عارفان — ئەم ئەدەب شکاندنە بەئەدەب دەزانێ، چونکە (یحیی بن معاد رازی دەڵێ: ترك ادب في العشق ادب - بێ ئەدەبی لە عەشقدا بۆ خۆی ئەدەبە). { لاهوری، ج ٢ ل ١٤٨٤ }.

**٧ — زلفِ هندوی تو گفتم که دگر ره نزند**

**سالها رفت و بدان سیرت و سانست که بود**

بە خۆم گوت ئیدی زوڵفی رەشی تۆ رێگری ناکات ساڵها تێپەڕی و هەر لەسەر ئەو خوورەوشتەیە کە لەسەری بوو (هەر رێگری ئەکات)

هندو: رەش، دز و رێگر. ره نزند: تالانی نەکات، رێگری و دزی نەکات.

سیرت و سان: خوورەوشت، دابونەریت. گفتم: گوتم، وامزانی، کومانەوە بوو.

جاران پرچی رەشی رێگرت دڵی عاشقانی تالان دەکرد و لەڕێ لای دەدان، گوتم رەنگە لەمەو پاش واز لە تالان و دزی بهێنێ و دڵان نەخاتە کەمەند و داوی خۆیەوە، کەچی ساڵانێکی زۆر تێپەڕی و پرچی رەشت هەروەك جاران خەریکی تالانی و دڵ دزینە.

**٨ —حافظا باز نما قصّەی خونابەی چشم**

**که درین چشمه همان آبْ روانست که بود**

حافظ چیرۆکی خوێناوی چاوی خۆت باس کە، چونکە لەم سەرچاوەیەدا هەمان ئەو ئاوەدێ کە جاران دەهات

بازنما: باسی کەرەوە، بگێڕەوە. خونابە: خوێناو. چشمە: سەرچاوە، کانی.

حافظ جاران فرمێسکی خوێنی لە چاوان دەباراند و چاوانی وەك کانییەك بوو کە ئەو خوێناوەی لێ دەهاتە دەرەوە، لە کاتێکدا ئێستاش هەر ئەو خوێناوە لە چاوی دێت، بۆیە بە خۆی دەڵێ ئەی حافظ چیرۆك و باسی خوێناوی چاوی خۆت بۆ یار بکە تا بزانێ چەندە گریاوی دڵنیابە ئێستاش وەك جاران دەگرییێت و لە چاوانتدا دەیبینی.



## غەزەلی دووسەد و یازدەیەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەقسور**

**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلان)**

**١ — دیدم به خوابِ خوش که به دستم پیاله بود**

**تعبیر رفت و کار به دولت حواله بود**

لە خەوێکی خۆشدا بینیم پێك بەدەستمەوە بوو، لێکدرایەوە و مانای بەخت و ناوچاوی دا.

خواب خوش: خەوی خۆش. تعبیر رفت: لێکدایەوە.

خواجە دەڵێ: لە خەوێکی خۆشدا بووم و لەو خەونەدا دیتم پێکی شەرابم بە دەستەوەیە، خەوەکەم لێکدرایەوە و مانای ئەوە بوو کە بەخت و ناوچاو رووی لە من کردووە و بەختی خەواڵو لە عەشقدا بێدار بۆتەوە.

**٢- چل سال رنج و غصّه کشیدم و عاقبت**

**تدبیر ما به دست شراب دو ساله بود**

چل ساڵ خەم و خەفەتمان خوارد و ئاقیبەت، چارەمان بەدەست شەڕابی دوو ساڵەوە بوو.

چل: چهل: چل. عاقبت: سەرئەنجام، ئاقیبەت.

شراب دوسالە: شەڕابی گەییووکۆن، چونکە شەڕاب هەر چەندە کۆنتر بێت کاریگەرترە.

خواجە چل ساڵ رەنج و خەم و خەفەتی دونیا یاخود دەرد و نارەحەتی دەورەی چلەنشینی و خەڵوەت و خۆماندووکردن بە بێ سەرەنجام دەزانێت و ئەوەی کە بەچارە بەخش دەزانێت تەنیا عەشق و خۆشەویستییە کە لێرەدا بە شەڕابی دوو ساڵە ناوی بردووە، بۆیە دەڵێ: چل ساڵ دەرد و نارەحەتی و خەم و خەفەتم خوارد و ئاخری هەر شەڕاب (عەشقی حەقیقی) بەفریام کەوت.

ئەم بەیتە هاوواتای بەیتی:

**عشقت رسد بفریاد ور خود بسان حافظ**

**قرآن ز بر بخوانی در چهارده روایت**

لە شەرحی لاهوریدا شەڕابی دوو ساڵە بە (قورئان) لێکدراوەتەوە، لەم واتایەشدا نزیکە لە واتای بەیتی:

**صبح خیزی و سلامت طلبی چون حافظ**

**هرچه کردم همه از دولت قرآن کردم**

**٣ — آن نافەی مراد کە می خواستم ز بخت**

**در چینِ زلفِ آن بت مشکین کُلالە بود**

ئەو عەتری ئاواتەی کەلە بەخت داوام دەکرد، لە چینی پرچی ئەو بتە قژ لوولە میسکبارەدا بوو.

نافە مراد: نافە ئەوکیسە بچووکەیە کەمیسکی تێدایە واتە نافەی هیوا و ئارەزوو، ئاوات.

کلالە: پرچی لوول، کاکۆڵ.

واتە: ئەو هیوا و ئارەزووی کە وەك نافەی میسك گرانبەها و بەبەها بوو، لە بەختی خۆم داوا دەکرد، لە چین و لوولی پرچی ئەو یارە قژ لولە میسکبارەدا بوو، واتە هیوای من کردنەوەی پرچی لوولی یار بوو کە ئەمەش هەڵدانەوەی پەردە و حیجابی سەر ڕێگەی رووی مەعشوقە.

**٤ — از دست بردە بود خمارِ غم سحر**

**دولت مساعد آمد و می در پیالە بود**

سپێدە خوماریی غەم لەدەستیدا بووم، بەختی بێدار هات و شەراب لە پێکدا بوو.

از دست بردە بود: لەدەستیدا بووم، پەرێشانی کرد بووم، لەناو بردبووم

خمار غم: غەم کە وەك خوماری وا بوو.

خواجە لێرەدا غەمی بە حاڵەتی گێژ و وێژی دوای مەستی داوەتە قەڵەم و دەڵێ: بەیانی زوو غەم و خوماری ئەم منی پەرێشان کرد بوو باش بوو بەختی بێدار هاوکاری کردم و شەراب لە پیاڵە و پێکدا بوو لەو خوماری غەمە رزگاری کردم.

**٥ — بر آستانِ میکدە خون می خورم مدام**

**روزیِّ ما ز خوانِ کرم این نوالە بود**

لەبەر دەگاری مەیخانە بەردەوام خەفەت دەخۆم و عەزاب دەچێژم، رۆزی ئێمە لە خوانی کەرمەوە ئەم لوقمەیە بوو.

خوان: خوان، سفرە

نوالە: بەش، لوقمە، لەو بەشە خۆراکەی بۆ کەسێك دادەنرێت کە لەوێ نییە، حصە.

بەرلەوەی باس لە خوی بەیتەکە بکەین، لە جیاواز ساغکردنەوەکان ئەدوێین.

١ - لەو نوسخانەی کە میسراعی یەکەمیان بەم شێوەیەیە، (کرم)ی میسراعی دووەم بە (قدر) و (فلك) هاتووە.

٢ - لەشەرحی لاهوریدا ئەم بەیتە بەم شێوە هاتووە.



**خون می خورم و لیك نە جای شکایتست**

**روزی ما زخوان ازل این نوالە بود**

بەیتەکە چ لە ساغکردنەوەی گرووپی یەکەمدا — کە باوەڕ پێکراوترن — چ لە ساغکردنەوەی دووەمدا، باس لە رەزامەندی ملدانی خواجە دەکات بۆ بەشی خودایی. لاری لاهوری بەیتەکە واتە: خەم دەخۆم و بەڵام شیاوی شکات کردن نییە، چونکە رۆزی ئێمە لە سفرە و خوانی ئەزەلەوە هەر ئەم بەشە بوو.

لە نوسخە باوەڕپێکراوەکاندا بەردەرگای مەیخانەش زیادکراوە کە لە پای عەشقە، واتە من لە پای عەشقی بەردەوام لە عەزاب دام و خەفەت دەخۆم، بەڵام ئەمە بەشی خۆمە و لەلایەن کەریم و قەدەر و فەلەکەوە ئەم بەشەم پێدراوە و پێی رازیم.

**٦- هر کو نکاشت مهر و ز خوبی گلی نچید**

**در رهگذار باد نگهبان لالە بود**

هەرکەس خۆشەویستی نەچاند و گوڵێکی چاکی نەچنی، وەك ئەوە وایە کە گوڵاڵەی لە سەرەڕێ بادا دانا بێت.

نکاشت: نەچاند. نچید: نەچنی. رهگذار: سەرەڕێ، رەهگوزەر.

نگهبان لالە بود: لالەی دانا، هەڵگرت.

گوڵاڵە لەسەرەڕێ بادا دانان کاری بێ بنەماکردن و بێ مایەبوونی کارە، خواجەش دەڵێ: هەرکەس کە خۆشەویستی نەچاند و چاکەی نەچنی هیچ مایە و سەرەنجێکی لەژیاندا نییە و وەك ئەوە وایە کەگوڵاڵە لەسەرەڕێی رەشەبادا هەڵگرتبێت.

**٧ - برطرف گلشنم گذر افتاد وقت صبح**

**آن دم کە کار مرغ چمن آه و نالە بود**

کاتی بەیانی رێم کەوتە لای گوڵشەن، ئەو دەمەی کە کاری باڵندەی گوڵزار (بولبول) ئاه و ناڵە بوو.

برطرف: لای. گذر افتاد: رێم کەوتە.

واتای بەیتەکە پێشەکی بەیتی دواییە، دەمی بەیانی ئەوکاتەی کە کاری بولبول گریە و ناڵینە رێم کەوتە گوڵزار.

**٨ - گل بر جریدە گفتەی حافظ همی نوشت**

**شعری کە نکتەیش بە از صد رسالە بود**

گوڵ شیعری حافظی لە چڵ دەنوسی شیعرێك کە خاڵێکی چاکتر بوو لەسەر نامە (کتێب)

جریده: دەفتەر.          همی نوشت: دەنووسی.          نکتەیش: خاڵێکی.

رساله: کتێبی بچووك، نامیلکە.

واتە کە چوومە گوڵزار دیتم گوڵ شیعری حافظی لە چڵەکان دەنووسێ، ئەو شیعرانەی کە تەنیا خاڵێکیان لەسەد نامیلکە و کتێب چاکترە.

لە زۆربەی نوسخەکاندا ئەم غەزەلە (٩) بەیتە و بەیتی (٨ – ٩ ) بەم شێوەیەیە:

**٨ – دیدیم شعرِ دلکش حافظ به مدح شاه**

**یک بیت از این قصیده بِهْ از صد رساله بود**

**٩ – آن شاهِ تندحمله  که خورشید شیرگیر**

**پیشش  بــه  روزِ معرکه کمتر غزاله بود**

ئێمە لێرەدا پەیڕەویمان لە نوسخەی د.عیوض کردووە، کە بەڕای بەندە یەکێکە لە نوسخە نایابەکانی دیوانی خواجە، بەپێی رای جەنابیان ئەم بەیتەی دوایی لە نوسخە دێرینەکاندا بەرچاو ناکەوێت.



## غەزەلی دوو سەد و دوازدەیەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی مەقسور**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلان)**

**١ – به کویِ میکده یارب سحر چه مشغله بود**

**که جوشِ شاهد و ساقیّ و شمع و مشعله بود**

پەروەردگار سپێدە لە کوڵانی مەیخانەدا چ جەنجاڵێك بوو کە یار و ساقی و مۆم و مەشخەڵ هاتبووە جۆش و خرۆش.

مشغله: جەنجاڵی، سەرقاڵی.          مشعله: مەشخەڵ.

کاتێ سپێدەی بەیان یارانی مەیخانە لەتاو عەشقی حەق هاتبوونە جۆش و خرۆشێك کە جەنجاڵی زۆر کۆڵانی مەیخانەی عەشقی گرتووە، بۆیە خواجە بە سەرسوڕمانەوە دەڵێ: خوایە سپێدە لە کۆڵان و کوچەی مەیخانەی عەشقی حەقدا چ جەنجاڵی و سەرقاڵییەك هەبوو ئاوا یار و ساقی (مورشیدی کامل) و تەنانەت مۆم و مەشخەڵەکانی دەستیشیان هاتبوونە جۆش و خرۆش.

**٢ – حدیثِ عشق که از حرف و صوت مستغنیست**

**بەنالەی دف و نی در خروش ولوله بود**

باسی عەشق کە پێویستی بە حەرف و دەنگ نییە، بە ناڵەی دەف و نەی کەوتبووە خرۆش هەڵاوە.

صوت: دەنگ.          ولوله: هەڵا و هات و هاوار.

خواجە لەم بەیتەدا پەیوەندی نێوان عەشق و دەربڕینی عەشق دەکات، لەڕاستیدا عەشق چەمکێکی زەمینییە هەستی پێناکرێت و لە ئاستی قووڵدایە (وەك زمان) بۆ ئەوەی ئەم چەمکە بهێنرێتە ئاستی سەرەوە و رووکەشەوە (ئاستی هەست) پێویستی بە ئامراز هەیە، حەرف یا پیت ئامرازی نووسین و صوت یا دەنگیش ئامرازی گوتنی کە هەردووکیان ئاستی ژێرەوە بە ئاستی سەرەوە دەگەیەنن، خواجە پێی وایە کە عەشق پێویستی بەم دوو ئامرازە نییە کە بیهێنێتە سەرەوە ئەسڵەن ئەم دوو ئامرازە ناتوانن عەشق بهێننە ئاستی سەرەوە، ئەوەی کە عەشق ئەهێنێتە ئاستی سەرەوە دەف و نەی (سەماع)ییە، چونکە عاشقان لەعەشقەوە کەوتوونەتە سەماع (بەهاوکاری مۆسیقا) و ئەمەش بووتە زمانی عەشق.

بۆیە دەڵێ: کاتێ کە عەشقی حەق بەناڵەی دەف و مەی کەتبووە خرۆش وهات و هاوار و هەڵاوە ئیدی پێویستی بە دەنگ و پیت نییە. یاخود عەشق پێویستی بە حاڵە نەك بە قال و قاڵە.

**٣ — مباحثی که در آن حلقه‌ی جنون می رفت**

**واریِ مدرسه و قال و قیلِ مسئله بود**

با ساتێك کە لەو ئەڵقەی شێتییەدا دەخرانەڕوو، باڵاتربوون لە مەدرەسە و قیل و قالی مەسەلە.

مباحث: باك و خواست. حلقه : ئەڵقە، کۆڕ، مەجلیس.

واری: باڵاتر، بەرزتر. قال و قیل: قیل و قال، موناقەشە و موجادەلە لە شتێکدا.

(حلقەی جنون) کۆڕی سەماع و عەشقە کە واز لە بەرژەوەندی دەهێنن، خواجە ئەم کۆڕانە بە هەزار قالْ و مەدرەسە و قیل و قالەکانی دەزانێت.

واتە: کۆڕی عاشقان لە کوڕی عالمان و موناقەشە و موجادەلەیان چاکتر و باڵاترە.

**٤ - دل از کرشمه‌ی ساقی به شکر بود ولی**

**ز نامساعدی بختش اندکی گله بود**

دڵ لە ناز و عیشوەی ساقی سوپاسگوزار بوو، بەڵام لە خەواڵوویی (خراپی) بەختی خوێ کەمێ بەڵگەیی بوو.

به شکر بود: سوپاسگوزار بوو. نامساعدی: خەوڵوایی، خراپاندکی: کرێ. گله: گلەیی.

دڵی خواجە لەم بەیانییە نورانییە و ناز و کریشمەی ساقی (مورشید) سوپاسگوزار بوو، بەڵام لەوەی کە بەختی خۆی چاکی نەهێناوە و بەویساڵی ساقی نەگەیشتووە گلەیی هەبووە.

**٥ — قیاس کردم و آن چشم جاودانه‌ی مست**

**هزار ساحرِ چون سامریش در گله بود**

هەڵم سەنگاند و بەم ئەنجامە گەیشتم کە ئەو چاوە جادووگەرە مەستانە، هێندە جادووگەرە کە هەزار ساحیری وەك سامری لە بەردەستیدا بوو.

قیاس کردم: هەڵم سەنگاند، قیاسمکرد.

سامری: سامری، یەکێ لەو قەومەی موسا (د.خ) کاتێ کە موسا رۆیشت بۆ کێو بۆ دیداری حەق پاش خۆی سامیری ساحیر بازی فێڵباز خێڵەکەی خەڵەتاند و لە زێڕ گویرەکەیەکی بۆ دروستکردن کە لە ئەنجامی هەواوە دەنگی لێ دەهات و هۆزەکەی موساش کەوتنە پەرستنی.



لەڕاستیدا خێڵی موسا لە شوێنێکدا بوون کە خێڵەکانی دیکە شتیان دەپەرست بۆیە داوایان لە سامری کرد ئەو شتێکیان بۆ دروست بکات لەبەری خوا بیپەرەستن و ئەمیش گوێرەکەیەکی لە زێڕ بۆ دروستکردن کە دەنگی لێوە دەهات لە سورەتی (طه) دا باس لە (سامری) و گوێرەکەکەی کراوە لە ئایەتی (٨٨)دا دەفەرمووێ: ﴿فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلاً جَسَدًا لَهُ خُوَارٌ فَقَالُوا هَذَا إِلَهُكُمْ وَإِلَهُ مُوسَى فَنَسِيَ ﴾.

گله: کۆمەڵ، ران.

خواجە باس لە جادووگەری و سەرنجڕاکێشی چاوانی مەستی مەعشوق دەکات و دەڵێ: هێندە جادووگەرە کە ئەو سەرمەشقە و هەزار ساحیری جادووبازی کارامەی وەك سامری لە کۆمەڵەکەی ئەودان.

**٦ — بگفتمش به لبم بوسه‌ای حوالت کن**

**به‌خنده گفت کَیَت با من این معامله بود**

پێم گوت: ماچێك بۆلێوم بنێرە، بە خەندە گوتی کەی ئەم مامەڵەیەت لەگەڵ مندا هەبووە.

بگفتمش: پێم گوت. حوالت: بنێرە، حەواڵەکە.

پێم گوت ماچێکم (فەیزی جەزبەیەکم) بۆ حەواڵە بکە، بەخەندەوە گوتی کەی ئەم مامەڵە لە نێوانماندا هەبووە (ئاوا بێ شەرم ببیت).

ئەکرێ (ش — ی) لێرەدا بۆ ساقی بگەڕێتەوە، واتە بەساقیم گوت، یاخود بۆ خودی یار.

**٧ — ز اخترم نظری سعد در رهست که‌دوش**

**میان ماه و رخ یار من مقابله بود**

ئەستێرەی بەختم چاوی لێم دەبێ، چونکە دوێنێ شەوی رابردوو مانگ و رووخساری یارم کەوتبوونە بەرامبەر یەکتری.

اختر: ئەستێرە. سعد: خۆشی / خۆشبەختی.

مقابله: بەرامبەری کاتێ کە مانگ و خۆر بکەونە بەرامبەر یەکتری، کاتێ خێروخۆشی و بەختی چاکەم. خواجەش دەڵێ: مادام شەوی رابردوو مانگ و رووی یار کەوتنە بەرامبەری من، ئەوا بەختی من خێرم بۆ دەهێنێ و خۆشبەختی بەڕێوەیە.

**٨ — دهان یار که درمان درد حافظ داشت**

**فغان که وقت مروّت چه تنگ حوصله بود**

دەمی یار کە دەرمانی دەردی حافظی پێ بوو، هاوارکە کاتی جوامێری چەندە تەنگەلانی بوو.

مروت: جوامێری، پیاوەتی.        تنگ حوصله: تەنگەلای، بێ بواری.

دەمی یار کە ماچێکی دەبووە دەرمانی دەردی حافظ، کەچی پیاوەتی لەگەڵ نـەکردم و لـە کاتی جوامێریدا زۆر بێ بواربوو.



## غەزەلی دوو سەد و سێزدەیەم:

**بەحری هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەقسور**

**(مفعول مفاعیل مفاعیل مفاعیل)**

**١- آن یار کزو خانەی ما جایِ پری بود**

**سرتا قدمش چون پری از عیب بری بود**

ئەو یارەی کە بەبوونی ئەو ماڵی ئێمە شوێنی پەری بوو، سەرتاپێی وەك پـەری لـە عـەیب بەری بوو.

پری: حۆری.        سرتا قدم: سەرتاپێ، سەراپا.        بری: خاڵی.

از عیب بری بود: عەیبی تێدا نەبوو.

خواجە بە وەسفی یار دەست پێدەکات و دەڵێ ئـەو یـارەی کـە وەك پـەری سـەرتاپای بـێ بەرییە لە عەیب و هیچ عەیبی تێدا نییە و بوونی ئەو ماڵەکەی ئێمە ئەکاتە پەریستان.

د.خرمشاهی نووسـیویەتی کـە دەڵـێن: حـافظ ئـەم غەزەلـەی لـە پرسـە و خـەمی کـوڕە مردووەکەیدا نووسیوە. {حافظ نامە، ج ٢، ل ٧٦٦} {د. هرویش پێی وایـە کـە مەبەسـتی خواجە خێزانەکەی بێت ج ٢، ل ٩١٠}.

**٢ – دل گفت فروکش کنم این شهر به بویش**

**بیچارە ندانست کە یارش سفری بود**

دڵ گوتی: بە ئاواتی ئەوەوە لەم شارەدا دەمێنێتەوە، بێچارە نەیزانی کە یاری سەفەری بوو.

فروکش کنم: بارخستن، مانەوە.        بە بویش: بە ئاواتی، بەئومێدیەوە.

واتە دڵ کەزانی یار لەم شارەدایە گوتی، بە هیـوا و بەخۆشـی ئـەوەوە لـەم شـارەدا بارگـە دەخەم و دەمێنمەوە بێچارە نەیزانی کە یاری سەفەری بوو لەو شارەدا کە ئەم بەنیاز بـوو بـاری تێدا بخات نەدەمایەوە.

**٣ – منظور خردمند من آن ماه کە او را**

**باحسن ادب شیوەی صاحب نظری بود**

خۆشەویستی عـاقڵی مـن، ئەو مانگەی کە لەگەڵ جوانیدا بە ئـەدەب و خـاوەن را و ئـەهلی دانیشیش بوو.

منظور / مەبەست، مەقسود.        خردمند: عاقڵ، بەهۆش .        صاحب نظر: خاوەن ڕا.

واتە ئەو کەسەی کە منی مەبەستە باسی بکە و عاقڵ بوو، لەگەڵ ئەوەی وەك مانگ جوان بوو، بە ئەدەب و خاوەن ڕا و ماریفەتیش بوو.

**٤ — از چنگِ منش اخترِ بد مهر به در بُرد**

**آری چه‌کنم دولتِ دور قمری بود**

بەختی بێ ڕەحم لە دەستی منی رفاند، ئەرێ چی بکەم بەختی دەوری مانگی بوو.

اختر: لێرەدا بەواتای بەخت هاتووە، ئەستێرەی بەخت.

بدمهر: بێ ڕەحم، ناسازگار.

بەدربرد: دەرکرد، رفاند.

دورقمری: زاراوەی گەردوون ناسییە، گوایە حەوت هەزار ساڵە لە دەوری قەمەری ئێمەدا سەرەتا ئادەم هاتۆتە دونیا ژیانی ئێمە لە دەوری قەمەری دایە تا ئاخر زەمان، مەبەست لەوەیە کە ئاخرزەمانە و پڕە لە فیتنە. { د.هروی، ج ٢ ل ٩٠٨ }

دولت دور قمری: بەختی کەم تەمەنە یا بەختی زەمانی پڕ ئاشوب و فیتنەیە کە درێژەناکێشێ و لە کۆتاییدایە.

خواجە دەڵێ: ئەستێرە و گەردوون یا بەختی بێ ڕەحم ئەو خۆشەویستی لە دەستی من دەرهێنا و (بردیەوە) ئەرێ بەختی ئێمە لە دەوری مانگیدا بوو، تەمەنی زۆر کورت بوو.

**٥ — عذری بنه ای دل که تو درویشی و او را**

**در مملکتِ حسن سرِ تاجوری بود**

عوزرێکی بۆ بدۆزەرەوە ئەی دڵ، چونکە تۆ دەروێشی و ئەویش لە مەملکەتی جوانیدا نیازی سوڵتانی هەبوو.

عذری بنە: عوزرێکی بۆ بهێنەرەوە، بۆ بدۆزەرەوە.

تاجوری: سوڵتانی، پاشایەتی، تاجداری.

(سر تاجوری بود) بەواتای گەورەی تاجداران بوو یاخود بانگەشەی تاجداری و سوڵتانی دەکرد، واتە: ئەی دڵ کە یاری نازەنین زۆر گوێ بە تۆ نادات عوزرێکی بۆ بهێنەرەوە، چونکە ئەو لە مەملەکەتی جوانیدا پاشایە و پادشای جوانانە کەچی تۆ دەروێشێکی بێنەوایت.

**٦ — تنها نه ز رازِ دلِ ما پرده برافتاد**

**تا بود فلك شیوەی او پردەدری بود**

نە تەنها پەردەی لەسەر رازی دڵی من هەڵدایەوە، بەڵکو تا دنیا دنیایە، شێوازی ئەو پەردە لادەرە لەسەر نهێنییەکان.



برافتاد: لای دا، لای برد.

تابود فلك: تا گەردوون هەیە، تا دنیا و دنیا.

شیوە: شێوە، شێواز و ئسلوب.　　پردەدری: پەردەدڕی.

کاتێ یار ڕۆیشت (کۆچی کرد) بە کۆچی پەردەی لەسەر نهێنی و رازی دڵی ئێمە لادا، واتە هێندە گریام رازی عەشقم بڵاوبووەوە ئەوش بە کەموکورتی فەلەك دەزانێت کە ئسلوبی فەلەکە — وا دەکات هەمیشە پەردەی سەر رازەکان لادرێت و نهێنی خەڵکی ئاشکرا بێت.

لەم لێکدانەوەیدا مانای میسراعی دووەم بەم شێوەیەیە: تا گەردوون بمێنێت گەردوون شێوازی وایە کە پەردە لەسەر رازەکان هەڵدداتەوە. واتە (او) بۆ فەلەك دەگەڕێتەوە.

**٧ — اوقاتِ خوش آن بود که با دوست به سر رفت**

**باقی همه بی حاصلی و بی خبری بود**

کاتێ خۆشی (شادی) ئەو کاتە بوو کە لەگەڵ دۆستدا بەسەرمان برد، جگە لەوە هەمووی لە بێ بەرهەمی و بێ خەبەریدا بەسەر چووە.

بە سررفت: بەسەر چوو، تێپەڕی.　　بی حاصل: بێ بەرهەم.

خواجە بەرهەمە کاتییەکانی ژیانی بەوکاتانە دەزانێت کە لەگەڵ یاردا بووە وجگە لەوکاتانە هەمووی بەپوچ و بێ خەبەری و بێ ئاگایی دەزانێت.

**٨ — خوش بود لب آب و گل و سبزه و لیکن**

**افسوس که آن گنج روان رهگذری بود**

خۆش بوو کەناری جۆگە و گوڵ و سەوزایی، بەڵام بەداخەوە ئەو گەنجی گیانە (قارونە) سەرپێیی بوو.

سبزە: سەوزایی.　　روان: گیان، قارون.　　رهگذری / سەرپێیی، زوو تێپەڕی.

گەنج و سەروەتی قارون کە سەروەتێکی زۆر زۆر بوو، یاخود ئەو سەروەتەی کە وەك گیان خۆشەویستە گەنجی ڕەوان ئەکرێ یار بێت یاخود ئەوکاتە خۆشانە بێت لەگەڵ یاردا، لێرەدا زیاتر مەبەستی لە خۆشەویستی کۆچکردووە، کە دەڵێ: سەیرانی کەناری جۆگەلە و نێوگوڵ و گوڵزار خۆش بوو، بەڵام بەداخەوە ئەو خۆشەویستە کە وەك سەروەت و گەنجی گیان بوو (قارون بوو) بەپەلە بوو، زوو کۆچی کرد.

**٩ — خود را بکشد بلبل ازین رشک که گل را**

**با باد صبا وقت سحر جلوه‌گری بود**

بولبول لە حەسوودیدا خۆی دەکوژێت، چونکە گوڵ — کە مەعشوقیەتی — کاتی بەرەبەیان خۆی بۆ سروە نمایشکرد و کەوتە جیلوەگەری.

رشك: حەسوودی.

واتە بولبول کە خۆی بە مەعشوقی گوڵ دەزانێت لە حەسوودی و داخی ئەوەی کە دەمی بەرەبەیان گوڵ خۆی بۆ سروە نمایشکردووە و کەتووەتە جیلوەگەری و عیشوەگەری بۆی خۆی دەکوژێت.

**١٠ — هر گنج سعادت که خدا داد به حافظ**

**از یُمنِ دعایِ شب و درسِ سحری بود**

هەر گەنجینەیەکی خۆشبەختی کە خوادای بە حافظ لە سایەی نزای شەو و دەرسی بەرەبەیانییەوە بوو.

سعادت: خۆشبەختی، بەختەوەری.　　　　یمن: سایە، بەرەکەت.

دوو شت کە خواجە بەمایەی بەختەوەرییان دەزانێت و بەردەوام پشتیان پێ دەبەستێت، نزای شەوان و دەرسی بەرەبەیانە، بێگومان جاران فەقیهەکان هەر لە پاش نوێژی بەیانییەوە ئیدی مەدرەسەیان دەستی پێدەکرد و مەبەست لە دەرسی بەرەبەیان دەرسی قورئانە، خواجە لێرەدا دەڵێ: خوا هەر بەختەوەریەکی پێ بەخشیوم لەبەرەکەتی ئەو دوانەوە بووە.

لە هەندێ نوسخەدا لەبری (درس) (ورد) هاتووە کە جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە.



## غەزەلی دوو سەد و چواردەیەم:

**بەحری هەزەجی شەشی مەقسور**

**(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیل)**

**١ - مسلمانان مرا وقتی دلی بود**

**که با وی گفتمی گر مشکلی بود**

موسڵمانان من کاتێ هەبوو کە من دڵێکم هەبوو، کە ئەگەر موشکیلەیەکم هەبوایە بەوم دەگوت و لەگەڵیدا باسمدەکرد.

گفتی: دەمگوت.

مشکل: گرفت، موشکیلە.

خواجە ئێستا دڵی نەماوە و دڵی لەدەستداوە، بۆیە لەکاتی رابردوو دەدوێت و دەڵێ: موسوڵمانینە رۆژگارێ هەبوو کە من دڵێکم هەبوو، کە ئەکرێ لێرەدا ئاگایی بێت، چونکە ئێستا ئەو لە بێئاگایدا -محو و فنا- بوایە.　　　کە ئەگەر گرفت و موشکیلەیەکم هەبوایە لای ئەو باسمدەکرد و پرس و راوێژم پێدەکرد.

**٢ — به گردابی چو می افتادم از غم**

**به تدبیرش اُمیدِ ساحلی بود**

کاتێ کە دەکەوتمە گێژاوێکی غەمەوە بە تەکبیر و راوێژ ئەو ئومێد کەنارێك هەبوو.

گرداب: گێژاوی نێو دەریا.　　　　می افتادم: دەکەوتم.

دیسان لە ئاگایی دڵ ئەدوێ کە بە بیرکردنەوە و تەکبیرکردنی پێی خواجەی لە غەم رزگار کردووە و خواجە دەڵێ: کاتێ کە دەکەوتمە گێژاوی غەمەوە بە بوونی بیر و تەکبیری چاکی دڵم ئومێدی کەناری رزگاری لە خەم هەبوو.

**٣ — دلی همدرد و یاری مصلحت بین**

**که استظهارِ هر اهلِ دلی بود**

دڵێکی هاودەرد و یار و یاوەری مەسڵەحەت بین، کەپشت و پەنای هەر ئەهلی دڵێك بوو.

همدرد: هاودەرد، هاوخەم.　　　　یار: یار و یاوەر.

مصلحت بین: مەسڵحەت بین، بەرژەوەندی ویستی دۆستان.

استظهار: پشت قایم، پەنا.

دڵێکم هەبوو کە هاوخەمم بوو، یاوەرێك بوو کە دەیزانی بەرژەوەندیم لە کوێدایە و بەرژەوەندی منی دەویست، هێندە چاکەخواز بوو، کە پشت و پەنای من بەتەنیا پشت قایمی هەمموو ئەهلی دڵان بوو.

لەڕاستیدا گەر ڕەوانبێژی شیعری کلاسیك بکەینە پێوەر بە پێی هونەری (ردالقافیە) پێویستە ئەم بەیتە لە جێگەی بەیتی دووەمدا بێت، چونکە ((ردالقافیە)) هێنانی وشەی قافیەی میسراعی یەکەم (صدر)ی بەیتی یەکەم (مطلع)ە لە قافیەی میسراعی دووەم (عجز)ی بەیتی دووەمدا واتە: (دلی بود)ی میسراعی یەکەم لە قافیەی (دلی بود)ی ئەم بەیتەدا هاتووە و پێویستە ئەم بەیتە بەیتی دووەم بێت.

**٤- ز من ضایع شد اندر کوی جانان**

**چە دامنگیر یارب منزلی بود**

ئەو دڵەم لە کۆڵانی جاناندا لە دەست چوو، خواجە کوچەی جانان چ مەنزلێکی ڕێگر بوو.

ضایع شد: لە دەست چوو

دامنگیر: ڕێگر، گرفتاری، هەرشتێ کە مرۆڤ والێ بکات کە نەتوانێ بڕوات و دەستی لێ هەڵگرێت، دڵگیر و سەرنجڕاکێش.

ئەو دڵەی کە خواجە لە سێ بەیتی پێشوودا لە کاتی ڕابردوودا لە چاکی و کارامەیی دەدوا لێرەدا سەرەنجام و چارەنووسەکەی دەردەکەوێت، ئەو دڵە گرفت چارەسەرکەرە و پشت و پەنا و هاوخەم و خاوەن تەکبیر، لە دوای عەشقی یاردا لە خواجە ون بووە، بۆیە دەڵێ: ئەو دڵەم لە کووچە و کۆڵانی عەشقی یاردا لە دەستچووە، بەڕاستی کووچە و کۆڵانی عەشق و مەعشوق زۆر دڵگیر و سەرنجڕاکێشە واهەرکەسێك بچێتە ئەو کووچەیە ئیدی توانای نییە لە عەشقی ئەو دەرچێت و گرفتاری عەشقی یاری حەق دەبێت.

**٥ — هنر بی عیبِ حرمان نیست لیکن**

**زمن محرم تر کی سائلی بود**

هونەری عەشق بێ عەیبی مەحرومی نییە، بەڵام چ فەقیر و گەدایەك لە من مەحروم تر بوو.

عیب حرمان: عەیبی مەحرومی، بێ بەشی و دابڕان. سائل: گەدا، سواڵکەر.

خواجە لەم بەیتەدا دان بەوەدا دەنێ کە ئەو لە پێناو فەزڵ و هونەردا (هونەری عەشق و عیلم) زۆر عەزاب و نارەحەتی چەشتووە و کەسی پێناگات، دەڵێ: ڕاستە هونەری عەشق و عیلم بەبێ مەحرومی لە خۆشی و شادی بەدەست نایەت، بەڵام بەندە لەم ڕێیەدا هێندە مەحرەم بووم و زەجرم کێشاوە کە لە سواڵکەر و گەداش مەحروم ترم.



**٦ — برین جانِ پریشان رحمت آرید**

**کە وقتی کاردانی کاملی بود**

ڕەحم بەم گیانە پەرێشان و پەشێوە بکەن، چونکە کاتێك کارزانێکی کامڵ بوو.

برین: بەم رحمت آرید: ڕەحم بکەن کاردان: کارزان، عاقڵ.

پاش ئەوەی کە خواجە لە کووچەی عەشقی یاردا دڵی لەدەستدا ئیدی گیان و حاڵی پەرێشان بوو، بە موسڵمانان دەڵێ: ڕەحم بەم گیانە پەشێوە بکەن — یاخود ڕەحمەتی بۆ بنێرن — چونکە سەردەمێ بوو کە ئەویش لەنێو ئێوەدا کارزانێکی کامڵ و ڕێك و پێك بوو.

**٧ — مرا تا عشق تعلیم سخن کرد**

**حدیثم نکتەی هر محفلی بود**

لەوکاتەوەی کە عەشق منی فێری قسە کرد، قسەم بووە کاکڵ و قسەی نەستەقی هەر کۆڕێك.

تا: لەوکاتەوەی. تعلیم کرد: فێر کرد.

لەوکاتەوەی کە عەشق منی فێری قسە کردووە و من لە عەشق و شیعر دەڵێم شیعرەکانم هێندە بەپێز و بەهابوون — یا بەهێز بوون — بوونەتە قسەی نەستەق و کاکڵداری هەر کۆڕ و کۆبوونەوەیەك.

**٨ — مگو دیگر کە حافظ نکتە دان است**

**کە ما دیدیم و محکم غافلی بود**

ئیدی مەڵێ حافظ قسە زانە، چونکە ئێمە تاقیمان کردەوە و بینینمان زۆر بێ ئاگا و نەزان بوو.

نکتەدان: قسەزان، قسەی جوان و پڕمانازان. دیدیم: تاقیمان کردەوە.

محکم: مەحکەم، زۆر، بەتەواوی.

خواجە لەم بەیتەدا زەمی خۆی دەکات — وەك ئەوەی بلێی دوچاری غرور نەبێت — و دەڵێ، ئیدی بانگەشەی قسەزانی حافظ مەکە، چونکە واش نییە، ئێمە خۆمان تاقیمان کردەوە هیچی نەدەزانی.

## غەزەلی دوو سەد و پازدەیەم:

**بەحری ڕەمەلی هەشتی مەحزوف**

**(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)**

**١ – در ازل هرکو به فیض دولت ارزانی بود**

**تا ابد جام مرادش همدم جانی بود**

لە ئەزەلدا هەرکەس شایستەی ڕێزی بەخت و ناوچاو بوبێت، تا ئەبەد پێکی مورادی هاودەمی خۆشەویستە.

ارزانی بود: شایستەبوو، شیاو بوو، پێی درا، پێی بەخشرا. همدم: هاودەم.

جانی: گیانی، واتە یاری خۆشەویست وەك گیان.

خواجە وەك هەمیشە کە لە چارەنووس ئەدوێت، بیروباوەڕی ئەشعەرییانەی خۆی دەخاتەڕوو، ئەو بڕوایەی کە قەڵەمی قەدەر لە ئەزەلدا لە نێو چاوی مرۆڤەکاندا تەواوی هێڵ و وردەکارییەکانی کێشاوە، بۆیە هەر لەو ڕۆژەوە بڕیاری خۆشبەختی یا بەدبەختی دەردەچێت و بە تەختی ناوچاوانەوە دەنووسرێت یا خود بە عیلمی پەروەردگار لە ژیانی نێو دونیایان کە چاکە یا خراپەکارن هەر ئەو ڕۆژە لەسەرکرداری خۆیان چارەنووسیان دەنووسرێت، لەهەربارێکدا تەختی نێو چاومان هەرلە ئەزەلەوە نووسراوەتەوە. لەم باوەڕەوەیە خواجە دەڵێ: هەرکەس لە ئەزەلدا بەشیاوی بەخت و خۆشبەختی زانرابێت و ئەوەی لە نێو چاوان نووسرابێت ئەوا تائەبەد پێکی موراد و ویستی هەمیشە هاودەمی جان و خۆشەویستە، یاخود پێکی موراد و ئارەزووی هەمیشە وەك گیان لێی نزیکە لێ جودا نابێتەوە.

**٢– من همان ساعت که از میْ خواستم شد توبه‌کار**

**گفتم این شاخ ار دهد باری، پشیمانی بود**

من هەرئەو ساتەی کە دەمویست تۆبە لەمەینۆشی بکەم گوتم، گەر ئەم لقە بەرێك بدات پەشیمانییە.

شاخ: لق. ار: ئەگەر. دهد: بدات،بگرێت (لێرەدا). باری: بەرێك، میوەیەك.

خواجە لێرەدا تۆبە کردن لە مەینۆشی بە لقەدارێك داناوە کە ئەگەر بێت و ئەو لقە دارە بەرێك بگرێت یا میوەیەك بدات، ئەو میوەیە جگە لە پەشیمانی هیچی دیکە نابێت.

ئەو دەڵێ: من هەر ئەوساتەی کەویستم واز لە مەینۆشی – عەشقی ئیلاهی – بهێنم و تۆبە لە عاشقی بکەم گوتم – وابیرم کردەوە – کەئەم تۆبە کردن و پەشیمان بوونەوەیە لەعەشق گەر لقە دارێك بێت هیچ بەرهەمێکی نابێت گەر بەرهەم و بەرێکیشی هەبێت پەشیمانییە.



واتە هەرئەوساتەی ویستم واز لە عەشقی ئیلاهی بهێنم زانیم کە پەشیمانی لەودایە.

**٣– خود گرفتم کافکنم سجّاده چون سوسن به دوش**

**همچو گل بر خرقه رنگِ میْ مسلمانی بود؟**

گریمان وەك سەوسەن بەرماڵم کردە کۆڵ (دابەسەرشاندا) ئەمەموسڵمانییە؟ کە ڕەنگی مەی وەك گوڵ بەسەر خرقەکەمەوەیە.

خود گرفتم: گریمان. سجاده: بەرماڵ. دوش: شان.

گوڵاکانی گوڵە سەوسەن بۆخوارەوە شۆڕ دەبنەوە، حافظ ئەم گەڵایانە بە بەرماڵی سەرشان داوەتە قەڵەم دەڵێ: گریمان خۆم بە موسڵمان دایە قەڵەم و وەك سەوسەن بەرماڵم کردە کۆڵ، ئەی چی لەو پەڵە سوورانەی شەڕاب بکەم کە ئەڵێی گوڵن بەسەر خرقەکەمەوە. ئەمەکەی موسڵمانییە.

لەبەیتی پێشودا کە دەڵێ وازهێنان لە عەشقی ئیلاهی پەشیمانی لەودایە، لێرەدا درێژە بەو وازهێنانە دەدات و دەڵێ گریمان وازیشم لە عەشقی ئیلاهی هێنا و وەك سۆفیلکە درۆزنە ڕەسمییەکان بەرماڵم – کە ڕەمزی ریا و ڕواڵەتی دینە- دابەشاندا ئەی چی لەو هەموو نیشانەیەی عەشق بکەم کە پێمەوە دیارە و دەڵێی گوڵن.

**٤– بی چراغِ جام در خلوت نمی یارم نشست**

**زانکه کُنجِ اهلِ دل باید که نورانی بود**

ناوێرم بەبێ چرای پێك لە تەنیاییدا دانیشم، چونکە دەبێ کونجی ئەهلی دڵ نورانی بێت.

نمی یارم نشست: ناوێرم دانیشم.

خواجە لێرەدا پێکی شەڕاب - عەشق- بە چرای تاریکی دەزانێت و دەڵێ: من کە گۆشەگیری دەکەم و لە گۆشەی تاریك و خەڵوەتدا دادەنیشم بەبێ پێکی شەڕاب - عەشق- کەچرایەکی ڕووناکە ناوێرم دانیشم و کات بەسەربەرم چونکە پێویستە گۆشە و کونجێ کە ئەهلی دڵ - عارفان – تیایدا مەشغوڵی عەشقن و جگە لە مەعشوقی حەق لە هەموو شتێ دوورەپەرێزن ڕووناك و نورانی بێت و ئەوەش بە چرای عەشق – مەی – دەبێت.

**٥– همّت عالی طلب جام مرصّع گو مباش**

**رند را آبِ عِنَب یاقوتِ رُمّانی بود**

داوای هیمەت بەرزی بکە، گەر پێکی رازاوە نەبوو، بانەبێ، لای ڕەند ئاوی ترێ، یاقوتی رومانییە.

مرصع: رازاوە، رازاندنەوەی پێکی شەڕاب بە بەردی گرانبەها.       گومباش: بانەبێ، گوێی مەدەرێ.

آب عنب: ئاوی ترێ، شراب.       یاقوتی رمانی: جۆرە یاقوتێکی گرانبەهایە کە وەك دانەی هەنار سوور و ئاڵە.

خواجە بەرەند وعاشقان دەڵێت گرنگ رووخسار نییە بەڵکو گرنگ ناوەڕۆکە، گرنگ ئەوەیە مەی بنۆشی و خەریکی عەشق بیت نەوەك خەریکی سوڵتانی و زرق و برق، بۆیە داوای هیمەت بەرزی بکە، کاتێ کە پێکی رازاوە نەبوو، گوێ مەدەرێ و پێکی رازاوە مەکە بەشەرتی مەینۆشی، چونکە لای رەند ئاوی ترێ شەڕابی قیمەتی یاقوتی رومانی هەیە.

واتە: تۆ هیمەت بەرز بە و خۆشی و سوڵتانی مەکە بە مەرجی عەشقی ئیلاهی، چونکە عارفی راستەقینە ئەو عەشقە لە هەمووشتێ بەنرخ ترە.

**٦- گرچە بی سامان نماید کارِ ما سهلش مَبین**

**کاندرین کشور گدائی رشكِ سطانی بود**

گەرچی کاری ئێمە وادێتە بەرچاو کە کارێکی بێ سوودە، بەسووکی سەیری مەکە، چونکە لەم وڵاتەدا گەدایی مایەی حەسوودی سوڵتانە.

بی سامان: بێ سوود و بێ مایە و قازانج.       نماند: دەرکەوێت، بێتە بەرچاو.

سهلش مبین: بەسووکی سەیری مەکە.       کشور: وڵات.

کاری ئێمە لەم بەیتەدا کاری عەشق و عاشقییە و ئەم وڵاتەش وڵاتی عەشقە، خواجە بە رەخنەگران —سۆفیلکەکان — دەڵێ: گەرچی لە رواڵەتدا وادیارەکە ئەم کارەی ئێمەی رەندان هیچ مایە و قازانجێکی نییە، بەڵام بەسووکی سەیری مەکە چونکە لە ناوەڕۆکدا وانییە و لەم وڵاتی عەشقەدا هێندە خۆشبەختین، پاشا و سوڵتان حەسوودییان بە حاڵی گەدامان دێت.

**٧- نیکنامی خواهی ای دل با بدان صحبت مدار**

**خودپسندی جانِ من برهانِ نادانی بود**

ئەی دڵ گەر پیاوچاکیت دەوێت هاوڕێیەتی خراپان مەکە، گیانەکەم خۆپەسەندی بەڵگەی نەزانییە.

نیکنامی: پیاوچاکی، ناوبانگی چاکی.       بدان: خراپەکاران، بەدان.

صحبت مدار: هاوڕێیەتی مەکە.       برهان: بەڵگە.       نادانی: نەزانی.

خواجە ئامۆژگاری دڵی خۆی بەوەدەکات کە هاوڕێیەتی پیاوخراپ سەرئەنجامی چاکی نابێت و خۆپەسەندی و فیزیش خۆی لە خۆیدا گێلی و نەزانییە، بۆیە دەڵێ: ئەی دڵی من گەر



دەتەوێ ناوبانگی پیاوچاکیت بڕوات لەگەڵ خراپەکاراندا مەبە بەهاوڕێ و وازلە خۆپەسەندی بهێنە چونکە گیانەکەم خۆپەسەندی بەڵگەی نەزانی وگێلییە.

**٨- مجلس انس و بهار و بحثِ شعر اندر میان**

**نَسْتَدَن جامِ می از جانان گرانجانی بود**

کۆڕی هاودەمی و بەهار و باسی شعیرلە ناودا بێت، وەرنەگرتنی جامی مەی لەدەستی مەحبوب، نیشانەی بێ زەوقییە.

نستدن: وەرنەگرتن، لێ نەسەندن.       گرانجان: بێ زەوقی، ئێسك گرانی.

گەر لە بەهاری عەشقدا کۆڕی ئونس و ئولفەتی یاران بێت و باسی شیعر لە ئارادابێت، کەسێك بەم حاڵەوە پێکی مەی لەدەستی یاری حەق وەرنەگرێت — نەچێتە دونیای عەشقەوە — نیشانەی بێ زەوقییە.

**٩- دی عزیزی گفت حافظ می خورد پنهان شراب**

**ای عزیز من نه عیب آن بَهْ کە پنهانی بود؟**

دوێنێ کاتێ کەسێك گوتی حافظ لەژێرەوە خەریکی مەینۆشی (عەشق)ە منیش گوتم ئەی برادەری ئەزیز تۆکە پێت وایە شەڕاب نۆشی عەیبەیە واچاکتر نییە کە بە ئاشکرا نەخورێتەوە؟

## غەزەلی دوو سەد و شازدەیەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی مەقسور**
**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلان)**

**١- کنون کەچمن آمد گل از عدم به وجود**
**بنفشه در قدم او نهاد سر به سجود**

ئێستا کە لە گوڵزاردا گوڵ لە عەدەمەوە هاتە بوون، وەنەوشە لەبەر پێیدا سەری کڕنوشی خستە سەرزەوی.

واتە کە گوڵ لە چەمەندا سەری دەرهێنا و پەیدا بوو، وەنەوشە لەبەر پێیدا کڕنوشی رێز و گەورەیی برد.

وەك لە بەیتی (٩)یەمدا دەردەکەوێت حافظ ئەم غەزەلەی بۆ وەزیری پایە بەرز، عمادالدین محمود نووسیوە کە وزیری شاشێخ ئەبوئیسحاق بوو و زەوقی شاعیرانەی هەبوو، لە کۆڕی ئەودا باسی شیعر و شاعیری دەکرا. {از کوچەی رندان، ل٢٤ - د.عبدالحسین زرینکوب، چاپ هشتم، سال ١٣٧٧، انتشارات امیرکبیر، تهران}.

لاهوری نووسیویەتی ئەم غەزەلە بەبۆنەی هاتنیەوە بۆشیراز نووسراوە.

بەهەرحاڵ ئەوەی بەگۆڵ دراوەتە قەڵەم کە لە کاتی سەوزبوونیدا - هاتنیدا- وەنەوشەکان سەری رێزی بۆدادەنەوێنن.

**٢- بنوش جام صبوحی به نالەی دف و چنگ**
**ببوس غبغبِ ساقی به نغمەی نی و عود**

بەناڵەی دەف و چەنگەوە جامی بەیانی بنۆشە و بەئاوازی نەی و عودیشەوە غەبغەبەی ساقی ماچ کە.

ببوس: ماچ کە.

غبغب: غەبغەبە.

عمادالدینی وەزیر بەیەکێ لەوەزیرە شاد و کراوە و خۆشگوزەرانی خوازەکان دراوەتە قەڵەم بۆیە خواجە هەرلەوەسفی ئەودا دەڵێ: ئێستا کە ئەو هاتووە مەینۆشی و ساقی ماچکردن ئازادە و کەس دەست ناهێنێتە رێگەی بۆیە بەبانگی ئاشکرا و بەناڵەی دەف و چەنگ و ئاوازی نەی و عودەوە پێکی بەیانی هەڵدە و غەبغەبەی ساقی ماچکە.



**٣- به دورِ گل منشین بی شراب و شاهد و چنگ**
**که همچو دورِ بقا هفتەای بود معدود**

لەسەردەمی گوڵدا بێ شەراب و یار و چەنگ دامەنیشە، چونکە ئەم سەردەمە وەك ژیان چەند هەفتەیەکی دیاریکراوە.

بەدور: لەسەردەمی. منشین: دامەنیشە. بقا: ژیان، مانەوە.

معدود: ژمێردراو، دیاریکراو.

بەمرۆڤ یا دڵی دەڵێت لە سەردەمی گوڵدا بەهارە بێ شەراب و یار و چەنگ ژیان بەسەرمەبە چونکە ئەم سەردەمە زۆر کورتە و وەك ژیانی مرۆڤ چەند هەفتەیەك زیاتر نییە.

**٤- شد از خروجِ ریاحین چو آسمان روشن**
**زمین به اختر میمون و طالع مسعود**

بە دەرهاتنی رێحان و گوڵ و گیا- زەوی بەبەخت چاکی و ناوچاوهینییەوە — وەك ئاسمان رووناك بووەوە.

خروج: دەرهاتن، سەوز بوون و روان. ریاحین: رێحانەکان، گوڵ وگیای بۆنخۆش.

اخترمیمون: بەخت چاکی. طالع مسعود: بەختی چاك، ناوچاوی باش.

واتە زەوی کە بەختی چاکی هێنا و ناوچەوانی چاکی بۆرێکخست، بەهۆی سەوزبوونی گوڵ و رێحانەوە وەك ئاسمان درەوشایەوە.

**٥- ز دستِ شاهدِ نازك عذارِ عیسی دم**
**شراب نوش و رها کن حدیثِ عاد و ثمود**

لەدەستی یاری رووخسار ناسك و عیسا نەفەس شەراب وەرگرە و بنۆشە واز لەباسی عاد و سەمود بهێنە.

عذار: رووخسار. رهاکن: وازبێنە.

عاد: ناوی قەبیلەیەکە کە حەزرەتی هود (د.خ) پێغەمبەری ئەوانە

ثمود: ناوی قەبیلەی حەزرەتی صالح (د.خ) بێت.

خوای گەورە لە قورئاندا چەندین جارباسی ئەم خێڵانەی کردووە وەك لە سورەتی (الاعراف) ئایەتی (٦٥)دا دەفەرمووێ ((والی عاد اخاهم هوداً، قال یاقوم اعبدوا الله مالکم من اله غیره، افلاتتقول)) هەروەها لە ئایەتی (٧٣) ی هەمان سورەتیشدا دەفەرمووێ ((والی ثمود اخاهم صالحاً...))

خواجە لەم وەرگرتنەدا مەبەستی لەوەیەکە ئامۆژگاری عاشقان بکات کە مەشغۆلی خودی مەعشوق بن و واز لە بەسەرهات و رووداوە مێژووییەکان بکەن تۆ ئەی عاشق پێکی شەراب — عەشق — لە دەستی یاری جوانی زیندووکەرەوە وەرگرە و بینۆشە و واز لە باس و خواسی عاد و سەمود بهێنە.

**٦- جهان چو خلدِ برین شد بەدورِ سوسن وگُل**

**ولی چە سود کە دروی نە ممکن است خلود**

لە سەردەمی سەوسەن و گوڵدا جیهان وەك بەهەشتی بەرینی لێهات بەڵام چ سوودی هەیە کە تیایدا نەمری مەحاڵە.

خلدبرین: بەهەشتی بەرین.

واتە: گەرچی جیهان لەم بەهارەدا بەگوڵی زەرد و سوور رازاوەتەوە و لە بەهەشت دەچێت، چ سوودێکی هەیە کە ناکرێ تیایدا نەمرین و هەرئەبێ بەجێ بهێڵین.

**٧- چو گل سوار شود بر هوا سلیمان وار**

**سحر کە مرغ درآید بە نغمەی داود**

سپێدە کە گوڵ سولەیمان ئاسا سواری هەوا دەبێ (بۆن بڵاودەکاتەوە) ئەوکاتە کە بولبول ئاوازی داودی دەڵێت.

سلیمان وار: سولەیمان ئاسا.

سواربوونی هەوا وەك سولەیمان و ئاوازی وەك داود، یادخەرەوەی حەزرەتی سولەیمان و داودن (د.خ) چونکە حەزرەتی سولەیمان سواری با دەبوو، حەزرەتی داودیش (د.خ) دەنگی زۆر خۆشبووە.

باسی بەیانی گوڵزار دەکات، ئەوکاتەی کە گوڵ بۆنی سواری پشتی هەوا دەکات و بڵاوی دەکاتەوە بولبولیش بەدەنگی خۆشی داود دەخوێنێت.

**٨- بە باغ تازە کن آئینِ دینِ زردشتی**

**کنون کە لا لە برافروخت آتش نَمرود**

لەباغدا رێورەسمی ئاینی زەردەشتی تازەکەرەوە، ئێستاکە گوڵاڵە ئاگری نەمرودی هەڵگیرساندووە.

بەباغ: لە باغدا.          تازەکن: تازەکەرەوە.          آیین: رێورەسم.

زردشت: زەردەشت پێغەمبەر، خاوەنی ئایینی زەردەشتی و کتێبی ئاڤێستا، دواتر ئایینەکەی بەئاگرپەرستی و مەێنۆشی ناسرا — بەتایبەتی لای موسڵمانەکان -.



برافروخت: هەڵگیرساند، داگیرساند.

نمرود: پاشای بابل بوو لە سەردەمی حەزرەتی — ئیبراهیم — دا (د.خ) کە بڕیاری ئاگرکردنەوەی بۆحەزرەتی ئیبراهیم دەرکرد و خۆی بە خودا ئەزانی.

مەبەست لە ئاگری نەمرودی بە ئاگری بڵێسەدار و گەورەیە، لێرەدا کە گوڵاڵە ئاگری نەمرودی هەڵگیرساندووە، واتە گەش و سووربۆتەوە.

**٩- بخواه جامِ صبوحی بە یادِ آصف عهد**

**وزیرِ کلك سلیمان عمادِ دین محمود**

بەیادی ئاسەفی سەردەم، وەزیری موڵکی سولەیمان، عیمادەدینی مەحموود، پێکی بەیانی داواکە.

آصف: وەزیری حەزرەتی سولەیمان.

لێرەدا بە ئاشکرا باس لە گەورەیی عمادالدین محمود دەکات.

**١٠- بود کە مجلسِ حافظ بە یمنِ تربیتش**

**هرآنچە می طلبد جملە باشدش موجود**

ئومێد دەکرێ کە لەسایەی چاکەیەوە کۆڕی حافظ هەرچی داوا دەکات هەمووی بۆ جێبەجێ کرێت.

تربیت: چاکە، بەسەرکردنەوە          می طلبد: داوادەکات.

واتە: ئارەزووم وایەکە هەرچی کەموکورتیم هەیە، خواجە عیمادەدین بۆم دەستەبەر بکات.

ئەوەی شیاوی ئاماژە پێدانە لەم غەزەلەدا، ساغکردنەوەی غەزەلەکەیە ئەم غەزەلە لە هەندێ نوسخەدا وەك نوسخەی (عیوضی) (٩) بەیت و لە هەندێ نوسخەی وەك نوسخەی (لاهوری) تەنیا (٥) بەیتە، لە نوسخەی (د.عیوضی) دا بەیتی تخلص نەهاتووە، کە ئەمە بۆخۆی گومان لە تەواوی غەزەلەکە و دانەپاڵ حافظی دروستدەکات. جگە لەمانە لە رێکخستنی بەیتەکانیشدا پێش و پاش کراوە و هاوڕایی نییە.

## غەزەلی دوو سەد و هەڤدەیەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەب مەکفوفی مەحزوف**
**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن)**

**١- از دیده خونِ دل همه بر روی ما رود**
**بر رویِ ما ز دیده چه گویم چه‌ها رود**

لە چاوانەوە بەردەوام خوێنی دڵ بەروماندا دێت، چی بڵێم، لە چاوانەوە چی بەسەر رووی ئێمە داهات.

بروی ما: بەسەر رووی ئێمەدا.

(رود) بە واتای بەسەردا هاتن دێت کە لە بەیتەکەدا بە هەردوو واتای ماددی و مەعنەوی بەکارهاتووە، لە میسراعی یەکەمدا بەسەرهاتن ماددیانەیە بەڵام لە میسراعی دووەمدا بەسەرداهاتن مەعنەوییە و واتای روان و بەسەراهاتنە.

واتە: چاوانم فرمێسکی خوێن دەبارێنێت و ئەم خوێناوەی دڵم بەسەر گۆنا و رووخسارمدا دەرژێنێت، چی بڵێم و باسی چی بکەم، کە رووی من لە دەست چاوانم کەوتووەتە چ حاڵێکەوە و رۆحی بەسەرهاتووە.

**٢- ما در درونِ سینه هوایی نهفته‌ایم**
**برباد اگر رود دلِ ما زآن هوا رود**

ئێمە لەنێو سنگماندا ئارەزوویەکمان شاردۆتەوە، گەر دڵمان بەبادا لە پێناو ئەو ئارەزووەدا بەبا چووە.

هوایی: ئارەزوو، ئارەزوویەك.    نهفته‌ایم: شاردۆتەوە.

برباد رود: بەبابدرێت، لەدەست بدرێت، بەخت کرێت.

خواجە چ لە بەیتی یەکەم و چ لەم بەیتەشدا جێناوی کەسی یەکەمی کۆ (ئێمە)ی هێناوە کە مەبەستی لە ئێمە عاشقان و عارفانە، لێرەدا دەڵێ ئێمەی عاشقان هەوا و ئارەزوویەکمان لە دڵماندا شاردۆتەوە گەر رۆژێك لە رۆژان دڵمان (یاخۆد سەرمان وەك لە هەندێ نوسخەدا هاتووە) لەدەست دا بێگومان لە پێناو ئەو ئارەزووەدا لەدەستمان داوە.

**٣- برخاك راهِ یار نهادیم رویِ خویش**
**بر رویِ ما رواست اگر آشنا رود**

رووی خۆمان لە سەرخاکی رێی یاردا دانا، رەوایە گەرئەو یارە ئاشنایە بەسەر رووماندا بڕوات.



نهادیم روی خویش: رووی خۆمان داناواتە: بەتەواوی تەسلیم بووین و بووینە خاکی سەرەڕێی.

رواست: شایانە، رەوایە، شایستەیە.

لەڕاستیدا ماناکانی (رەوا) واتای جیاواز بە بەیتەکە دەدات، بۆنموونە: کە ئێمە رووی خۆمان لەسەرخاکی بەرپێی یاردانـاوە، بە ئومێدی ئەوەی یـارپێ بەسەرماندا بنێ، گەر بەسەرماندا بڕوات کارێکی شایستە و چاکی کردووە، یاحەقی خۆیەتی و رەوایە. یاحەقمان وایە بەو شەرەفە شاد بین کەیار بەسەرماندا بڕوات. دواجار واتە: ئێمە بەیەکجاری تەسلیمی ئەویارە بووین هەرچیمان لێدەکات شایانیەتی و رەوایە، لێرەدا خواجە باس لە تەسلیم بوونی تەواوی یەکجاری عاشقان و رەزامەندییان دەکات بۆیار و کردەوەکانی یاری حەق.

**٤- سیل است آبِ دیده و بر هر که بگذرد**
**گر خود دلش ز سنگ بود هم ز جا رود**

ئاوی دیدە لافاوە و بەسەر هەر کەسدا بڕوات / گەردڵیشی لە بەرد بێت، لەجێ هەڵی دەکەنێت.

سیل: لافاو.    بر هر که: بەسەرهەرکەسدا.

ز جا رود: لەجێ هەڵی دەکەنی، دەیلەقێنێ، واتە کاریگەریی لەسەردەبێت و تەسلیم دەبێت.

کاریگەری فرمێسکی چاوان لە کاریگەری لافاو دەچێت، ئەولافاوەی کە گاشەبەردی گەورە و زەبەلاح و جێگرەکان لە جێی خۆیان هەڵدەکەنێت و تێکیان دەدات. بۆیە خواجە دەڵێ:

فرمێسکی چاوان لافاوە بەسەرهەرکەسێکدا هەڵکات، هێندە کاریگەریی لەسەردەبێت گەردڵیشی لەبەرد بێت ـ هێندە دڵڕەق بێت ـ دەیجولێنێ و یەکسەر تەسلیم دەبێت.

**٥- ما را به آب دیده شب و روز ماجراست**
**زان رهگذر که بر سرِ کویش چرا رود**

ئێمە شەو و رۆژ لەگەڵ فرمێسکی چاودا دەمەقاڵەمانە، کە بۆچی ئەودەچێت بۆکۆڵانی یار.

ماجرا: دەمەقاڵە و شەڕ و شۆڕ.

فرمێسك کە لەچاوان دەبارێت و دەبێتە لافاو بەرەو کۆڵانی یار و رەهگوزاری ئەو هەڵدەکات و دەچێتە جێ ژوانی مەعشوق بەڵام ئێمەی خاوەن فرمێسك خۆمان توانای چونە ئەو حەرەمەمان نییە. بۆیە شەو و رۆژ دەمەقاڵە و شەڕ و شۆڕمانە کە بۆچی ئەو بەتەنیا دەچێتە جێ ژوانی مەعشوق و ئێمە ناتوانین بڕۆین.

**٦- خورشیدِ خاوری کند از رشک جامه چاك**
**گر ماهِ مهرپرورِ من در قبا رود**

هەتاو رۆژهەڵات لەداخا (حەسوودیدا) یەخەی دادەڕێ، گەر مانگی عەشق پەروەری من بەجلەوە تێپەڕێت.

خاور: رۆژهەڵات ـ شوێنی هەڵاتنی هەتاو. رشك: داخ، حەسوودی. چاك: كراوە، دڕاو.

مهرپرور: عەشق پەروەر. درقبا رفتن: بە جلەوە رۆیشتن.

واتە: گەریاری جوان و مەعشوقی نازەنین و عەشق پەروەری من خۆی دەرخات و بڕوات، یاخۆی نمایش بكات، هێندە جوان و نازدارە كە هەتاوی رۆژهەڵات لەچاویدا هیچ نییە و لەحەسوودی و لەداخا دادەدڕێت.

**٧-حافظ به کویِ میکده دائم به صدقِ دل**

**چون صوفیان صومعەدار از صفا رود**

حافظ هەمیشە بەڕاستگۆییەوە بەرەومەیخانە دەڕوات، هەروەك سۆفییانی خانەقا بەپاكییەوە بەرەوخانەقا دەڕۆن.

بەصدق دل: بەڕاستگۆییەوە. صومعەدار: خانەقادار.

هەروەك چۆن سۆفییانی پاك بەپاكییەوە بەرەو خانەقا دەڕۆن، حافظیش هەمیشە بەڕاستگۆییەوە بەرەو مەیخانەی عەشق و مەعریفەت دەڕوات.



## غەزەلی دوو سەد و هەژدەیەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی مەحزوف**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلان)**

**١- چو دست در سر زلفش زنم به تاب رود**

**ور آشتی طلبم با سر عتاب رود**

كەدەست لە سەری زوڵفی بدەم تووڕە دەبێت و گەر داوای ئاشتی بكەم دەستدەكات بە سەرزەنشتم.

بەتاب رود: تووڕە دەبێت (یاخود لوول دەبێت).

آشتی طلبم: داوای ئاشتی بكەم، ئاشت ببمەوە.

باسرعتاب رود: دەست دەكات بەعتابم، سەرزەنشتم.

(زلف) لە زاراوەی عیرفانیدا حیجاب و پەردەی رووە، یاخود نهێنییەكانە، واتە كاتێ كە دەست بخەمەنێو پەردە و نهێنییەكان یارتووڕە دەبێت (گەر بەتاب رود بەواتای تووڕە دەبێت لێكدەینەوە) یاخود كاتێ دەست بخەمەنێو نهێنییەكانەوە، نهێنییەكان خۆیان ئاڵۆزتر دەبن (چونكە لوول بوونی پرچ نادیارە و ئاڵۆزتربوونی نهێنییەكانە) كاتێ كە داوای لێبووردن لەم كارەشم دەكەم كەلێم ببورێت سەرزەنشتم دەكات و دەستدەكات بەعیتابم.

**٢- چو ماه نو رهِ نظّارگان بیچاره**

**زند به گوشەی ابرو و در نقاب رود**

وەك مانگی تازە بە گۆشەی برۆ رێ لە تەماشاكەرانی بێچارە دەگرێت و لەپاشاندا خۆی پەنهان دەكات.

نظارگان: تەماشاكەران.

درنقاب رود: نیقاب بەروودا دەگرێ، خۆی پەنهان دەكات.

لەم بەیتەدا حافظ یاری لەدوو بواردا (وجە) بەمانگی تازە چواندووە، یەكەمیان لە كەوانەییدا كە برۆی یاری لەودەچێ دووەمیش لە زوو پەنهان بوونیدا چونكە مانگی تازە زۆر زوو ئاوادەبێت و تەماشاكەرانی لە سەیری تێرنابن.

ئەو دەڵێ: یار وەك مانگی تازە وایە بەبرۆی كەوانەیی رێ لە تەماشاكەرانی بێچارە (عاشقانی بێچارە) دەگرێت و تالانیان دەكات و یەكسەریش خۆی دەشارێتەوە.

**۳- شب شراب خرابم کند به بیداری**

**وگر به روز شکایت کنم به خواب رود**

شەوان بەبێداری شەڕاب حاڵم تێکدەدات و گەر بەڕۆژیش شکات بکەم خۆی لەگێلی دەدا.

بەخواب رود: خۆی گێل دەکات، خۆی ون دەکات.

شەوانە بادەی عەشقی یار پەرێشانحاڵم دەکات و تاسپێدە خەو ناچێتە چاوانم، کە سبەینێ دەمەوێ شکاتی ئەم حاڵەتە لەیاربکەم ـ کەشەوێ عەشقی تۆ پەرێشانی کردم ـ خۆی گێل دەکات یاپەردە بەروویدادەدات.

لەڕاستیدا ئەم بەیتە و بەیتی پێشوویش لە جیلوەی جەمال دەدوێن کە چرکەساتێکە و لەپڕ ون دەبێت و حاڵی عاشقان خراپتر دەکات.

**٤- طریق عشق پر آشوب و فتنه است ای دل**

**بیفتد آن که درین راه با شتاب رود**

ڕێگەی عەشق پڕ ئاشوب و فیتنەیە ئەی دڵ، هەرکەس لەم ڕێگەیەدا بەپەلە بڕوات دەکەوێ.

بیفتد: دەکەوێ. باشتاب: بەپەلە، بەخێرایی.

ڕێگەی عەشق پڕ لە ئاشوب و فیتنەیە، سەبر و ئارامیی دەوێت و هەرکەس بەپەلە بڕوات بە مەنزڵ ناگات.

**۵ ـ حباب را چو فتد باد نخوت اندر سر**

**کلاه داریش اندر سر شراب رود**

کاتێ بڵق هەوای فیزی کەوتەسەر، گەورەیی دەچێ بەشەڕابدا.

حباب: بڵق، بڵقی سەرئاو /شەڕاب (لێرەدا شەڕابە). فتد: بکەوێتە.

نخوت: فیز و خۆ بەگەورە زانین، تەکەببور. کلاەداری: گەورەیی.

کاتێ کە شەڕاب ئەکرێتە پێکەوە بڵق (کەهیچ نین) هەوای فێز و خۆبەگەورە زانین بکەوێتە سەریانەوە و خۆیان بە گەورە بزانن دەتەقن و سەریان دەچێتەوە بەنێو شەڕابەکەدا و تێدادەچن.

بەکورتی: خواجە ئامۆژگاری دڵ و عاشقان دەکات کە غرور و خۆبەگەورە زانین مایەی تیاچوون و لەدەستدانی گەورەیی و ئاگادارین.

**٦- گدایی در جانان به سلطنت مفروش**

**کسی ز سایەی این در به آفتاب رود؟**

گەدایی بەردەرگای یار بە سەڵتەنەت مەفرۆشە، کەس هەیە کە لە سێبەری ئەم دەرگاوە بچێتە بەر خۆرەتاوە؟



سلطنت: فەرمانڕوایی، سەڵتەنەت. سایە: سێبەر. آفتاب: خۆرەتاو.

وەل هەمیشە خواجە گەدایی بەردەرگای مەعشوقی حەق بەسەڵتەنەت دوور لەوەدەرگایە ناگۆڕێتەوە، چونکە بەردەرگای یاری حەق بەسێبەرێکی ئارام دەزانێت و پایەیەکی مەحکەمە بەلاّم لەشوێنەکانی دیکەدا ئەو سێبەرە نییە و کەسی عاقڵیش سێبەر بەجێ ناهیڵێ و بچێتە بەردەم خۆرەتاوی سەڵتەنەتەوە.

**٧- دلا چو پیر شدی حسن و نازکی مفروش**

**که این معامله در عالم شباب رود**

ئەی دڵ کە پیربوویت، ئیدی لافی جوانی و ناسکی لێ مەدە، چونکە ئەم مامەڵەیە (لاف لێدان) لەجیهانی لاویدا دەکرێت.

واتە کاتێ کڕین و مامەڵەی جوانی و ناسکی جوانییە ولەپیریدا ئەمانە مەفرۆشە چونکە کاتیان نەماوە پارە ناکەن.

**٨- سواد نامەی موی سیاه چون طی شد**

**بیاض کم نشود ور صد انتخاب رود**

کاتێ مرەکەبی نامەی مووی ڕەش تەواو بوو، ئیدی سپێتی تەواو نابێتەوە گەر سەدجار بیبژێری.

سواد: مرەکەب (ڕەش). طی شد: تەواو بوو. بیاض: سپێتی.

انتخاب رود: ببژێرێت، گوڵ چین کرێت، هەڵبژێرێت.

واتە کاتێ مووەکان و مووی سپی بوون و مرەکەبی ڕەشیان تەواو بوو، ئیدی سپێتی تەواو نابێت و مووی سپی لەسەرت نابڕێ گەرسەدجار سپییەکان لابەریت (کە جوانی ڕۆیشت ناگەڕێتەوە).

**٨-حجاب راه تویی حافظ از میان برخیز**

**خوشا کسی که دراین راهِ بی حجاب رود**

حافظ پەردەی ڕێگەی تۆی لە نێواندا هەستە (لاچۆ) خۆشەکەسێ کەلەم ڕێگەیەدا بێ پەردە بڕوات.

ازمیان: لەنێواندا.

برخیز: هەستە، لاچۆ.

حجاب: پەردە، لە زاراوەی عیرفانیدا هەرشتێك ببێتە مایەی دابڕان لەحەق و دوورخستنەوە لەو بەحیجاب ئەدرێتە قەڵەم.

خواجه جه‌سته و بوونی خۆی و دڵبه‌ستنی به‌دنیا به‌په‌رده‌ی سه‌ر ڕێگـه‌ی کـه‌ماڵ و بـۆ لای مه‌عشوق چون ده‌زانێت، بۆیه حافظ تۆخۆی په‌رده‌ی له‌ونێواندا لاچوو، خۆش بـه‌حاڵی ئه‌وانـه‌ی که به‌بێ په‌رده و بێ دڵبه‌ستن به‌دونیا و شته‌کانی دیکه‌وه ڕێگه‌ی که‌ماڵ تـه‌ی ده‌کـه‌ن و بـه‌ره‌و خودا ده‌ڕۆن.



## غه‌زه‌لی دوو سه‌د و نۆزده‌هه‌م:

**به‌حری ره‌مه‌لی هه‌شتی مه‌خبونی مه‌حزوف**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)**

**١- از سركوىِ تو هر كو به مَلالت برود**

**نرود كارش و آخر به خجالت برود**

هه‌رکه‌س له سه‌رکووچـه‌ی تـۆ بـه دڵتـه‌نگی بـڕوات، کـاری بـه‌ئامانج ناگـات و دواجـار (له‌کۆتاییدا) خه‌جاڵه‌ت ده‌بێت. به‌ملالت: به دڵته‌نگی، به‌دڵڕه‌نجاوی.

برود: بڕوات، به‌جێی بهێڵێ، وازی لێ بهێنێ.

نرود کارش: کاری ناڕوات، کاری به‌ئه‌نجام ناگات

به‌خجالت برود: خه‌جاڵه‌ت ده‌بێت، شه‌رمه‌زار ده‌بێت، (یاخود به‌شه‌رمه‌زاری ده‌ڕوات).

خواجه وازهێنان له مه‌عشوق و نازهه‌ڵنـه‌گرتن و خۆبه‌کـه‌م نـه‌زانین لای ئـه‌و به‌مایـه‌ی ریسوایی وشه‌رمه‌زاری ده‌زانێـت و پێیوایـه هه‌رکـه‌س له‌بـه‌رده‌رگا و ئاسـتانه‌ی مه‌عـشوق وکۆڵانی ئه‌و بڕه‌نجێ و به دڵته‌نگییـه‌وه ئـه‌و ئاسـتانه‌یه بـه‌جێ بهێڵـێ، جگـه لـه‌وه‌ی کـه سه‌ره‌نجام به‌شه‌رمه‌زاری ده‌ڕوات و شه‌رمه‌زاریی به‌شی ده‌بێت، له‌هیچ کوێی دیکه کاری بـه ئه‌نجام ناگات.

**٢- سالك از نورِ هدايت ببرد راه به دوست**

**كه به جايى نرسد گر به ضلالت برود**

سالك له‌نوری هیدایه‌ته‌وه ڕێگه ده‌باته لای دۆست، چـونکه گه‌ربـه‌گومڕایی بـڕوات بـه‌هیچ کوێ ناگات.

ببرد راه به‌دوست : ڕێگه‌ی دۆست ده‌دۆزێته‌وه، ده‌گات به‌دۆست.

ظلالت: گومڕایی، ون بوون

(سالك) ڕێبواری تازه‌ی نێو ڕێگای پڕ هه‌ڵمه‌ت و نـشێوی عیرفانـه و گـه‌ر لـه‌خۆوه بـڕوات هه‌رگیز به‌دوست و مه‌عشوقی حه‌ق ناگات و ون ده‌بێت به‌ڵام ئه‌وشته‌ی که ڕێ پیشانده‌ریه‌تی و ڕێگه‌ی دۆستی پێ نیشانده‌دات نوری هیدایه‌ت و ده‌ستگرۆییه کـه لێـره‌دا ئـه‌کرێ (مورشـیدی کامل) بێت یاخود نوری هیدایه‌تی ئیلاهی.

**٣- کام خود آخر عُمر از می و معشوق بگیر**

**حیفِ اوقات که یکسر به بطالت برود**

لەم ئاخری تەمەندا لەمـەی و مەعـشوق ئـارەزووت تێرکـە، حەیفـە کەتـەواوی کاتـەکان بەبێهودە تێپەرن.

کام بگیر: بەئارەزوو بگە، ئارەزووت تێربکە، بەئاوات بگە.

آخرعمر: پیری، دوادوایی تەمەن.

حیف: حەیف. یکسر: هەموو، سەراپا. بطالت: بێهودە، پوچ.

خواجە بەخۆی یا بە سالك و عارف دەڵێ: گەر لە لاویدا فرسەتی ئەوەت نەبوو کە بەئاواتی دێرینەی عاشـقان بگـەیت واتـە بەمـەیی مەعریفـەت و مەعـشوقی ئـەزەلی بگـەیت، ئـەوا بەفرسەتی بزانە و لەم پیرییەدا پێیان بگە و ئارەزووت بەجێ بهێنـە، گەرسـەردەمی لاویـت بـە بێهودە تێپەریوە، باپیریت وانەبێت، چونکە حەیفـە تـەواوی کـات و تەمـەنی مـرۆڤ بـەبێهودە بەسەربچێت.

**٤- ای دلیلِ دلِ گم گشته خدا را مددی**

**که غریب ار نبرد ره، به دلالت برود**

ئەی ڕێبەری دڵەی ونبوو، بۆخاتری خوا هاوکارییەك، چونکە گـەر ڕێبـوار سـەری لەڕێگـە دەرنەکرد، بەڕێنمایی دەتوانێ بڕوات.

گم گشتە: ونبوو. نبرداە: سەری لە ڕێگە دەرنکرد، ڕێی نەزانی، ونبوو.

دلالت: ڕێنمایی، ڕێنوێی.

دەلیلی دڵی ونبوو هەمان نوری هیدایەتە کە مورشیدی کامڵە، خواجە لـەم بەیتـەدا داوای هاوکـاری ڕێنـوێنی لێـدەکات و دەڵـێ: تۆکـە ڕێبـەری دڵـی و نبـووی منـی بۆخـاتری خـوا یارمەتییەکم بدە و لەم ڕێگەیەدا هاوکاریم بکـە، چـونکە مـن غـەریبم و غـەریبیش ڕێگـەی نیشتیمان نازانێت بەڵام بەپرسیار پرسیار و ڕێ پیشاندان ئەتوانێ بگاتەوە بە نیشتیمان. تـۆش هاوکاریم بکە تابگەمەوە بەنیشتمانی ڕەسەنم.

**٥- حکم مستوری و مستی همه بر خاتمت است**

**کس ندانست که آخر به چه حالت برود**

بڕیاری مەستوری و مەستی هەمووی لەسەر هەناسەبری کۆتاییە، کەس نەیزانی کە دوایـین جاربەچ جۆرێك دەڕوات.

مەستوری: خۆپارێزی ڕەمزی زوهد و بێ گوناهییە.



مستی: مەستی و گوناهباری کە ڕەمزی عەشق و عیرفانـە (لێـرەدا مەسـتوری و مەسـتی بەواتای پاکی و گوناهباری هاتوون).

خاتمت: کۆتایی. نداست: نەیزانی.

حوکم و بڕیاری چاکە و خراپە یا خۆپارێزی و گوناهکاری یا موسڵمان و کافر بڕیارەکـە لـە کۆتاییدا دەردەکرێ و مرۆڤ ناتوانێ لەسەرەتاوە بڕیاربدات کە چاکە یـا خراپـە چـونکە ڕەنگـە عـاقیبەت جۆرێکی دیکە بێت و کەس نـازانێ کەلـەدوایین جـاردا بـەچ جۆرێـك لەسـەرکامیان دەمرێت.

لەڕاستیدا ئەم بەیتە ڕەتدانەوەی ئەو ڕواڵەتییانەیە کە بەئارەزووی خۆیـان بڕیـاری چـاکە و خراپە بەسەرخەڵکیدا ئەدەن.

**٦- کاروانی که بود بدرقه‌اش حفظِ خدای**

**به تجمّل بنشیند به جلالت برود**

کاروانێك کە لوتف و پارێزەری خودا بەڕێ دەکات، بەجوانی و ڕازاوەیـی مـەنزڵ دەخـات و بەشکۆ و جەلالیشەوە دەڕوات.

بدرقە: بەڕێ کردن، ڕاهنما، پشت و پەنا. تجمل: ڕازاوەیی. جلالت: جلال، شان و شکۆ.

ئەم بەیتە لە نوسخەی قزوینی، خلخالی و هتدا بەیتی دووەم، کە پێدەچێت شوێنی شیاوی هەربەیتی دووەم بێت، بەهەرحاڵ: خواجە پشت و پەنای ئیلاهی و لوتفی خوا بەپارێزەری کاروان و مایەی جوانی و شکۆی ئەو دەزانێت وپێی وایـە کـە کاروانێـك بـەلوتفی ئیلاهییـەوە بـەڕێ بخرێت، لەهەرشوێنێکدا مەنزڵ بخات بەڕازاوەیی دەبێت و کە دەشڕوات بەشکۆوە دەڕوات.

**٧- حافظ از چشمه‌ی حکمت به کف آور جامی**

**بوکه از لوحِ دلت نقشِ جهالت برود**

حـافظ لەکانی حیکمەتەوە ئاوی بەدەست بهێنە، بەڵکو بەوئاوە نیشانەی نەزانی لە لـەوحی دڵت بسڕێتەوە.

چشمە: کانی، سەرچاوە. بەکف آور: بەدەست بهێنە.

بو: لەکاری (بود)ەوە هاتووە بەواتای بەڵکو یا ڕەنگە، بکرێ . جهالت: نەزانی.

خواجە زانست و حیکمەت بەسەرچاوەی سڕینەوەی جەهل و نەزانی دەزانـێ، بۆیـە بـەخۆی دەڵێ: هەوڵبدە لەسەرچاوەی کانی عیلم و حیکمەتەوە قومەئاوێ بەدەست بهێنی، چـونکە ئـەو ئاوە کاریگەری نەزانی لەسەردڵان لادەبات.

## غەزەلی دووسەد و بیستەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی مەحزوف**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلن)**

**۱-خوشا دلی که مدام از پیِ نظر نرود**

**به هردرش که بخوانند بیخبر نرود**

خۆش بەحالّی دلّێك کەبەردەوام شوێن نیگا نەکەوێت و بۆ هەردەرگایەکیش بانگهێشتی کەن بەبێ ئاگایی لەخۆوە نەڕوات.

خوشا: خۆش بەحالّی، خۆزگە بە.    ازپی: بەدوای.

بخوانند: بانگهێشت بکەن.    بی خبر: لەخۆوە و بەبێ ئاگایی.

خواجە خۆزگە بەحالّی دلّێك دەخوازێت کە شوێن چاو و نیگا نەکەوێت و بەبێ ئاگایی و لەخۆوە ملی ڕێگەی هەردەعوەتێك نەگرێتەبەر، چونکە دلّ پێویستە شوێن چرپەکانی بکەوێت و لەهەر هەنگاوێکدا سوود و زیانی خۆی لێکداتەوە.

**۲- طمع در آن لبِ شیرین نکردنم اولی**

**ولی چگونه مگس از پیِ شکر نرود**

چاکتروایە تەماعم لەو لێوەشیرینە نەبێت، بەلاّم چۆن مەگەز ناچێت بەدوای شەکردا.

طمع نکردن: تەماع تێدا نەبوون، بەهیوانەبوون.    اولی: چاکتر.

خواجە خۆی بەو مەگەزە داناوە کە بەردەوام بەدوای شەکردا وێڵە، دەڵێ: چاکتروایە کەبەهیوای لێوی یارنەبم (کەقسەم لەگەڵ بکات یا ماچێکم بداتێ) بەلاّم چی بکەم من وەك مەگەزم و لێوی یاریش وەك شەکرە مەگەزیش هەمیشە بەدوای شەکردا دەڕوات.

**۳- سوادِ دیدەی غمدیدەام به اشک مشوی**

**که نقشِ خالِ توام هرگز ازنظر نرود**

ڕەشێنەی دیدەی خەمدیدەم بەفرمێسك مەشۆ، چونکە هەرگیز نەخشی خالّی تۆم لەبەرچاو ون نابێ.

سواد: ڕەشێنەی چاو، سۆما، گلێنە.    مشوی: مەشۆ.

ازنظرنرود: لەبەرچاو نابێ.

سۆمای چاوی غەمدیدەی من بە ئەشك مەشۆ واتە دلّتەنگ و مەلوولم مەکە تا هێندە بگریەم کە سۆمای چاوم بە فرمێسك تەڕبێت. خواجە بەیاریێ دەڵێ: هێندە ئازارم مەدە چونکە



من هەرگیز نەخشی خالّی ڕەشی تۆم لەبەرچاوان نابێ و هەر ئەڵێی بووەتە گلێنەی چاوم و لەبری ڕەشێنەی چاوم لەچاوماندا پارێزراوە.

**٤- ز من چو بادِ صبا بویِ خود دریغ مدار**

**چرا که بی سرِ زلفِ توام به سر نرود**

وەل بای سەبا بۆنی خۆت لەمن قەدەغەمەکە، چونکە بەبێ سەری زولّفی تۆ ژیانم ناڕوات.

دریغ مدار: قەدەغەمەکە.    چرا که: چونکە، لەبەر ئەوەی کە.

بەسرنرود: ناڕوات، ناگوزەرێت .

واتە ژیان و زیندەگیم بەئومێدی سەری زولّفی تۆوە بەسەرئەبەم و ئەو مایەی ئارامی ژیان و گوزەرانی ڕۆحیمە، هەر لەبەر ئەمە تۆ بۆنی زولّفی خۆتم لێ قەدەغە مەکە و هەمیشە وەکو سەبابە کە بۆنی خۆییم لێ حەرام و قەدەغەناکات.

**٥- دلا مباش چنین هرزەگرد و هرجایی**

**که هیچ کار ز پیشت بدین هنر نرود**

ئەی دلّ ئاوا هەرزەگەڕ و جادەپێو و سەرەڕۆ مەبە، چونکە بەم هونەرە هیچ کارێك لەبەرناڕوات.

هرزەگرد: هەرزەگەڕ و جادەپێو، هەڵەگەڕ.    هرجایی: سەرەڕۆ.

کار ز پیشت نرود: کارت لەبەر ناڕوات، کارت بۆئەنجام نادرێ.

خواجە هەڵەگەڕی و سەرەڕۆی بەمایەی شپرزەیی فکری و هزری دەزانێت و پێی وایە هەڵەگەڕی و سەرەڕۆیی (کەئەڵبەتە شپرزەیی و سەرەڕۆیی عاشقانە و عاقلانەیە) ئەبێتە مایەی ئەوەی کە مرۆڤ توانای بەمەبەست گەیاندنی کارەکانی (کاری عەشقی) نەبێت، بۆیە ئامۆژگاری دلّی خۆی دەکات و پێی دەڵێ: ئەی دلّ، ئاوا هەڵەگەڕ و سەرەڕۆ مەبە، چونکە گەرئەم سەرەڕۆیی وهەڵەگەڕییە هونەریش بێت (کەلێرەدا خواجە بە تانەوە بە هونەریان ئەداتە قەڵەم) هیچ کارێکیان پێ ئەنجامنادرێت.

**٦- سیاه نامه تر از خود کسی نمی بینم**

**چگونه چون قلمم دودِ دل به سر نرود**

کەسی نامەی ئەعمال ڕەشتر لە خۆم شك نابەم، چۆن (لە حەسرەتدا) دووکەڵی دڵم ناچێتە سەرم.

خواجە خۆی لە بەرامبەر قەڵەمدا دادەنێت، بێگومان قەڵەم مرەکەبی تێدایە و لە کاتی نووسیندا مرەکەبەکە ئەچێتە سەری قەڵەمەکە و دەردەکەوێت، لێرەدا حافظ دووکەڵی ئاهی

دڵی بە مرەکەب چواندووە کە لە سەری قەڵەمەکەوە دێتە دەرەوە، ئەو دەڵـێ، مـن کـە سـەیر دەکەم کەسێ نامەی عەمەل رەشتر لە خۆم نابینم و شك نابەم و بەمەش لە خەفەتـدا دووکـەڵی ئاه و حەسرەتی دنیا لە سینە و دڵمدا پەنگی خواردۆتەوە کەچی نازانم چۆن ئەم دووکەڵی خـەم خەفەتەی دڵم وەك مرەکەبی قەڵەم ناگاتە سەرم و نارژێ.

واتە: من کە لە هەموان گوناهبارترم زۆر پەشیمانم و ئاهی حەسرەت هەڵدەکێشم.

**٧- مکن به چشم حقارت نگاه در من مست**

**که آبروی شریعت بدین قدر نرود**

بە چاوی سووکەوە لە منی مەست مەڕوانـە، چـونکە ئـابڕووی شـەریعەت بـەم تـۆزە (گوناهە) ناڕوات.

بدین: بەم / بە ئەم. قدر: ئەندازە، تۆزە، هێندە.

ئێمە گەر مەستیش لە واتا فیقهییەکەیدا وەرگرین ئەوا ئەو مەستییەش لای حافظ زۆر ناشیرین نییە و لە خواردنی ماڵی حەرام و ریای پێ باشترە و بە گونـاهێکی چـکۆلانەی ئەداتـە قەڵـەم، بـە زاهید یا هەر کەسێکی دیکە دەڵێت: بە چاوی سووکەوە سەیری منـی بـادەنۆش و مەسـت مەکـە چونکە بەم گوناهە بچکۆلەیە ئابڕووی ئایین ناڕوات و ئایین هەر بە گەورەیی دەمێنێتەوە.

ئەم بەیتە دوو بۆچوونی گـەورەی تێدایـە کـە یەکـەمیان، مەینۆشـی و مەسـتی لـە چـاو گوناهەکانی دیکەی وەك ماڵی ئەوقاف و خەڵکی خواردن و ریاکاریدا تۆزقاڵێکە وەك دەڵێ:

باده نوشی که در روی دریایی بنود

بهتر از زهد فروشی که درو روی دریاست.

غەزەلی (٢٦)ی عیوضی

ئەوی دیکەشیان ئایین بە گوناهی موسڵمانێ عەیبدار نابێت، ئەم بۆچونەی دووەم ئەسڵێکی زۆر بونیادییە و زۆرێك لەو کێشانە چارەسەر دەکات کە بۆ ئەو کەسـانە دروسـتدەبێت کـە لـە موسڵمانانەوە سەیری ئایین دەکەن.

**٨- من گدا هوس سروْ قامتی دارم**

**که دست در کمرش جز به سیم و زر نرود**

منی گەدا ئارەزووی بەژن گەورەیەك دەکەم کە بـە بـێ زێـڕ و زیـو دەسـتی هـیچ کەسـێك نەخرێتە کەمەری.

دەست در کمر رفتن: دەست خـستنە کەمـەر، دەسـت هێنانـەوە بـە دەوری کەمەریـدا، کەمەر گرتن.



خواجە لە وەسفی خۆیدا گەدایی بە باڵای خۆیدا ئەبڕێت بەڵام گەدایەك کە عیزەتی نەفسی هەیە و ئاواتی شتی گەورەی هەیە، ئەو دەڵێ من کە گەدام ئارەزووم وایـە بگـەم بـە یـارێکی بەژنرێکی وەك دارسەرو کـە هێنـدە جـوان و شایـستەیە کـە هـیچ کەسـێك نـاتوانێ بـە بـێ سەرفکردنی زێڕ و زیو پێی بگات و دەست بکاتە ئەڵقەی دەوری کەمەری.

لەڕاستیدا خواجە کە لێرەدا خری بە گەدا داوەتە قەڵەم تەواو پێچەوانەی گـەدایانی دیکـە، گەدایی خواجە سوڵتانی هێناوە و گەورەی کردووە.

**٩- تو کز مکارمِ اخلاق عالمی دگری**

**وفایِ عهد من از خاطرت به در نرود**

تۆ کە لە رەوشت بەرزیدا جیهانێکی دیکەی، دڵنیام کە وەفای پەیمانی منت لە یاد ناچێت.

مکارم اخلاق: رەوشت بەرزی، رەوشـت چـاکی. عـالمی دیگـری: جیهـانێکی دیکەی.

از خاطرت نرود: لـە بـیرت نەچـێتەوە. مگـر (لێـرەدا بـە واتـای) دڵنیایی، هەرگیز.

خواجە باس لە گەورەیی و رەوشت بەرزی یاری هەق و پەیمانەکەی خۆی دەکات کە لە رۆژی ئەستەمدا بە یاری داوە. بە یار دەڵێ: تۆ کە لە رەوشت بـەرزی و ئـەخلاقی جوانـدا خـۆت بـۆ خۆت جیهانێکی دیکەی جیاواز لە جیهانی بەشەریەت و وەك مرۆڤ بێ وەفا و بێ پەیمان نیـت، بۆیە دڵنیام وەفاداری و پەیمانی من (کە لە رۆژی ئەلەسـتدا پـەیمانی بەندایـەتیم داوە) لـە یـاد ناکەیت و پاداشتم دەدەیتەوە.

لە نوسخەی خالخالیدا لە بری وشەی (مگر) (بـەدر) هـاتووە کـە جـۆرە بیرخـستنەوەیەکی تێدایە بۆ یار بەڵام لە زۆری نوسخە دێرینەکاندا مگر هاتووە.

**١٠- به تاج هدهدم از ره مبر که باز سفید**

**چو باشه درپیِ هر صیدِ مختصر نرود**

بەتاجی پەپوسلێمانە هەڵم مەخەڵەتێنە چونکە بازی سپی وەك واشـە نییـە بـەدوای هـەر نێچیرێکی بچووکدا بڕوات.

تاج هدهد: کلاوپۆپەی پەپوسلێمانە، تاجی پوچ و بێ کەڵك.

من از ره مبر: لەرێ لام مەدە، هەڵم مەخەڵەتێنە، فریوم مەدە.

باشە: واشە، باڵندەیەکی راوچییە کە لەباز بچووکترە و باڵندەی بچووك راودەکات.

درپی: بۆ، بەدوای. صید مختصر: شکاری بچووك و بێ کەڵك.

خواجە لەم بەیتەدا بەرامبەر بەدونیا و لەتاج و سەڵتەنەتە دونیاییەکان ئەدوێ، ئەو دەستکەوتە دونیاییەکان بەپاپۆی پەپوسڵێمانە ئەداتە قەڵەم کە هیچ نییە، خۆشی بەبازی سپی خاوەن کەسایەتی و گەورەیی دەزانێت، بەدونیا دەڵێ من کە وەك بازی سپیم و بەدوای شکاری مانابەرزەکانی ژیان و گەورەییەکانەوەم بەتاجی پەپوسڵێمانەیی فریوم مەدە، چونکە ئەو سەڵتەنەتە دونیاییانە وەك شکاری بچووك و بێ کەڵکن و بۆ بازی راوکەر نەنگییە کە شوێن ئەو شکارە بچووکانە کەوێت، واشەی نەفس نزم نییە شوێن هەرشکارێکی بچووك و بێ کەڵك بکەوێت.

واتە مرۆڤی نزم شوێن دنیا و سەڵتەنەتە دونیاییەکان دەکەوێ من کە پوختە و کامڵم و پێگەیشتووم بەوشتانە فریو ناخۆم.

لە هەندێ نوسخەدا لەبری (باشە) (کِبْر) هاتووە کە لەڕووی رەوانبێژی و واتاییەوە لەنگە.

**١١- بیار بادە و اوّل بە دستِ حافظ دە**

**بە شرطِ آنکە ز مجلس سخن بە در نرود**

شەڕاب بێنە و یەکەمجار بیدە بەدەست حافظەوە، بە مەرجی ئەوەی کە ئەم قسەیە لەم مەجلیسە دەرنەچێت.

اوّل: یەکەمجار.   بەدر نرود: دەرنەچێت.

ئەی ساقی بادە بهێنە و یەکەمجار بیدە بە دەستی منەوە با شەڕابی عەشق بنۆشم بەڵام بەو مەرجەی کە ئەم نهێنی و سرە بپارێزین و کەس ئەم باسە نەباتە دەرەوەی ئەم مەجلیسە.

وەك هەمیشە خواجە شەرتی نهێنی پارێزی و نەدرکاندنی رازی عەشق دەخاتەڕوو.



## غەزەلی دوو سەد و بیست و یەکەم :

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی مەحزوف**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)**

**١- هرگزم نقشِ تو از لوحِ دل و جان نرود**

**هرگز از یادِ من آن سرو خرامان نرود**

هەرگیز وێنەی تۆ لە پەڕەی دڵ و گیانمدا ناسڕێتەوە و هەرگیز ئەو سەرووی خەرامانەم لە یاد دەرناچێ.

لوح: پەڕە.   نرود: ناڕوات، ناسڕێتەوە.   خرامان: خەرامان، بەلەنجەولار.

خواجە بە یار دەڵێت: هەرگیز وێنەی جوانی و جەمالی تۆ لە پەڕەی دڵ و گیانمدا ناسڕێتەوە و هەمیشە وێنەی جوانی تۆ لە دڵ و گیانمدایە و ئەو یارە بەژنڕێك و باڵابەرزە بەلەنجەولارەم لە بیر ناچێتەوە.

ئەم غەزەلە لە هەندێ نوسخەی دێرین و نوێدا نەهاتووە و بە غەزەلی حافظ نەدراوەتە قەڵەم، بەڵام لە نوسخەی ئەسڵی خلخالی (٨٢٧ ه.ق) دا هاتووە، هەرچەندە لە نووسخەی بادلیان (٨٤٣ ه.ق) پنجاب (٨٩٤ ه.ق) دا نەهاتووە، هەروەها لە ساغکردنەوە نوێیەکانی وەك خانلری و نیسار و سایە و {محمد رضا جلالی نائینی، ل٢١٠ / ذهن و زبان حافظ و شاملو و عیوضی و هروی} دا نەهاتووە بەڵام لە ساغکردنەوەی (قەزوینی - غەنی، خرمشاهی و لاهوری و خطیب رهبر و مهدی معینیان دا (کە ئەم سیانەی دوایی شەرحی غەزەلەکانن) هاتووە و لەگەڵ ئەوەی کە د.خرمشاهی بە یەکێ لە غەزەلەکانی خواجە دەزانێت و لە (ذهن و زبانی حافظ)دا رەخنەی نەهێنانی ئەم غەزەلە لە (حافظ شیرازی) ی (شاملو) دەگرێت.

{ د. بهاالدین خرمشاهی، ذهن و زبان حافظ، چاپ هفتم ١٣٨٠، انتشارات ناهید، تهران، ل٢١٠-٢١١}.

لە ساغکردنەوەی دیوانەکەدا و لە پەراوێزی ئەم غەزەلەدا نووسیویەتی ((نوسخەی بادلیان و پنجاب — خلخانی — ئەم غەزەلەیان تێدا نییە)) ئەم غەزەلە لە نووسخەی (قزوینی - غنی و جاوید - خرمشاهی) دا هەیە. بەڵام لە نوسخەی (خانلری، نیساری، سایە، عیوضی) دا نەهاتووە، ئەم غەزەلە بەهی (ناصر بخارایی دراوەتە قەڵەم و بە جیاوازی زۆر کەمەوە لە دیوانەکەیدا — کە بە هەوڵی خوالێخۆشبوو (مهدی درەخشان) ساغکراوەتەوە — هاتووە

{د.بهاالدين خرمشاهي — ديوان حافظ بر اساس نسخه‌ی خلخالی (۸۲۷ ق) چاپ چهارم، ۱۳۸۲، انتشارات دوستان، تهران، ل۲۲٤ } .

لەڕاستیدا ئەم غەزەلە چ لەڕووی رووخسار و چ لەڕووی ناوەڕۆکیشەوە رەسەنایەتی خواجەی پێوە دیارە بۆیە بە پێویستمان زانی ئێمەش بینووسینەوە.

**٢- از دماغِ من سرگشته خیال دهنت**

**به جفایِ فلك و غصّه‌ی دوران نرود**

خەیاڵی دەمت لە مێشکی منی سەرگەرداندا بە ستەمی فەلەك و خەفەتی رۆژگار دەرناچێت.

دماغ: مێشك، سەر، بیر.

دیسانەوە خواجە باس لە ئیستیقامەتی خۆی لە سەر عەشقی یار دەکات و دەڵێ خەیاڵی دەمی تۆ ئەی یار کە لە سەری من دایە و هەمیشە بیری لێ دەکەمەوە بە هیچ شتێ لە سەرم دەرناچێ و هیچ شتێ ناتوانێ لە سەرمی دەرکات نە ستەمی گەردوون و نە خەفەتی دەوران و رۆژگار.

**٣- در ازل بست دلم با سر زلفت پیمان**

**تا ابد سرنکشد وز سرپیمان نرود**

لە ئەزەلدا دڵم پەیمانی لەگەڵ سەری زولفتدا بەستووە، تا ئەبەد واز ناهێنێت و پەیمان ناشکێنێ.

سر نکشد: واز ناهێنێ، پەشیمان نابێتەوە.

از سر پیمان نرود: پەیمان ناشکێنێ، پەیمان شکێنی ناکات.

دڵی خواجە هەر لە ئەزەلەوە پەیمانی دۆستی و عەشقی لەگەڵ زولفی یاردا بەستووە، واتە هەر لە ئەزەلەوە مرۆڤ پەیمانی (الست) ی لەگەڵ زولفی یار (مەعشوق) دا بەستووە و هەتا هەتایە ئەم پەیمانە ناشکێنێ و لە سەر بەڵێنی خۆی دەمێنێتەوە، لێرەدا ئەم خۆڕاگرییەی بۆ یار دووپات دەکاتەوە. (وەك بەیتی دووەم)

**٤- آنچه از بارِ غمت بر دلِ مسکین منست**

**برود از دلِ من وز دلِ من آن نرود**

ئەوەی کەلە باری غەمتەوە بەسەردڵی هەژاری منەوەیە گەرئەم دڵەی من لە ناویش چێت ئەو لەدڵم دەرناچێت.

برود این دل من: ئەم دڵەی من تیاچێت /لەناوچێت /بەخت کرێت.

لەڕاستیدا لە نوسخەی خرمشاهی دا ئەم بەیتە بەم شێوەیەیە:



**هر چه بار غمت بر دل مسکین منست**

**برود این دل من وز دل من آن نرود**

بەڵام ئەم شێوە ساغکردنەوەیە جۆرە لێلییەکی لە واتاکەدا دروستدەکات کە بەم شێوەیە ((هەرچی جگە لە باری غەمت بەسەردڵی هەژاری منەوەیە، ئەم دڵەم بڕوات و ئەو شتە (باری غەمت) لەدڵم دەرناچێت)) جەنابی قزوینی — غنی بۆ رەواندنەوەی ئەم لێلییە لەبری (این)ی میسراعی دووەم (از)ی داناوە (د.مهدی معینیان و خطیب رهبریش پەیڕەوییان لەم شێوەیە کردووە) کەماناکەی بەم شێوەیەیە: جگە لەباری غەمت هەرچی بەسەردڵمەوەیە دەڕوات و لەناودەچێت و ئەوەی دەمێنێتەوە لە دڵی مندا تەنیا باری غەم و عەشقی تۆیە.

ئێمە لێرەدا پەیڕەویمان لەشەرحی لاهوری کردووە کەمانایەکی گەڵێ قووڵتر بە بەیتەکە دەبەخشێت. خواجە لێرەدا دان بە درێژخایەنی عەشقی یار لە دڵی خۆیدا دەنێت و دەڵێ: هەرچی لەباری غەمی عەشقی تۆوە لە دڵمدا رواوە هەمیشە لەدڵمدا دەمێنێتەوە، تەنانەت کەئەم دڵەشم تیادەچێت و فانی دەبێت یا دەمرێت ئەو بەرهەمەی باری غەمت هەردەمێنێت، ئەم بۆچوونە لەگەڵ بۆچوونی جونەیدی بەغدادیدا یەکدەگرێتەوە کە پێی وایە عاشقان پاش مەرگیش لەو دونیا هەر بیردەکەنەوە و لە فکری مەعشوقدان کە دەفەرمووێ ((التفکر فی الدارین لاینقطع)) {لاهوری، ج ٢، ل ٩٩٧} .

**٥- آنچنان مهرِ توام در دل وجان جای گرفت**

**که اگر سر برود از دل و ازجان نرود**

خۆشەویستی تۆ والەدڵ و گیاندا جێگیربووە کە ئەگەر سەرم تیاچێت لەدڵ وگیانمدا ناڕوات.

آنچنان: ئاوا وا، بەوشێوەیە. جای گرفت: جێگیر بوو. سربرود: سەرتیاچێ.

لەڕاستیدا واتای ئەم بەیتە هەمان واتای بەیتی پێشووە و دەڵێ: عەشقت بەشێوەیەك لەدڵمدا جێگیربووە کە هەرگیز تەنانەت بەمەرگی دەرناچێت.

**٦- گر رود ازپیِ خوبان دلِ من معذور است**

**درد دارد چه کنم کز پیِ درمان نرود**

ئەگەردڵم بە دوی جواناندا بڕوات، مەعزورە (بیانوی هەیە) چونکە دەردی هەیە و گەر بەدوی دەرماندا نەچێت چی بکات.

دەردی دڵ جیابوونەوەیە لە مەعشوقی ئەو مەعشوقەی کە لە جوانییەکاندا جیلوە دەکات، دڵی غەمدیدەی عاشقانیش لەم دەردەی دوورییەدا جوانان بە دەرمانی فیراقی خۆیان دەزانن، ئەوان لەسەیری جوانییەکاندا جیلوەی جەمالی حەق دەبینن، بۆیە خواجە دەڵێ دڵی من

دەردەدارە و جوانانیش دەرمانی ئەو دەردەن گەرئەم دەردەدارە بڕوات بۆلای دەرمان بیانوی هەیە و بەخشراوە چونکە هەردەبێ وابکات و پێویستە بڕوات.

**٧- هرکه خواهد که چو حافظ نشود سرگردان**

**دل به خوبان ندهد وز پیِ ایشان نرود**

هەرکەس دەیەوێت وەك حافظ سەرگەردان نەبێت، دڵ نەدا بە جوانان و شوێنیان نەکەوێت.

دل ندهد: دڵ نەدات، عاشقیان نەبێت.

ئەم بەیتە — بەبڕوای بەندە — دوو جۆرە لێکدانەوە هەڵدەگرێت.

١/ پێکهاتە سینتاکسیانەی بەیتەکە ئەو لێکدانەوە سونەییەی کە دەگەیەنێت کە لە شەرحە پێشووەکاندا هاتووە و نووسراوە: هەرکەس دەیەوێت وەك حافظ سەرگەردان نەبێت، واز لە جوانانی دونیایی و مەعشوقان بهێنێت.

لێرەدا بەو واتایەدێت کە عەشق مرۆڤ سەرگەردان دەکات و لە ژیانی کۆمەڵایەتی دایدەبڕێت گەر ئەم ئامادییەت تێدانییە دوی عەشق مەکەوە.

یاخود لە رووی عیرفانییەوە کە رەتکردنەوەی هۆکار و پەیوەندییەکانی دەرەوەی مەعشوقی حەقە واتە رەتکردنەوەی بەیتی پێشووە کە عاشقی زاتی حەق نابێت لە پەردەکان — جوانان — بڕوانێت و جەمالی حەقیان تێدا ببینێت بەڵکو پێویستە راستەوخۆ و بێ پەردە لە جوانی حەق بڕوانێت و لە ئاودا سەیری مانگ نەکات بەڵکو چاو هەڵبڕێ بۆ ئاسمان.

واتە: حافظ پێیوایە سەیرکردنی ئەو جوانییەکانی دیکە (دروستکراوە جوانەکانی حەق) و گەڕان بەدوای جوانی حەقدا سەرگەردانییە و ئەو وایکردووە بۆیە ئامۆژگاری ئێمە دەکات و دەڵێ هەرکەسی دەیەوێ وەك من سەرگەردان نەبێت جگە لە جوانی حەق بەدوای جوانییەکانی دیکە نەکەوێت .

٢/ بەندە پێموایە کە واتای پراگماتیکیانەی بەیتەکە نزیکترە لە سیاقی گشتی و ئەسڵی غەزەلەکە و لەم خوێندنەوەشدا خواجە بەم رۆنانە دەیەوێ ئێمە زیاتر هان بدات بۆ شوێنکەوتنی جوانان. چونکە لە بەیتی پێشوودا ئەوان بە دەرمان دەزانێ. لێرەشدا بە مایەی سەرگەردانی بە پشت بەستن بە بەیتی پێشوو مانای ئەم بەیتە بە تەواوی هاندانێکی پێچەوانەیە.

ئەو دەڵێ: گەر دەتەوێ وەك حافظ سەرگەردان نەبی مەگەر خواجە سەرگەردان بووە تا ئێمەی شوێنکەوتەی سەرگەردان بین، ئەمە راست لەو هاندانە ئەچێت کە زانایەك دەڵێ: گەر ئەتەوێ وەك من نەخوێندەوار بیت واز لە زانست و زانیاری بهێنە، مەگەر ئەو نەخوێندەوارە، گەر نەخوێندەواری زانایی بێت زۆریش بەسوودە.



لەم روانگەیەوە من ئەم بەیتە بە هاندانی پێچەوانەی پراگماتیکی دەزانم و خواجە - بە رەچاوکردنی واتای گشتی غەزەلەکە و سیاقی گشتی هزری خواجە لە مەسەلەی جوانی پەرستیدا- بە ئێمە دەڵێ من سەرگەردانیم تۆش گەر ئەتەوێ وەك من سەرگەردان بیت — کەنیم — شوێن جوانان مەکەوە - واتە شوێنیان کەوە -.

## غەزەلی دووسەد و بیست دووەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفونی مەحزوف**
**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن)**

**١- ساقی حدیثِ سرو و گل و لاله می رود**
**وین بحث با ثالاثه ی غسّاله می رود**

ساقی باسی سەرو و گوڵ و گوڵاڵەیە و ئەم باسە بە شەڕاب نۆشینی (سیانەی غەسالە) بەردەوام دەبێ.

حدیث می رود: باس دەکرێت.   حکیمانە: بەجۆرە، بەم شێوەیە.

ثلاثه ی غساله: سیانەی پاککەرەوە، لای حەکیمە یۆنانییەکان مەینۆشی حەکیمانە سێ جۆرە بەڵام بەم شێوەیە: بەیانیان سێ پێکە کە لە سیانەی پاککەرەوە (ثلاثە غسالە) ناو دەبرێت و گەدە پاك دەکاتەوە، نیوەڕوان، پاش خواردنیش پێنج پێکە کە بۆ هەرسکردنی خۆراك سوودی هەیە و پێنجەی هەرسکەر (خمسە الهاضمە)ی پێ دەڵێن و پاشان ئێوارانیش حەوت پێك دەخۆنەوە کە بە حەوتەی خەوتوو (سبعە النائم) دەدرێتە قەڵەم بڕوانە {خرمشاهی، حافظ نامە، ل٧٧٤ — هروی، ج٢، ل٩٣٨ — لاهوری، ج٢، ل ١٢٩٥ - خطیب رهبر، ل٣٠٥ } لە د. غنی یەوە هەڵکراوە کە لە راغب اصفهانی وەریگرتووە: ((گوتراوە کە پێکی یەکەم تینوێتی دەشکێنێ و دووەم خۆراك بەتام دەکات و سێیەم دەروون شادوومان دەکات و لەمە زیاتر زیادەیە)).

لاهوری سەبارەت بە سرو و گوڵ و لالە و چۆنیەتی دانانی ئەم بەیتە داستانێکی خەیاڵئامێزی گێڕاوەتەوە کە لە سەرچاوەکانیش نقڵی کردووە لە شەرحەکەی لاهوریدا هاتووە: (لە (روضه السلاطین) دا هاتووە کە سوڵتان غیاث الدین والی پنگال، کە پاشایەکی گەورە و ئەدەب دۆست بووە، دەڵێن وەزیرێکی هەبووە بە نێوی (غساله)وە کە سێ کوڕی هەبووە بە ناوی (سرو — گل — لاله) دوە و هەمیشە لە گەڵ سوڵتاندا بوون ڕۆژێکی بەهار سوڵتان ئاهەنگێکی سازکرد، کاتێ کە لەگەڵ هەر سێ کوڕەکەی وەزیردا قسەی دەکرد، ساقی شەڕابی هێنا بەڵام کە بینی سوڵتان لەگەڵ ئەو سێ کوڕەی وەزیردا لە گفتوگۆدایە هەڵوەستەی کرد و نەڕۆیشت شەراب بگێڕێت و سوڵتانیش نیوەبەیتی یەکەمی گوت (ساقی حدیث سرو و گل و لاله می رود) بەڵام بەیتی دووەمی بۆ نەهات بە شاعیرانی دەووروبەری گوت کەسیان بۆیان



تەواو نەکرا تا ئەوەی کە گوتیان شاعیرێکی بەناوبانگ لە شیراز هەیە سوڵتانیش پەیکی بۆ لای خواجە نارد و قاسیدیش پاش ساڵێك بە دیاری بەخششی سوڵتانەوە گەیشت و حافظ بەیتەکەی تەواو دەکات و ئەم غەزەلە دەنووسێت { لاهوری، ج٢، ل١٢٩٩ }.

لەڕاستیدا ئەم داستانە خەیاڵئامێزە و لەڕاستییەوە نزیك نییە، هەرچەندە کە لەو جۆرە بەسەرهاتە لە کتێبە پێشینەکان و ژیان و بەسەرهاتی سوڵتان و خەلیفە و گەورەکاندا زۆر بەرچاو دەکەوێت کتێبی (اغانی اصفهانی) بەسەرهاتی زۆری لەم جۆرە تێدایە کە زیاتر لە قسەی سەر زاری مرۆڤی خۆش باوەڕ و سادەی ئەو سەردەمەوە وەرگیراون بە هەر حاڵ ناکرێ بۆ خاتری نیوە دێڕێك سوڵتانێکی گەورە دوو سێ ساڵێك چاوەڕێ بکات بەڵام هاتنی ناوی سوڵتان غیاث الدین لە کۆتایی بەیتی غەزەلەکەدا و هەندێ بەیتی غەزەلەکە پشت ئەستووری ئەم داستانەن هەرچەندە خوالێخۆشبوو (د. غنی) پێیوایە کە ئەم سوڵتانە ناوی یەکێ لە شازادەکانی ئال مظفره و سوڵتان بەشێکە لە ناوەکە { غنی، نقل از هروی، ل ٢٩٤٣ }

خوالێخۆش بوو (محمد دارابی — قرن ١١) یەکەمین راڤەکەری شیعری حافظ — لە شەرحی ئەم بەیتەدا سێینەی پاککەرەوە بە سێ پلە لە فەنای رێبواری رێگەی حەقدا دادەنێت کە فەنای کرداری و فەنای سیفاتی و فەنای زاتی — ن — {حافظ نامە، ج٢ ل٧٧٥ }.

خواجە روو بە ساقی دەڵێت کە باسی گوڵ و گوڵاڵە و دارسەروە لەڕاستیدا ئەمە یەکێکە لە دەربڕینە بێشومار و جۆراوجۆرەکانی حافظ سەبارەت بە بەهار و لێرەشدا مەبەستی لەوەیە کە کاتی بەهارە و باسی گوڵ و گوڵاڵە و سەرو لە ئارادایە و ئەم باسەش بە سێینەی پاککەرەوە بەردەوام دەبێ واتە شادی بەهار بە شەڕابی بەیانیانەوە خۆش و بەردەوام دەبێ ئەکرێ.

د. خطیب رهبر کە گومانی ئەوە دادەنێ کە ئەکرێ گوڵ و گوڵاڵە و سەرو ناوی خواستراوی سێ مەعشوق بن، لە مانای بەیتەکەوە دوورە { ل٣٦١، خطیب رهبر، حافظ }.

بە هەر حاڵ وەك زۆربەی غەزەلە عاشقانە و عارفانەکانی دیکەی خواجە سەرەتا ساقی و کەشێکی بەهاری عاشقانەی عارفانە و مەیی بەیانیانی عیرفانی / عاشقی ئەدوێت و بەردەوامی ئەو کەشە بە بەردەوامی بە یەکەوە گرێ ئەداتەوە.

**٢- مِیْ دە کە نو عروسِ چمن حدّ حسن یافت**
**کار این زمان زصنعتِ دلّاله می رود**

مەی بدە چونکە تازە بووکی مێرغوزار گەیشتە ترۆپکی جوانی، ئێستا ئیدی کار لە دەست کارزانی دەڵاڵ دێت.

حد: ترۆپك.   حد حسن یافت: گەیشتە ترۆپکی جوانی.

دلاله: دەلاڵ.

دەلاڵی مسراعی دووەم هەمان (مەی) میسراعی یەکەمە، بێگومان دەلاڵ ئەو ژنەیە دەلاڵی دەکات، لێرەشدا (مەی — دەلاڵ) هۆکارە بۆ بە یەك گەیشتنی عاشق و مەعشوق. خواجە دەڵێ: ئەی خاکی ئێستا کە بەهارە و گوڵ / یار (تازە بووکی گولزار) گەیشتۆتە ترۆپکی جوانی و لە جوانترین شێوەدا خۆی رازاندۆتەوە، شەرابمان بدەرێ با مەست بین و لە مەستی عەشقدا بە خزمەتی یار بگەین، چونکە ئەم مەیە وەك دەلاڵ وایە و عاشقان بە مەعشوقان دەگەیەنێت.

**٣- شکّر شکن مشوند همه طوطیانِ هند**

**زین قندِ پارسی که به بنگاله می رود**

شەکر کرمێن دەبن هەموو توتییەکانی هیند کاتێ کە ئەم قەندە فارسییە دیتە پەنگال.

شکر شکن: شەکر کرمێن.　　　شیرین کلام: قسە شیرین.

قند پارس: شەکری فارسی (مەبەست لە شیعری خۆیەتی).

بنگاله: پەنگال ناوچەیەکە لە نیمچە دوورگەی هیندیدا لە هیندستانی ئێستادایە.

واتە: کاتێ کە ئەم شیعرە فارسییەی من کە وەك شەکر شیرینە دەڕوات / یان خود دەبەن بۆ هیندستان هەموو شاعیر و قسەزان و حەکیمەکانیان قسەشیرین و زمان شیرین دەبن، چونکە ئەم شیعرانەی من هێندە شیرینن بکەونە سەر زارێك شیرینی دەکەن.

ئەم بەیتە پشتگیری لە رایەکی خوالێخۆشبوو لاهوری دەکات. کە لە سەرەتاوە تۆمارمان کرد چونکە باسی پەنگال و و مەسەلەی شاعیران و حەکیمانی پەنگال و شیرین کەلامی ئەوان و رۆیشتنی شیعری خواجە بۆ ئەوێ هەمووی بەڵگەی بوونی قاسیدێکی لەو شێوەیەن، رەنگە هەر خودی ئەم بەیتە بووبێتە ئیلهامی ئەو داستانە.

**٤- طیِّ مکان ببین و زمان در سلوكِ شعر**

**کاین طفل یکشبه رهِ یکساله می رود**

تەی کردنی شوێن و کات ببینە لە رەوتی شیعردا، کە ئەم منداڵە بە شەوێك رێگەی ساڵێك دەڕوات.

طی: تەی کردن، بڕین.　　　سلوك: رەوت.　　　یکشبه: یەك شەوە، بە شەوێك.

یکساله: ساڵێك.

خواجە لەم بەیتەدا باس لە کاریگەری و زوو بڵاوبوونەوەی شیعرەکانی خۆی دەکات کە بە زوویی بە دنیادا بڵاو دەبنەوە، بەرلەوەی کە لە واتای بەیتەکە بکۆڵینەوە لە چۆنیەتی خوێندنەوەی میسراعی دووەمی بەیتەکە دەکۆڵینەوە.



زۆربەی خوێندنەوە باوەکان (کاین طفل یکشبه راه یکساله می رود) (طفل یکشبه) ن واتە منداڵی یەك شەوە، واتە یەك شەوە سیفەتی منداڵە و لە (مضاف و مضاف الیه) ن.د. خرمشاهی لە { ذهن و زبان حافظ) دا، ل ١٥٣، چاپ هفتم، ١٣٨٠، انتشارات زاهید، تهران، هەروەها لە حافظ نامەشدا (طفل) و (یکشبه) ی لێکدی جودا کردۆتەوە} واتە (کاین طفل یکشبه راه یکساله می رود).

بەڵگەی د. خرمشاهی بۆ ئەم شێوە خویندنەوەیە یەکەم: پەیوەندی رۆیشتن و منداڵی یەك شەوەیە کە دەڵێ کەسی چاوەڕوانی رۆیشتن لە منداڵی یەکشەوە ناکات. دووەم: ئەگەر بشتوانێ بڕوات ئەم گرفتە هەیە کە ئاوەڵکاری رستەکە ون دەبێت، کاتێ کە رێگەی یەك ساڵە دەبڕێت بە چ کاتێك رێگەی یەك ساڵ دەبڕێت لەڕاستیدا ئەم خوێندنەوەیە دوو بەڵگەی دروستی هەیە کە ئەمانەن:

١ / لە نێوان (مکان و زمان و یکشبه و راه یکساله) دا لف و نشر (پێچان و کردنەوە)ی ناڕیك هەیە و لە نێوان (مکان راه یکساله و زمان و یکشبه) دا هەماهەنگی هەیە، واتە لە زەمانی یەك شەودا مەکانی ریگەی دریژی یەکسال دەبڕیت. بەم پێیەش پێویستە لەڕووی ڕەوانبێژییەوە (یکشبه) ئاوەڵکار بێت نەك ئاوەڵناو.

٢/ لەڕووی واتاییەوە بە هۆی هاتنی (زمان و مکان)ەوە هاتنی (یکشبه) لە ئەرکی ئاوەڵناویدا لەنگی دروستدەکات و پێویستە ئاوەڵکار بێت.

خوێندنەوەکەی د. خرمشاهی لەڕووی کێشناسی یەوە گرفتێکی هەیە چونکە بەو خوێندنەوەیەی جەنابیان بڕگەیەکی میسراعی دووەم کەم دەبێتەوە.

هەرچۆن بێت لە هەردوو خوێندنەوەکەدا خواجە وەسفی شیعری خۆی دەکات کە منداڵێکە کەچی لە ماوەی یەك شەودا رێگەی یەك ساڵ دەبڕێت و ناوبانگی دەگاتە شاران. خواجە دەڵێ: سەیری رەوتی شیعر کەلە تەی کردنی زەمان و مەکاندا چەندە خێرایە، رێگەی یەکساڵ بە یەك شەو دەبڕێت.

گوتراوە کە ماوەی نێوان شیراز و پەنگال ساڵە رێیەك بووە و خواجە مەبەستی لە مەیە بێگومان ئەم رایەش پشت ئەستورییەکی دیکەی داستانەکەی (روضه سلاطین)ە.

**٥- آن چشم جادوانەی عابد فریب بین**

**کش کاروان سحْر ز دنباله می رود**

ئەو چاوەساحیرانەی عابد فریودەر ببینە کە کاروانی جادووی بەدوادا دەڕوات.

جادوانه: ساحیرانە، جادووگەر ئاسا.　　　عابد فریب: عابد فریودەر.

سحر: سیحر، جادوو.        ز دنباله: به دوادا.

وەك هەمیشە خواجە لە وەسفی چاوی یار و جادووگەری ئەو چاوەدا هێندە بە جادووگەری دەزانێت عابید و لە خواترسەكان هەڵدەخەڵەتێنێ و فریویان دەدات، ئەو چاوە كە هێندە جادووگەر و سیحر بازە كە سەرقافڵەی ساحیرەكانە و كاروانی سیحر بە دوای ئەودا دەڕۆن، یاخود ساحیرەكان و كاروانی سیحری پێناگات و لە پلەی دوای ئەودا دێن.

**۶- از ره مرو به عشوه‌ی دنیا که این عجوز**

**مکّاره می نشیند و محتاله می رود**

بەناز و عیشوەی دنیا لەڕێ لامەدە چونكە ئەم پیرەژنە بە مەكر و فریوەوە دانیشێ و بە حیلە و فیڵێك دەڕوات.

از ره مرو: لەڕێ لامەدە.        عجوز: پیرەژن، مەبەست دونیایە.

مكاره: بە مەكر و فریوەوە.        **محتاله** : ژنی حیلەگەر و فێڵباز.

خواجە دونیا بە پیرەژنێكی فیڵبازی فریودەر دەداتە قەڵەم — ئەم جۆرە ناونانە لای خواجە چەند جار دووبارە بۆتەوە — كە بە مەكر و فریوەوە خۆی دەردەخات و لەگەڵت دادەنیشێ كەچی بە فڕوفێڵ و حیلە دەڕوات. بۆیە لەگەڵ ئەم وەسفەدا ئامۆژگاری دەكات و دەڵێ: بەناز و عیشوەی دنیا فریو مەخۆ و لەڕێی راست لامەدە.

**۷- بادِ بهار می وزد از گلستانِ شاه**

**وز ژاله باده در قدحِ لاله می رود**

بای بەهار هەڵدەكات لە گوڵستانی پادشاوە، لە كاتێكدا كە شەونم وەك شەراب دەكرێتە پێكی گوڵاڵەوە.

گلستان: باخی پڕ لە گوڵ.        ژاله: شەونم.

لێرەدا پەڕەكانی گوڵاڵە بە پێكی شەراب چوێنراوە و شەونمیش كە بە سەر پەڕەكاندا دەتكێ بە شەراب، دەڵێ كاتێ كە شەرابی شەونم دەكرێتە پێكی گوڵاڵەوە — واتە كاتی بەرەبەیان — بای بەهاری لە باخی رازاوەی پڕ لە گوڵی پادشا - سوڵتان غیاث الدین - دا هەڵدەكات.

**۸- حافظ ز شوق مجلسِ سلطان غیاث دین**

**غافل مشو که کار تو از ناله می رود**

حافظ لە شەوقی مەجلیسی سوڵتان غیاث الدین بێ ئاگا مەبە چونكە كاری تۆ بە ناڵە مەیسەر دەبێ.



سلطان غیاث الدین: سلطان غیاث الدین كوڕی سوڵتان ئەسكەندەر سوڵتانی پەنگاڵ، هاوسەردەمی حافظ بووە كە لە ساڵی (١٦٨١) فەرمانڕەوایی پەنگاڵی گرتۆتە دەست. {ذبیح الله صفا، تاریخ ادبیات ایران، ج٣، ل ١٦٠٩} د.صفا، هەروەها د. هروی لەوەوە داستانی چۆنیەتی دانانی ئەم غەزەلەی بەكورتی باسكردووە كە ئێمە لە بەیتی یەكەمدا بە درێژی باسمان كرد {صفا، ل ؟ - هروی ل٩٤٣}.

لێرەدا خواجە باسی مەجلیسی ئەو سوڵتانە و ئارەزووی شەوقی خۆی بۆ ئەوێ دەكات و پێشی وایە كە بە ناڵەی شەوان و راز و نیاز ئەم ئارەزووەی دێتە دی و بەوێ دەگات.

## غەزەلی سەد و بیست و سێ:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفونی مەحزوف**
**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن)**

**١- ترسم که اشک در غم ما پردەدر شود**
**وین رازِ سر به مُهر به عالم سمر شود**

ئەترسم کە ئەشك لە غەمی ئێمە پەردەدڕ بێت و ئەم رازە سەربە مۆرە ببێتە قسەی جیهان.

پردەدر: پەردەدڕ، پەردە هەڵدەرەوە، ئاشکراکەر.    سر به مهر: سەر بە مۆر.

سمر: ئەفسانە، قسەی شەوان.

سمر شدن: قسەکردن لە شەودا، ئەفسانە گوتن، بڵاوبوونەوە.

غەمی عەشقی خواجە کە غەمی عەشقی حەقیقییە و لە پەیمانی ئەزەلییەوە سەرهەڵدەدات و لەدڵیدا شاراوەتەوە بەڵام چاو توانای پاراستنی ئەم ئاگرەی دڵی نییە و بە فرمێسکی چاوان ئاشکرا دەبێت.

خواجە ئەم ترسەی هەیە بۆیە دەڵێ ئەترسم ئەشك لە غەمی ئێمەدا ببێتە پەردەدڕو ئاشکراکەری رازی سەربەمۆری غەمی عەشقی ئێمەی عاشقان و ئەم رازەمان بەجیهاندا بڵاوبێتەوە و ببینە بنێشتە خۆشەی سەرزاران.

لە هەندێ نوسخەدا وەك هروی، عیوچی دا لە بری (در) (بر) هاتووە،کە جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە، بەڵام (در) جوانترە و دروستترە.

**٢- گویند سنگ لعل شود در مقام صبر**
**آری شود و لیک به خونِ جگر شود**

ئەڵێن بەسەبر بەرد ئەبێتە یاقوت و گەوهەر، ئەرێ ئەبێت بەڵام بەرەنج و خەم خواردن دەبێت.

گویند: ئەڵێن.    لعل شود: ئەبیتە گەوهەر و بەردی بەنرخ.

به خون جگر: بە خوێنی جگەر، ئیدیەمێکە بە واتای رەنج و عەزاب کێشان و هیلاك بوون لە کارێکدا دێت.

((بوونە یاقوتی بەرد))

دانا و زانایانی کۆن لەو باوەڕدا بوون کە گەوهەر یا لەعل کە بەردێکی گرانبەهایە لە بەردی ئاساییەوە بە دەستدێت، ئەمەش لە ئەنجامی تێپەڕینی کاتێکی زۆر و لە بارودخێکی



سروشتی تایبەتدا کە سەبر و ئارامیی دەوێ خواجە دەڵێ: کاتێ دەڵێن گەر سەبر بگرێت بەرد ئەبێتە لەعل راست ئەکەن بەڵام گرفت لەوەدایە ئەم سەبر و ئارام گرتنە رەنج و عەزابی زۆر زۆرە و زۆر ناڕەحەتە.

ئەکرێ سنگ و لەعل، قۆناغی خاوی و پوختەیی عارف بن، کە سەبر مەرجی گەیشتنە بە مەبەست و پوختەیی، لێرەدا خواجە زیاتر جەخت لە گرانی و ناڕەحەتی سەبر دەکاتەوە، هەرچەندە بەرهەمەکەشی زۆر گرانبەها و بە قیمەتە.

**٣- خواهم شدن به میکده گریان و دادخواه**
**کز دستِ غم خلاصِ من آنجا مگر شود**

دەمەوێ بە گریان و هاواری شکاتەوە بڕۆم بۆ مەیخانە چونکە بێگومان لەوێ من لە دەست غەم رزگارم دەبێت

خواهم: دەمەوێ.    شدن: رۆیشتن.    خواهم شدن: دەمەوێ بڕۆم.

گریان: بەگریانەوە.    دادخواه: زوڵم لێکراو، شکات.

خلاص: ڕزگاری، نەجات.

مگر: مەگەر - لە زمانی فارسیدا سەرباری رۆڵەکانی (مەگەر) لە زمانی کوردیدا رۆڵی ئاوەڵکار جەختکردنەوە و دڵنیایی دەبەخشێت کە لێرەدا ئەو واتایەی هەیە کەلە کوردیدا بەرامبەر ئەم واتایەی مەگەر - بێ گومان.

وەك هەمیشە حافظ مەیخانەی عەشق / مەقامی موناجات بەشوێنی رزگاربوون لەخەم و خەفەت دەزانێت، بۆیە لەناو زوڵم و خەفەتی دونیا دەڵێت، دەمەوێ بەگریان و شکاتی مەزڵومانەوە بڕۆم بۆمەیخانە بکەومە موناجات لەگەڵ مەعشوقدا، چونکە دڵنیام لەوێ لەخەم رزگارم دەبێت.

گەر (مگر) لەواتای مەرجیدا — هەمان واتای کوردی — بەکارهێنرابێت، ئەوا واتای بەیتەکە بەم شێوەیە:

دەمەوێ بە گریان وشکاتەوە بڕۆم بۆمەیخانە، لەهیچ کوێ لەغەم رزگارم نەبوو، مەگەرلەوێ لە غەم رزگارم ببێ.

**٤- ازهرکرانه تیردِعا کردەام روان**
**باشد کزین میانه یکی کارگر شود**

لەهەر لایەکەوە تیری نزام هاویشتووە، بەڵکو یەکێکیان کاریگەربێت (قەبووڵبێت).

کرانه: لا،کەنا.    کردەام روان: هاویشتوومە.    کارگر: کاریگەر.

خواجە لێرەدا باس لە زۆری نزا و پاڕانەوەکانی خۆی دەکات و دەڵێ لە هەرگۆشە و لایەکەوە تیرێکی نزام هاویشتووە هەر دوعام کردووە، بەڵکو لەم نێوەندەدا، لە نێو ئەم هەموو نزایەدا یەکێکیان قەبووڵبێت و کاریگەر بێت.

**٥- ای جان حدیث ما برِ دلدار بازگو**

**لیکن چنان مکن که صبا را خبر شود**

ئەی گیانەکەم لای مەعشوق باسی ئێمە بکە، بەڵام وا مەکە سروە (سەبا) خەبەرداربێت (بزانێت).

حدیث ما: باسی ئێمە. بر: لای. بازگو: بگێڕەوە، باسی بکە. چنان: وا

مکن: مەیکە، نەیگێڕەوە. خبر شود: خبرداربێت، بزانێت.

لە نوسخە جیاوازاەکاندا شێوەی جیاوازی ئەم بەیتە دەبینرێت، کە لە لاهوریدا لە بری (جان) (دل) هاتووە، هەروەها لە (هروی) لەبری (لیکن) (ما) هاتووە و لە تەواوی نوسخەکان جگە لە عیوضی لە بری (مکن) (مگو) هاتووە، ئەم شێوە بەندە نووسیویەتی لەنوسخەی عیوضی وەرگیراوە.

لاهوری کە (ای دل)ی هێناوە دڵ بە هۆکاری بەرزەخی نێوان جەستە و خواوەند دەزانێت، بۆیە خواجەی مرۆڤ داوا لە دڵ دەکات کە باسی ئێمەی (عاشقان) لای مەعشوقی حەق بکات تاوەکو بەزەیی بەحاڵماندا بێتەوە.

بەڵام (ای جان) کەسەکە نادیارە و نازانرێ خواجە بەکێ دەڵێت لای مەعشوق باسیبکات تەنیا ئەوەندەیە بە گیانەکەم و ئەزیز نێوی دەبات. کە لای مەعشوق باسی حاڵیان بکات.

وردی و بڵندی بەیتەکە لە میسراعی دووەمدایە کە چۆنیەتی دەربڕینی قسەکە و خەبەردار نەبوونی سەبا لە بوونی (پەیوەندی سەبا و مەعشوق) دا دوو لێکدانەوەی جوان دەهێنێتە ئاراوە.

١- سەبا کە مەحرەمی حەرەمی مەعشوقە و گشت سپێدەیەك بۆنی خۆشی ئەو بۆ شاعیر دەهێنێ، ئێستا ئەم دەیەوێ سەباش نەزانێت، بەم لێکدانەوەیە خواجە دەیەوێ گرنگی پاراستنی رازەکە بە قاسید (ای جان) بڵێت، پێی دەڵێ: باسی حاڵی ئێمە لای مەعشوق بکە، بەڵام هێندە بەنهێنی و ئەسپایی باسی بکە کەتەنانەت سەباش نەزانێت کە مەحرەمی رازی حەرەمی یارە. واتە هێندە بە ئەسپایی کە نزیکترین مەحرەمیشی نەزانێت.

٢- سەبا کە قسە هەڵبەست و بڵاوکەرەوەی نهێنی و رازەکانی مەعشوقە و لای خواجە بڵاوکردنەوەی بۆنی پرچی مەعشوق لەلایەن سەباوە ئەو رەخنەیە لەسەبا دێنێتە ئاراوە کە سەبا بۆن و رازەکە بەسەرهەمووواندا پەخشدەکات. لەم روانگەوە — سەبا — مانایەکی نێگەتیڤی



(قسە هەڵبەست و فرەبڵێ) دراوەتی پاڵ. بۆیە خواجە بە (ای جان) دەڵێ بە ئەسپایی با سەبا ئاگادارنەبێ چونکە سەبا زۆربڵێیە و ئەم باسە بە هەموو لایەکدا بڵاو دەکاتەوە.

**٦- در تنگنای حیرتم از نخوت رقیب**

**یارب مباد آنکه گدا معتبر شود**

لە خۆبەزلزانینی رەقیب زۆر سەرسامم، خوا نەکات گەدا بەناوبانگ بێ.

تنگنا: شوێنی تەنگ، تەنگەڵان. حیرت: سەرسامی.

در تنگنای حیرتم: لە تەنگەڵانی سەرسامیدام، واتە زۆر سەرسامم.

نخوت: خۆبەزلزانین، خۆپەرستی.

معتبر: بەناوبانگ، دەسەڵاتدار و دەستدار.

ڕەقیب دەرگاوانی مەعشوقە، کە خۆی لە خۆیدا دەرگاوانی پیشەیەکی زۆر ئابڕوومەندانە نییە، بەڵام رەقیب عاشقی داعیەداری هیچ لە باردانەبوو دنیایەك کیبر هەیە و - بەم پلە و پایەیە - کە پلە و پایە نییە، فیز و خۆبەگەورە زانینی هەیە، بۆیە خواجە دەڵێ زۆر سەرسامم لەم فیز و تەکبورەی رەقیب بە بێ هیچ خۆی بە زل دەزانێت، پاشان دوعا دەکات کە: خوایە مرۆڤی هیچ و سووك (گەدا) نەبێتە هیچ و ناوبانگ پەیدا نەکات. واتە رەقیب بە بێ هیچ ئاوا فیزی هەیە ئاخۆ ئەگەر شت بێت چی دەکات خوایە نەیکەی بە هیچ.

لاهوری ڕەقیب بە بای سەبا ئەداتە قەڵەم، بەڵام ئەکرێ رەقیب عاشقانی رواڵەتی، یا سۆفیلکە ریابازەکان بن، بە بێ هیچ عەشق و عاشقییەك فیزیان هەیە، لە کاتێکدا لە دەرگای حەرەمی مەعشوق ئاودیو نەبوون.

**٧- از کیمیایِ مهر تو زر گشت رویِ من**

**آری به یمن لطف شما خاك زر شود**

لە کیمیای خۆشەویستی تۆوە رووی من بووە زێڕ، ئەرێ بە بەرەکەتی لوتفی تۆ خاك دەبێتە زێڕ.

کیمیا: زانستی ئاسن و تەنەکە و ماددەی تر کردنە زێڕ و زیو.

زرگشت: بووە زێڕ. یمن: بەرەکەت. زر شود: دەبێتە زێڕ.

خواجە عەشقی یار و لوتفی یار بە کیمیا دەزانێت کە ئاسن و تەنەکە و توخمی دیکە دەکاتە توخمی گرانبەها دەڵێ: کیمیای عەشقی تۆ رووی منی کردە زێڕ و بەهۆی عەشقی تۆوە من گەورە بووم، میسراعی دووەم تەئکید و جەختە لە سەر ئەم واتایە: ئەرێ بێگومان بە

بەرەکەتی لوتفی تۆ (کیمیای لوتفت) من کە خاکم دەبمە زێڕ گەورە دەبم، واتە بە عەشقی حەق مرۆڤی خاکی گەورە و بڵند و بە بەهادەبێ و وەك زێڕی لێ دێ.

**٨- بس نکته غیر حسن بباید که تا کسی**

**مقبولِ طبع مردم صاحب نظر شود**

جگە لە جوانی پێویستە خاڵی دیکەی زۆر هەبێت، تا کەسێك بچێتە جێگەی ڕەزامەندی خەڵکی خاوەنڕا. ئەم بەیتە یەکێ لەو بەیتانەی کە خواجە مەرجەکانی جوانی و پەسەندی کەسێکی تێدا دەخاتەڕوو، کە تیایاندا جوانی دەرەکی ناکاتە مەرجی بنچینەیی، لێرەشدا دەڵێ: تەنیا جوانی مەرجی ئەوە نییە کە کەسێك بێتە جێگەی ڕەزامەندی خاوەنڕایان و عاقڵان، بەڵکو جگە لە جوانی خاڵی زۆر هەیە کە پێویستە لە کەسێکدا هەبێت بۆ ئەوەی خاوەنڕایان ئەو پەسەند بکەن.

**٩- این سرکشی که کنگرەی کاخ وصل راست**

**سرها بر آستانەی او خاكِ در شود**

ئەم بەرزییەی کە پاساری کۆشکی وەصل هەیەتی، سەری زۆر لە بەر دەرگایدا دەبنە خاکی بەر دەرگای.

سرکشی: بەرزی، سەرکێشی.    کنگرە: پاسار.    کاخ: کۆشك.

خاك درشود: دەبنە خاکی بەردەرگا و سەرەڕێ، دەمرن.

خواجە لە بێ نیازی مەعشوق ئەدوێ، ئەو مەعشوقەی کە لە کۆشکی بەرز و بڵندایە و وەسڵ و ژوان لەگەڵ ئەودا لە کۆشکێکی بەرز و بڵندی پاسار و حەسار بەرز ئەچێ کە چوونە ژوورەوە بۆ ژوانی ئەو مەحاڵە، بۆیە هێندەی عاشق لە بەر دەرگادا چاوەڕێیان کردووە کە سەریان بووەتە خاکی سەرەڕێی بەردەرگا، واتە مردوون و سەریان ڕزیوە و بووەتەوە بەخاك، یاخود سەریان خستۆتە بەردەرگا و ئاستانەی یار تا بەڵکو ڕەحمیان پێ بکات، کە ئەم لێکدانەوەی دواییان دروستترە بەرچاودەکەوێ.

واتە: کوشکی ژوانی یارهێندە سەخت و بەرزە کەس بەهەوڵی خۆی پێی ناگات بۆیە عاشقان سەردەخەنە بەرپێی یار و لە بەردەرگایدا کەوتوون تارەحمیان پێ بکات.

**١٠- حافظ چو نالەی سرِ زلفش بەد ست توست**

**دم درکش ارنە بادِ صبا را خبر شود**

حافظ ئێستا کە نافەی سەری زوڵفی لەدەستی تۆدایە، بێدەنگ بە، ئەگەرنا بای سەبا نهێنی ئاشکرا دەکات.



دم درکش: بێ دەنگ بە.    ارنە: ئەگەرنا.

خواجە بەخۆی دەڵێ: تۆکە دەزانی سەبا زۆر زۆر نزیکە لەحەرەمی یار و گەرنهێنییەکیشی بزانێت یەکسەر بڵاوی دەکاتەوە.

ئێستاکە سەرکەوتوو بوویت و سەری زوڵفی یار کەنافەی پڕ لەمیسکە کەوتووەتە دەست و بەمەرامی خۆت گەیشتوویت بێ دەنگ بە، ئەگەرنا سەبا دەزانێت و ئەم نهێنییە بەهەموو لایەکدا بڵاودەکاتەوەو پەردەلەسەر ڕازەکەت لادەدات.

لەڕاستیدا ئەم بەیتە و تەنانەت نەسەقی گشتی غەزەلەکەش جەختکردنەوەی ئاشکراو و ڕاستەوخۆیە لەپاراستنی نهێنی نێوان عاشق و مەعشوق و هۆی بەردەوامی ئەو عەشقە. کە حافظ و زۆربەی عارفەکان جەختی لەسەر دەکەنەوە بەمەرجی بەردەوامی ئیلاهی دەزانن.

شەرحی عیرفانی بەیتەکە لە (نافەی سرزلف) دا قەتیس دەبێتەوە کە بریتییە لە بۆنی سیفاتی ئیلاهی.

واتە ئێستا کەتۆ بەسیفاتی ئیلاهی ئابڕوومەند بوویت بێدەنگ بە و بڵاوی مەکەرەوە.

## غەزەلی دوو سەد و بیست و چوار:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی مەحزوف**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)**

**١- گرچه بر واعظِ شهراین سخن آسان نشود**

**تا ریا ورزد و سالوس مسلمان نشود**

گەرچی ئەم قسەیە لای واعیزی شار ئاسان نییە، تا ریابازی و فریودەری بکات موسڵمان نابێت.

تا ریا ورزد: ریاکاری بکات.    سالوس: زمانلوسی، بەزمانی لووس خەڵکی فریودان، فریو.

لێرەدا خواجە رەخنە لەواعیزی شار - واتە کۆلکە مەلای فریودەری زمانلوسی خۆ بەخواناس پیشاندەر کەخەریکی ریاکاری و فریودانی خەڵکەبەناوی ئایینەوە - دەگرێت و دەڵێ: گەرچی ئەم قسەیەی من دەیکەم لە سەرشانی واعیزی شار ئاسان نییە، بەڵکو لەسەر شانی گرانە و پێی ناخۆشە بەڵام بەم شێوەیە خەریکی ریازی و فریودانی خەڵکی بێت، موسڵمان نییە موسڵمان بوون واتە راستگۆیی و سەرراستی، نەوەك ریاو فریودان.

**٢- رندی آموز و کرم کن که نه چندان هنراست**

**حَیَوانی که ننوشد می و انسان نشود**

فێری رەندی ببە و بەخشندەبە، چونکە هونەرێکی زۆر نییە کەحەیوانێ مەی نەنۆشێت و نەبێتە مرۆڤیش.

آموز: فێربە.    کرم کن: بەخشندە بە، کەرەمت هەبێت.

لەئاستی سەرەوەی بەیتەکەدا و واتای نزیکی (حەیوانێ مەی نەخواتەوە و نەشبێتە مرۆڤ) بەم شێوەیەیە:

خوا بە واعیزی شار دەڵێ واز لەفریو و ریا بێنە و فێری ژیانی رەندی — واز هێنان لە غەیر خوا - ببە چاکەکار و بەخشندەبە. چونکە هیچ هونەرێکی گرنگ نییە کە گیاندارێك (قۆناغی مرۆڤ پێش گەیشتن بە مانا باڵاکانی ژیان و مرۆڤایەتی) مەی — کەلای واعیز خواجە خراپە — نەخواتەوە و کەچی نەبێتە مرۆڤ هەموو خراپییەکەی کە بکات. واتە ئەی واعیز کە تۆ بەردەوام دەڵێی مەی خراپە و مەی ناخۆیتەوە- ئەڵبەت مەی خۆشەویستی و عەشقی حەقە- ئەی بۆچی نابیت بەمرۆڤی چاك و هەر خەریکی ریا و زمانلوسیت.



لەئاست قووڵی بەیتەکەشدا و لە واتای دووری حەیوانێ مەی نەخواتەوە و نەشبێتە مرۆڤ) بەم جۆرەیە:

وەك گوتمان (حیوان) قۆناغی بەر لەپێگەیشتنی مرۆڤە لەڕووی مانا بەرزەکانەوە، ئەو مانا و چەمکانەی کەبەردەوام لەجیهانی فریشتەی نزیك دەکاتەوە و لەجیهانی حەیوانی دوور دەخاتەوە.

لێرەدا خواجە واعیزی بەمرۆڤی قۆناغی حەیوانی دەزانێت. بۆیە پێی دەڵێ ئەی واعیز مانەوە لەقۆناغی حەیوانیدا و گەشەنەکردن بۆ بڵندی (کەسێ کە مەیی موحیبەت نەخواتەوە و نەبێتە مرۆڤ) ئازایەتی نییە، بۆیە تۆ گەردەتەوێ هونەرت هەبێت فێری رەندی ببە روو لە غەیری مەعشوقی حەق وەرگێڕە و چاکەکار و بەخشندەبە. چونکە ئەم دوو سیفەتە و خواردنەوەی شەڕابی عەشقی ئیلاهی مرۆڤ گەورە دەکات و لەقۆناغی حەیوانییەوە دەیگەیەنێتە قۆناغی مرۆڤی.

لەڕوانگەی عیرفانیشەوە واتای بەیتەکە دەبێتە:

ئەی واعیزی خۆپەرست تۆ فێری رەندی ببە کەرەندی روو وەرگێڕانە لە هەرچی شتی غەیری مەعشوقی حەقە و بەخشندەبە، کەبەخشندەییش فیداکردنی خودە لەپێناو زاتی حەقدا هەروەها مەیی موحیبەتی حەق بخۆرەوە و خۆت بەقۆناغی مرۆڤبوون بگەیەنە چونکە ئازایەتی نییە کە مرۆڤ هەر لەقۆناعی حەیوانیدا بمێنێتەوە و مەیی موحیبەت و عیرفان نەخواتەوە.

لەهەندێ نوسخەدا لەبری (ننوشد) (بنوشد) هاتووە، لەگەڵ ئەوەی لەنوسخە باوەڕپێکراوکاندا شێوەی یەکەم هاتووە، بەڵام گەر (بنوشد) بێت واتاکە دەبێتە کەسێ کە مەی بخواتەوە و کەچی نەشبێتە مرۆڤ، واتە هەر بەقسە لەعەشق بدوێت و کاریگەری لەسەری نەبێت.

**٣- گوهرِ پاك ببايد كه شود قابلِ فيض**

**ورنه هر سنگ و گلی لؤلؤ و مرجان نشود**

پێویستە گەوهەری پاك هەبێت تابتوانێ فەیز بگرێتە خۆی، ئەگەرنا هەر بەرد و کڵێك نابێتە لوئلوئ و (مرواری)مەرجان.

فیض: لافاوی بەرەکەت و رەحمەتی ئیلاهی.

خواجە لەبەردەوامی قسەکانی لەگەڵ واعیزی شاردا دەڵێ: فەیزی ئیلاهی بەگەوهەر و فیترەتی پاك هەیە و گەرمرۆڤ گەوهەری پاك نەبێت توانای وەرگرتنی فەیزی ئیلاهی ناگرێت تاگەورە ببێت هەروەك چۆن هەموو بەرد و کڵێك نابنە یاقوت و مەرجان.

واته پێویسته مرۆڤ بۆ گۆڕان بەرەوچاکی خاوەن ئامادەیی خودی بێت و گەرئەم ئامادەییە نەبێت توانای گۆڕانی نییە: لەڕاستیدا خواجە دەیەوێ بە کنایە و درکە بە واعیز بڵێت تۆ ئامادەیی بوونە مرۆڤی کامڵت تێدا نییە باهەر شت بزانێت.

**٤- اسم اعظم بکند کارِ خود ای دل خوش باش**

**که به تلبیس و حِیَل دیو مسلمان نشود**

ئەی دڵ دڵخۆش بە چونکە گەورەترین ناوی خوا (اسم اعظم) کاری خۆی دەکات و بە خۆگۆڕین و فریوکاری دێو نابێتە موسڵمان.

اسم اعظم: گەورەترین ناوی خوا، کەلەنێو زانایاندا بەشاراوەیی ماوەتەوە تا ئێستا یەکلانەبۆتەوە هەندێك بە الله یا الله اکبر یا حی و قیوم ی ئەدەنە قەڵەم.

تبلیس: خۆگۆڕین.          حیل: فڕ و فێڵەکان (کۆی فڕوفێڵ ـ حیله).

لەڕاستیدا ساغکردنەوەی ئەم بەیتە لەنێو حافظ ناس و لێکۆڵەر و رەحنەگرە گەورەکانی ئێراندا مقۆمقۆ و لێدوانی زۆری هێناوەتە ئارا و بوونەتە دوو دەستە هەردەستەیەك کۆمەڵێك بەڵگەی بۆ سەلماندنی رایەکانی خۆی هێناوەتەوە ئەو جیاوازییەش لە (مسڵمان نشود/ سلیمان نشود) دایە، واتە موسڵمان دێو و سولەیمان بوونی دێۆن. بەرلەوەی کەلەرای دەستە جیاوازەکان بدوێین بەندە بڕوام وایە کە بەڵگە و رای هەردوو دەستە کە رازیکەرانەیە و قەناعەت بە خوێنەر دەهێنن لەسەر راستی هەریەکەیان، بۆیە پێویستە پشت بە هۆکارێکی دیکەی جگە لەلایەنی واتا ببەستین. کەئەویش هاتنی شێوەیەکیان و نەهاتنی شێوەیەکەی دیکەیانە لەزۆرینەی نوسخە دێرینەکاندا (بێگومان — درعباس زریاب خوئی- ئاماژە بەم بنەما زانستییە دەکات) {حافظ نامە، ج ٢، ل ٧٨٤}.

لەسەر ئەم بنەمایە کە سەیری نوسخە دێرینەکان بکەین دەبینین لەکۆی هەشت نوسخەی دێرینی نێوان سالآنی (٨١٣) کۆچی تا(٨٢٧) ی کۆچیدا واتە پاش چارەکە سەدەیەکە تا سێ ساڵ لەکۆچی دوای حافظ ـ لەحەوت نوسخەیاندا ئەم غەزەلە هاتووە و لەنوسخەی کتێبخانەی ئاسەفییەی حیدرئابادی هیندستان (٨١٨) دا نەهاتووە، لەکۆی ئەو حەوت نوسخەیەشی کە ئەم غەزەلەیان تێدایە لە پێنج نوسخەی سالآنی (٨١٣، ٨١٩، ٨٢٢، ٨٢٤، ٨٢٥) دا کە دێرینترین نوسخەکانی دیوانی حافظن (مسلمان نشود) هاتووە، لەدوو نوسخەی سالآنی (٨٢١، ٨٢٧) دا (سلیمان نشود) هاتووە لەدیوان {حافظ براساس هشت نوسخەی کامل کهن، مؤرخ سالهای ٨٠٣- ٨٢٧ هجری قمری + تدوین و تصیح، د.رشید عیوضی، تهران ١٣٧٦ انتشارات امیر کبیر ص ٢٤٦}.



بەم پێیە (مسلمان نشود) شێوەی رەسەنتر و دێرینتری بەیتەکەیە.

ئەو بەڕێزانەی بە (سلیمان نشود) مانایان کردووەتەوە (د.عیوضی، لاهوری، خلخالی، پژمان بختیاری، هومن، د. هروی، دشتی، لیمودهی...)ن بەڵام (قزوینی، خانلری، خرمشاهی، اردشیر بهمنی، د.شفیع کدکنی، احمد سمیعی، عباس زریاب خوئی) کە - وەك ئاماژەیان پێدا - زیاتر لەسەر بنەمای نوسخەی رەسەن و دێرین ساغی کردۆتەوە ـ کە د.خرمشاهش ئاماژەی بەم حاڵەتەداوە ـ بەڕێزەکانی دیکە بەڵگەی واتاییان کردۆتە پشتیوانی رایەکانیان.

واتای بەیتەکە بریتییە لە: ئەی دڵ خۆشحاڵ بە و دڵخۆش بە چونکە بوونە سولەیمان/موسوڵمان ناوی پیرۆز (پشتیوانی حەق و هیدایەتی ئیلاهی) پێویستە و هەر دیو و ناکەسێك (کەلێرەدا مەبەستی واعیزی بەیتەکانی پێشووە) بە خۆگۆڕین و فڕوفێڵ ناتوانێ ببێتە موسڵمان/ سولەیمان.

واتە: ئەی دڵ کاتێ واعیز خەڵکی خۆی بە موسڵمان و پیاو چاك دەخاتەڕوو نارەحەت و دڵگران مەبە، چونکە ئەوە ئەسڵی مەسەلە کە (پیرۆزترین ناوی خوا و هیدایەتی ئەوە)ی لا نییە و ئەمرۆ و بەیانی ریسوا دەبێت چونکە بەبێ ئەو ناوە دیۆ نابێتە موسڵمان/ سولەیمان.

<u>ئێستا لە بەڵگەی هەردوو دەستەکە دەدوێین:</u>

**دەستەی یەکەم** (سلیمان نشود) بەڕاست دەزانن بەڵگەیان چیرۆکی حەزرەتی سولەیمان و دزینی ئەنگوستیلەکەیەتی لەلایەن دیۆەوە بۆ ئەوەی خۆی سولەیمان پیشان بدا و دەسەڵات بگرێتە دەست بەڵام چونکە (اسم اعظم)ی نەزانی (کەنهێنی پێغەمبەرایەتی و هێز و دەسەڵاتی حەزرەتی سولەیمان بوو) فڕوفێڵەکەی سەری نەگرت و نەبوو. واتە: ئەی دڵ دڵخۆش و دڵنیابە چونکە گەورەترین ناوی خودا کاری خۆی دەکات و دیۆ (بابەرگی سولەیمان و ئەنگوستیلەی پێ بێت) بەفڕوفێڵ و خۆگۆڕین نابێتە سولەیمان ئەم دەستەیە لەگەڵ ئەوەی کە پێیان وایە (مسڵمان نشود) لەڕووی واتاوە لەنگە، لەڕووی قافیەشەوە بەلەنگی دەزانن چونکە قافیەکەی دووبارەبوونەوەی قافیەی بەیتی یەکەمە.

بەڵام **دەستەی دووەم** ـ بەتایبەتی د.خرمشاهی ـ ئەم دووبارەبوونەوەیە بەئاسایی دەزانێت و پێی وایە کە حافظ زۆر خۆی لەم دووبارە بوونەوەیە نەپاراستووە و هەندی جاریش نەوەك هەر نەنگ و ناشیرین نییە بەڵکو بووەتە مایەی جوانی بەیتەکە و واتاکە، د.خوڕەمشاهی لە حافظنامەدا نووسیویەتی لەغەزەلیاتی حافظدا زیاتر لە حەفتاجار قافیە دووبارە بووەتەوە. {حافظ نامە، ج ٢، ل٧٨٥}.

لەلایەنی واتاشەوە ئەم دەستەیە لەو بڕوایـەدان کـە ئـەم بەیتـە ئاماژەیـە بـە فـەرموودەی موسوڵمان بوونی جنۆکە و شەیتانی مرۆڤ، چونکە هەر کەسێك دیـۆ /شـەیتانی خـۆی هەیـە و پێغەمبەر ﷺدەفەرمووێ: ((مامنکم من احد الاّ وله شیطان، قالوا وانت یارسول الله ؟ قال: الاّ ان الله اعافنی فاسلم فلا یأمر الا بالخیر)) یاخود: ((إنّی اَسْلَمْتُ شیطانَ نَفْسی بِیَدی)).

واتە: هەریەکێ لـە ئێـوە شـەیتانێکی هەیـە، گوتیـان تـۆش ئـەی پێغەمبـەری خـواﷺ؟ دەفەرمووێ: بەڵێ، بەڵام خوا یارمەتی داوم موسوڵمان بوو، جگە لەخێر فـەرمان بەهیـچی تـر ناکات)) یاخود ((من خۆم شەیتانی نەفسی خۆمم موسوڵمان کردووە)).

بەم پێیەش واتای بەیتەکە دەبێتە: ئەی دلێ خۆشحاڵ بەو خەفەت مـەخۆ لـەوەی کـەواعیز واخۆی بە چاك دەردەخات چونکە شەیتان /دیۆ بـەفریوکاری موسـوڵمان نابێـت و ئـەوە (اسم اعظم)ە کەکاریگەری خۆی دەبێت.

جگە لەم فەرموودەیە دەستەی دووەم بەڵگەی شیعری فارسی پـێش سـەردەمی حـافظ یـان هێناوەتەوە کە باس لەموسوڵمان بوونی دیۆ /شەیتان دەکات بۆ نموونە:

(ناصر خسرو)

**آن دیو را کـه در تن و جـان من است**

**بـاری بـه تیغ عقـل مسلمان کنم**

شێخ احمد رومی(معاصر مولوی)

**محـــمد گفت دیـــوانـه رکف من**

**مسلمـــان شـد اگـــر فرنبـــاک**

{رحیم ذالنون، ص١٨١، گزیدەی غزلهای حافظ، نشر قطره، چاپ اوّل سال ١٣٨٠، تهران}

**از اسلم شیطانی شد نفس تو ربانی**

**ابلیس مسلمان شد، تا بادا چنین بادا**

مولوی

حافظ نامه، ج ٢، ص٧٨٣}

بەندە پێموایە بەڵگەیەکی دیکەی چەسپاندنی (مسلمان نشود) لایەنی ڕەوانبێژییە، چـونکە خواجە هەمیشە هەوڵی دوورخستنەوەی مانا نزیکەکان و چەند ڕەهەندکردنیان دەدات.

لێرەدا ڕاستە لەڕووی نەسەقی گشتی بەیتەکەوە گەر (سلیمان) بێت ڕێکترە بـەڵام ئەمـە ئەو نەسەقەیە کە ئێمـە جـوانیی تێـدا دەبیـنین و خواجـە هەمیـشە لەوهەوڵـەدا بـووە کـە جوانییەکانی ئەودیو ئەم نەسەقە دەربهێنێ هەر بۆیە بۆ دوورخستنەوەی بـیری ئێمـەش بـێ



لەو نەسەقە باوە و بۆ تێکەڵاوکردنی هـەردوو مەسـەلەکەش ئـەم کـارە کـراوە، واتـە ئێمـە لەخوێندنەوەی میسراعی یەکەمدا چاوەڕوانی (سولەیمان) دەکـەین لەبـەیتی دووەمـدا بـەڵام خواجە بە ئاقارێکی دیکەماندا دەبات، هەر ئەم خاڵە یەکێکە لەو هۆکارانـەی کـە غـەزەلی ئەو گەورەیە لەهەمووان جودا دەکاتەوە.

**٥- عشق می ورزم و امّید که این فنِّ شریف**

**چون هنرهای دگر موجبِ حرمان نشود**

عاشقم و ئومێدەوارم ئەم هونەرە بەرزەی عاشقی وەك هونەرەکانی دیکـە نەبێتـە مایـەی مەحروم بوون و ڕەنج بە خەساری.

شریف: بەڕێز و بەرز.

فن شریف: هونەری بەرز و بەڕێز کە مەبەستی لە هونەری عاشقییە.

موجب نشود: نەبێتە مایەی.

حرمان: مەحروم بوون و ڕەنج بەخەساری، خەسارەت مەندی، دۆڕاوی.

خواجە لەم بەیتەدا هەر لەنەسەقی گشتی غەزەلەکە دەرنەچووە و هونەری خـۆی لەهونـەری ئەوانی دیکە بۆنموونە (واعیز) جودا دەکاتەوە و بەعاشقی و ڕەندی دەداتە قەڵـەم و دەڵـێ مـن عاشقم و هیوادارم کە ئەم هونەرە بەرزەی عاشقی وەك هونەرەکانی دیکەی چاپلوسی و فریودان نەبێتە مایەی ریسوایی و خەسارەتمەندی (واتە ئـەو هونەرانـە دەبنـە مایـەی خەسـارەتمەندی) لێرەدا شاعیر تەنها عەشق بەمایەی سەرفرازی دەزانێ ((عشقت رسد بەندە و.......))

ئەم واتایەی سەرەوە ئەو کاتە ڕاستە کە (حرمـان) بـەواتای ڕەنـج بەخەسـاری یـا بێبـەش لەبەرچاو بگیرێت، بەیتەکە لێکدانەوەیەکی دیکە هەڵدەگرێت بەم شێوەیە:

هونـەر و فەزیلەتـەکان دەبنـە مایـەی مەحرومیـەت و دەسـت بـەتاڵی لـەنێو کۆمەڵگـە (نەزانەکاندا) و بێ هونەری و سووکی دەبنە هونەر، بۆیە خواجە دەڵێ، منیش هونەر و فەزیلـەتی بەرزی عاشقم هەڵبژاردووە و ئومێدەوارم وەك هونەرەکانی دیکە نەبێتە مایەی مەحرومیەتم.

**٦- دوش میگفت که فردا بدهم کام دلت**

**سببی ساز خدایا که پشیمان نشود**

شەوی ڕابردوو دەیگوت بەیانی بەئاواتی خۆتت دەگەیـەنم خوایـە هۆکارێـك بـسازێنە کـە پەشیمان نەبێتەوە.

فردا: بەیانی.        بدهم کام دلت: بەئاواتی دڵی خۆتت دەگەیەنم.

سببی ساز: سەبەبێ دروست کە.

لەبێ وەعد و پەیمانی یار ئەدوێ، دوێنێ شەو کە گوتوویەتی بەیانی بەئاواتی خۆتت دەگەیەنم، باوەڕ ناکات و ئەزانێ پەشیمان دەبێتەوە، بۆیە دوعا و نزا دەکات کەپەشیمان نەبێتەوە و بەئاواتی خۆیی بگەیەنێت.

**۷- حسن خلقی ز خدا می طلبم حسن ترا**

**تا دگر خاطرِ ما از تو پریشان نشود**

ڕەوشت جوانی بۆ جوانی تۆ لەخوا داوا دەکەم، تائیدی فکری ئێمە بە هۆی تۆوە پەرێشان نەبێت.

حسن خلقی: ڕەوشت جوانی.

خواجە بەیار دەڵێت تۆ کە جوانیت بێ سنوورە بەڵام ڕەوشت جوانیت کەمە و بەجوانیت ئێمە ئازار دەدەیت و فکرمان دەشێوێنی و پەرێشان خاترمان ئەکەیت، بۆیە لەخوا داوائەکەم کە ڕەوشت جوانی بەجوانی تۆ ببەخشێت تا ئیدی کەمێ بیرمان ئارام بگرێت و بەعیتاب و رووترشی و خراپەکاری لەگەڵماندا پەرێشانمان نەکەیت.

لەهەندێ نوسخەدا (خوی) ـ قزوینی- و لەهەندێ نوسخەدا (روی) ـ قدسی /هروی لەبەری (حسن) هاتوون، واتای (خوی) ـــ خو و ئەخلاق- زیاتر واتای بەیتەکە بەرەو ئاماژەدان بە(واعیز) دەبات.

**۸- ذرّه را تا نبود همّت عالی حافظ**

**طالبِ چشمەی خورشیدِ درخشان نشود**

حافظ زەڕە تاهیمەتی بەرزی نەبێت بەهیوای گەیشتن بە سەرچاوەی هەتاوی درەوشاوە نابێت.

ذرّة: گەردیلە.    طالب: تالب، داواکەر.    درخشان: درەوشاوە.

زەڕە هەمان گەردیلە تۆزە وردانەن کە لەتیشکی هەتاودا دەردەکەون و ئەکرێ مەبەست لەمرۆڤ بێت، سەرچاوەی درەخشانی هەتاویش، سەرچاوەی بەرزی مەعریفەت و عەشقی حەقە کە خودی مەعشوقە واتە تالەناخی زەڕە و گەردیلەدا هیمەت بەرزی وگەوهەری پاك نەبێت، خوازیاری ئەوە نابێت کە بەمانای بەرزی مەعریفەت و رووی درەخشانی مەعشوق بگات، کەگەیشتن بەم مەعشوقەش توانەوە و فەنابوونە.



## غەزەلی دوو سەد و بیست و پێنجەم:

**بەحری ڕەمەلی هەشتی مەخبونی محزوف**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)**

**۱- گرمن از باغِ تو یك میوه بچینم چه شود**

**پیشِ پایی به چراغ تو ببینم چه شود**

ئەگەر من لەباغی تۆ میوەیەك بچنم دەبێ، بەردەم پێیەك بەچرای تۆ ببینم چ دەبێ.

بچینم: بچنم، لێکەمەوە.    چەشود: چ دەبێ، چی دەبێ.

پیش پایی: بەردەم پێیەك.

خواجە بەیار و دولبەری جوانی خۆی کە بە باغێکی پڕ بەرهەمی دەزانێ دەڵێ: گەر من لەباغی جوانی تۆ میوەی ژوان و وەسڵێ لێکەمەوە چ دەبێت و گەر سوود لەچرای تۆ (جوانی رووی کە وەك چرایە) وەرگرم و بەردەم پێیەکەی پێ ببینم چ دەبێ.

**۲- یارب اندر کنفِ سایەی آن سرو بلند**

**گر من سوخته یك دم بچینم چه شود**

پەروەردگار گەر منی سووتاو هەناسەیەك لەپەنای سێبەری ئەو سەروە بەرزەدا دانیشم چ دەبێ.

کنف: پەنا، سایە و سێبەر.    یك دم: هەناسەیەك، دەمێك، تۆزیك.

خوایە گەرمنی دڵسووتاوی ڕەنج کێشاو بۆ تەنیا ساتێ لەپەنای سێبەری ئەو یارە بەژن بەرز و ڕێکە وەك سەرووەدا دانیشم و بحەسێمەوە چ دەبی.

**۳- آخر ای خاتم جمشیدِ همایون آثار**

**گر فتد عکسِ تو بر لعل نگینم چه شود**

ئاخۆ ئەی ئەنگوستیلەی سولەیمانی جێی پەنجەی موبارەك، گەر وێنەیەکەی تۆ بکەوێتە سەر لەعلی نگینم چ دەبێ

خاتم جمشید: ئەنگوستیلەی سولەیمان (د.خ).    همایون: موبارەك، پیرۆز.

آثار: کاریگەری.

ئەنگوستیلەی حەزرەتی سولەیمان (د.خ) کە پیرۆزترین ناوی پێوە بوو مایەی دەسەڵاتی ئەوبوو و هەمیشە کاریگەری چاك و موبارەکی هەبووە خواجە دەڵێ ئاخر ئەی ئەنگوستیلەی

جێ پەنجە موبارەکی گەر جەمشید گەر سێبەرێکت بکەوێتە سەر لەعلی نگین و ئەنگوستیلەی من و(منیش لەپیرۆزی تۆوە کارم لەبەر بڕوات و دەسەڵاتی گەیشتنم بەئاواتم هەبێت) چ دەبێت.

**٤- واعظ شهر چو مِهْر مَلِک و شحنه گزید**

**من اگر مهرنگاری بگزینم چه شود**

کاتێ واعیزی شار خۆشەویستی پاشا و دارۆغەی هەڵبژاردووە، ئەگەرمن خۆشەویستی نیگار و یارێ هەڵبژێرم چ دەبێ.

ملك: پاشا. شحنه: دارۆغه، دەسەڵاتدار گزیدن: هەڵبژاردن

نگاری: یارێك

واته کاتێ کە واعیز بەهۆی خۆپەرستی و نەزانیییەوە دەستی داوەتە چڵکاوخۆری و لەگەڵ پاشا و کاربەدەستانی شارو وڵاتدا رێککەوتووە و ئەوانی خۆش دەوێ، من خەریکی عەشق بم و یارێ هەڵبژێرم چ دەبێ.

**٥- عقلم از خانه بدر رفت و اگر می این است**

**دیدم از پیش که در خانه‌ی دینم چه شود**

عەقڵم لەسەر دەرچوو، ئەگەر مەی ئەمەبێ (وابکات) پێشبینی دەکەم کە لەماڵی دینمدا چ دەبێت.

از خانه بدرفت: لەماڵ دەرچوو، واتە: عەقڵم لەسەرمدا نەما و لەدەستمدا.

دیدم از پیش: لەپێشدا دەزانم، پێشبینی دەکەم.

واته من کەشەرابم خواردەوە عەقڵم لەدەستدا، ئەگەر شەراب ئاوا بێت کە عەقڵ لەدەست بدەیت، ئەوا هەرپێشدا دەزانم لەماڵی دینمدا چی روودەدات و ئەویش لەدەستدەدەم.

**٦- صرف شد عمرِ گرانمایه به معشوقه و می**

**تا ازآنم چه به پیش آید، از اینم چه شود**

تەمەنی ئەزیزم لەرێی مەعشوق و مەیدا سەرف کرد، تابزانم لەو (مەعشوق) چیم بەسەردێت لەم (مەی) چیم لێ دێ.

صرف شد: سەرف بوو. گرانمایه: ئەزیز، بەهادار.

بەپیش آید: بەسەربێت، بێتە پێشەوە.

ازان (از آن): لەوەوە. ازین (از این): لەمەوە.

واته: من تەمەنم لەرێی مەعشوق و مەیدا سەرفکرد، بزانم لە مەی و مەعشوق چیم بەسەردێ و چیم لێ دەکەن.



**٧- خواجه دانست که من عاشقم و هیچ نشد**

**حافظ ار نیز بداند که چنینم چه شود**

سەروەر و خواجە زانی کەمن عاشقم و هیچ نەبوو،گەر حافظیش بزانێت ئاوام چ دەبێ.

خواجە: بەڕێز، سەروەر، بەڕای (خوالیخۆشبوو ختمی لاهوری، د. مهدی معینیان) مەبەست لەخواجە (خواجه قوام الدین حسن صاحب عیار)ە.

هیچ نشد: هیچ نەبوو. چنینم: ئاوام.

واتە: خواجە قوام الدین حسن صاحب عیاری وەزیر زانی من عاشقم و هیچ نەبوو — یاخود بەپێی هەندێ نوسخە هیچی نەگوت — ئێستا گەر حافظ (واعیز)یش بزانێت کەعاشقم هەر هیچ نابێت چونکە ئەو لەواعیزی شار گەورەترە.

## غەزەلی دووسەد و بیست و شەش:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەحزوف**
**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن)**

**١- بخت از دهانِ دوست نشانم نمی دهد**
**دولت خبر ز رازِ نهانم نمی دهد**

بەخت نشانەیەکی دەمی دۆستم پێ پیشاننادات، بەخت هەواڵێکم سەبارەت بەڕازی پەنهان پێ نادات.

نشانم نمی دهد: نیشانەیەکم پێ نادات.

لەڕاستیدا میسراعی سەدر و عەجزی بەیتەکە یەك واتایان هەیە و میسراعی دووەم دووبارەکردنەوەی میسراعی یەکەمە بەڵام لەبری (دهان) (راز نهان)ی هێناوە، واتە دەمی یار هێندە بچووکە کەوەك رازی پەنهانە و نایدۆزمەوە بەختی خەواڵوشم هەواڵ و نیشانەیەکی ئەوم پێ نادات.

لە زاراوەی عیرفاندا هەمان رازی پەنهانی بوونە کە عارفەکان وێڵی دوای کەشفکردنی ئەو سرە ئیلاهییانەن کەچی لێرەدا خواجە لە بێ بەختی و خەواڵوییی بەخت و دەوڵەتی (کەبەواتای بەخت دێت) خۆی دەدوێ و دەڵێ بەخت ڕێنمایم ناکات ئەو رازانە کەشفبکەم.

**٢- از بهرِ بوسەای ز لبش جان همی دهم**
**اینم نمی ستاند و آنم نمی دهد**

بۆ ماچێك لەلێوی گیان دەبەخشم، ئەمم لێ ناسەنێت و ئەوم ناداتێ.

از بهر: بۆ. بوسە: ماچ. همی دهم: دەدەنم. نمی ستاند: ناستێنی، وەرناگرێ.

لەف و نەشری نامورەتەب لە بەیتەکەدا هەیە و (این) بۆ (جان) و (آن) بۆ (بوسە) ئەگەڕێنەوە. واتە: من بۆ ماچێکی لێوی ئامادەی بەخشینی گیانم، کەچی گیانم لێ ناسەنێ و ماچێکم ناداتێ.

(ماچ) لە فەرهەنگی عیرفانیدا لە فەیزی ڕەحمی لێکدراوەتەوە و گیان بەخشینیش فەنا و لەخۆبوونەوەیە و (لب)یش هەمان سر و نهێنی ئیلاهییە.

واتە: من لەپێناو فەیزێکی نهێنی حەقدا ئامادەم فانی بم بەڵام ئەو فەیزەم ناداتێ و فانیم ناکات.



**٣- مُردم ز اشتیاق و درین پردە راه نیست**
**یا هست و پردەدار نشانم نمی دهد**

لە شەوق و تاسەدا مردم و ئەم پەردەیە رێگەی تێدا نییە، یا هەیە و پەردەدار (دەرگەوان) پیشانم نادات.

پردەدار: دەرگاوانی سەراپەردەی یار.

خواجە لەم بەیتەدا دوو مەسەلە دەخاتەروو کە **یەکەم** سووتان و مردنی خۆیەتی لە تاسە و ئارەزووی گەیشتن بە سەراپەردەی یارە، **دووەم** بوونی حیجاب لەڕێگەی ئەو تاسە وئارەزووەدا و نەگەیشتن بەمەقسەد.

ئەوە دەڵێ: مردم لەتاسە و ئارەزووی گەیشتن بەیاردا، بەڵام سەراپەردەی یار رێگەی نییە و ناتوانم پێی بگەم، یاخود رێگەیەکی هەیە و مـن نـایزانم و دەرگـاوان و پەردەوانـەی حـەرەمی یاریش پێم پیشان نادات. سەرا پەردەی یار هەمان حەرەمی مەلەکوتی مەعشوقی حەقە.

لەڕاستیدا (پردە) و (راە) و (پردەدار) زاراوەی مۆسیقین و بەلێکدانـەوی ئـەو زاراوانـەش واتایەکی دیکەی سەرزاری بۆ دروستدەبێت بەڵام لەبنچینەدا هەمان واتای سەرەوەیە.

لەبری (ز اشتیاق) لەهەندێ نوسخەدا (درین فراق و دران) و (در انتظار) هاتووە.

**٤- زلفش کشید بادِ صبا چرخِ سفله بین**
**کآنجا مجال بادِ وزانم نمی دهد**

بای سەبا پرچی کردەوە، بڕوانە چەرخی دوون کەلەوێدا هێندەی بای هەڵکردووە بوارم نادات.

زلفش کشید: پرچی نەوازش کرد، کردیەوە، خاوی کردەوە. باد وزان: بای هەڵکرد.

واتە بای سەبا کە نەفەسی ڕەحمانی حەقە خەبەری تەجەلی صفاتی حەقی دا، کەچی سەیری گەردوون و چەرخی دوون بکە هێندەی بای هەڵکرد و بوارم نادات کەلەو پرچەکراوەی یار بەهرەدارم.

**٥- چندانکە برکنار چو پرگار می روم**
**دوران چو نقطە رە بە میانم نمی دهد**

هەرچەندە وەك پرگاڵ بەکەناردا دەڕۆم، ڕۆژگار ڕێم نادات وەك خاڵ بێمە ناوەوە.

چندانکە: هەرچەندە. برکنار: بەکەناردا.

پرگاڵ لەم بەیتەدا تەنیا ئەو بەشەی پرگاڵە کەقەڵەمەکەی پێوەیەوە بازنە دروستدەکات و نوقتەش خاڵی نێوەندی بازنەیە، لێرەدا خاڵ کەوتنە ناوەوەی پرگاڵی دەوروبەریش و اهمالکردن

و رێگەنەدانە، ئەو دەڵێ: هەرچەندە وەك پڕگاڵ بەدەوروبەردا دەڕۆم لەهەڵێك دەگەڕێم بکەومە نێو جیهانی مەعشوقەوە کەچی دەوران رێم نادات وەك خاڵ بچمە ناوەوە.

**٦-   شکّر به صبر دست دهد عاقبت ولی**

**بد عهدی زمانه زمانم نمی دهد**

عاقیبەت سوپاسگوزاری بە ئارامگری دەستدەکەوێ، بەڵام بەد عەهدی زەمانە وچانم نادات.

دست دهد: بەدەست دەکەوێت.      بدعهدی: بێ عەهدی، بێ پەیمانی، پەیمان شکێنی

زمانم نمی دهد: وچانم نادات، فرسەتم نادات.

خواجە دەڵێ: دەزانم سەبر کلیلی شوکری عاقیبەتە، واتە دواجار شوکر و سوپاسگوزاری بەسەبر و ئارامگری دەستدەکەوێت، بەڵام چی بکەم زەمانەی بێ وەفا و بێ پەیمان وچانم نادات کە سەبر بگرم تابەئاوات بگەم.

**٧-   گفتم روم بەخواب و ببینم خیالِ دوست**

**حافظ زِ آه و ناله امانم نمی دهد**

گوتم: بخەوم و لەخەودا خەیاڵی دۆست ببینم بەڵام حافظ لەتاو ئاه و ناڵە ئامانم نادات (بوارم نادات).

روم بەخواب: بخەوم، چاوم بچێتەخەو.

امانم نمی دهد: ئەمانم نادات، بوارم نادات، نایەڵێ.

لێرەدا خواجە (خۆیی / شاعیر) و (حافظ) لەیەکتر جودا دەکاتەوە و باس لە زۆربەی ئاه و ناڵەی حافظ دەکات لە شەوقی یار، دەڵێ: بڕیارمدا یا گوتم بخەوم و لەخەودا جوانی یار و خەیاڵی رووی ئەو ببینم بەڵام ئاه و ناڵەی زۆری حافظ لە شەوقی مەعشوق بوار و ئەمانم نادات بخەوم.



## غەزەلی دوو سەد و بیست و حەوتەم :

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەب**

**(مفعول فاعلاتن مفعول فاعلاتن)**

**١-   گفتم غم تو دارم گفتا غمت سرآید**

**گفتم که ماه من شو گفتا اگر برآید**

گوتم غەمی تۆم هەیە، گوتی غەمت دوایی بێت، گوتم ببە بەمانگی من، گوتی ئەگەر دەست بدات (لەدەستم بێت).

سرآید: کۆتای دێت / بێت، بەکۆتادێت.      گفتا: گوتی.

سرآید: دەست بدات، دەربێت.

گوتم بەیاری نازەنین ئەی یار گرفتاری غەمی دووری تۆم ئەویش گوتی غەمت کۆتایی دێت و هەمیشەیی نییە، دیسانەوە گوتم ببە مەعشوقی تایبەتی خۆم (ببە بەمانگی خۆم) گوتی گەر دەست بدات، دەربێت وادەکەم.

**٢-   گفتم ز مهرورزان رسم وفا بیاموز**

**گفتا ز ماه رویان این کار کمتر آید**

گوتم لە عاشقان فێری نەریتی وەفا (وەفاداری) ببە، گوتی ئەم کارە کەمتر لە روومانگمان دێت.

مهرورزان: عاشقان.      بیاموز: فێربە.      آید: دێت.

بێگومان کەئەو غەزەلە گفتوگۆیەکی نێوان شاعیر و شاجوانی خەیاڵی و ئەدەبی ئەوە، لەدرێژەی گفتوگۆکەیدا لەگەڵ شاجوانی خەیاڵیدا دەڵێ: گوتم تۆ کەجوانی بێ وەفای لەعاشقان فێری وەفاداری و رێورەسمی وەفا ببە بەڵام ئەو وتی: جوانان (ئەوانەی روویان وەك مانگ جوانە) ئەم کاری وەفادارییەیان لەدەست نایەت و جوانی و بێوەفایی پێکەوەن و جوانانان بێ وەفان.

**٣-   گفتم که بر خیالت راهِ نظر ببندم**

**گفتا شبرو است او از راهِ دیگر آید**

گوتم: رێگەی بینین لە خەیاڵی تۆ دەگرم، گوتی: ئەو شەوکوتە و لە رێگەیەکی دیکەوە دێتە نێوخەیاڵت.

ببندم: ئەگرم، دەبەستم، دائەخەم.      شبرو: شەوکوت، دز.

شاعیریش بەجوان دەڵێ: ئیدی ڕێگەی بینین لەخەیاڵی خۆم (وێنەی جوانی تۆ لەخەیاڵی خۆمدا) دائەخەم و بیر لە جوانی تۆ ناکەمەوە و نایەڵم وێنەی جوانیت بێتە بەردیدەی خەیاڵم، گوتی وێنەی جوانی رووی من وەك شەوکوت و دز وایە و ئەگەر ڕێگەشی لێ بگری لە ڕێگەیەکی دیکەوە دێتە نێو خەیاڵت.

واتە: ئەو ئێمە نین کە وێنەی جوانی جوانان دەخەینە خەیاڵمانەوە بیر لەجوانییان دەکەینەوە، بەڵکو جوانی و کاریگەری جوانی ئەوان خۆیانن کە دێنە نێو خەیاڵمانەوە و بەم پێیەش ڕێگەی هەڵاتن لە بیرکردنەوە لە جوانان نییە.

**٤- گفتم که بویِ زلفت گمراهِ عالمم کرد**

**گفتا اگر بدانی هم اوت رهبر آید**

گوتم بۆنی پرچت گومڕای عالەمی کردم  گوتی ئەگەر بزانی هەر ئەو ئەبێتە رابەر و ڕێ پیشاندەرت.

گمراه عالم کرد: منی لەجیهاندا گومڕاکرد، گومڕای جیهان و عالەمی کردم.

بدانی: بزانی.    اوت رهبرآید: ئەوئەبێتە ڕێبەر و رابەرت.

زولف و بۆنی زوڵف ـ کثرت حجاب- و ئەسراری ئیلاهی و گەردوونن، لێرە بەدواوە چەمکەکانی غەزەلەکە دەبنەوە بە زاراوە دووبارە بووەکانی عیرفان، گوتم بۆنی پرچی تۆ(بۆنی حیجاب و گەڕان بەدوای ئەم نهێنییانەی  پشت پەردە) منی گومڕای عالەم و لەجیهاندا سەری لێ شێواندم، گوتی ئاگاداربیت و بزانیت هەر ئەو بۆنی پرچ و نهێنی و پەردانە ئەبێتە رابەرت بەرەولای من.

**٥- گفتم خوشا هوایی کز باغِ حسن خیزد**

**گفتا خنك نسیمی کز کویِ دلبر آید**

گوتم چەندە خۆشە هەوایەك کە لە باخی جوانییەوە هەڵدەکا، گوتی چەندە خۆشە ئەو شەماڵەی کە لە کوچەی دولبەرەوە دێت.

خیزد: هەڵدەکات.    خنك: چەندە خۆشە، چەند چاکە.

لەنوسخە دێرینەکاندا جیاوازی لەنێوان ساغکردنەوەی میسراعی یەکەمدا هەیە، کەئەم وێنە و شێوانەی هەیە:

...کز باد صبح خیزد   - خ- نوسخەی ساڵی ٨٢٧ هـ ق)ی  مرحوم عبدالرحیم خلخالی.

...کز باد حسن خیزد ـ هـ ـ نوسخەی ساڵی (٨١٨ هـ ق) ی کتێبخانەی ئاصفیە حیدر ئاباد هندستان پارێزاوە.



...کز باغ عشق خیزد ـ ق ـ نوسخەی ساڵی (٨١٩ هـ ق) ی کتێبخانەی ناوەندی زانکۆی تاران پارێزاوە.

...کز باغ عشق خیزد ـ م ـ نوسخەی ساڵی (٨٢١) هـ ی د.اصغر مهدوی.

...کز باغ عشق خیزد- ر- نوسخەی ساڵی (٨٢٢ هـ ق) ی کتێبخانەی (روان) لە سلیمانیەی ئەستەنبول پارێزاوە.

...کز باغ عشق خیزد ـ ن ـ نوسخەی ساڵی (٨٢٥) لە کتێبخانەی (نورعثمانیە)ی ئەستەنبولدا پارێزاوە.

واتە: ئەم شێوەی ئێستا لەدێرین ترین نوسخەدا هاتووە کە نوسخەی ساڵی (٨١٣ هـ ق)یە و لەکتێبخانەی (ایا صوفیا) لەکۆمەڵێکدا بەناوی (کۆمەڵی دیوان) لەکتێبخانەی سلیمانییەی ئەستەنبوڵ پارێزراوە هەروەها لە نوسخەی ساڵی (٨٢٤ هـ ق) یشدا هاتووە کە نوسخەی (سید هاشم علی سبزپوش)ە کە لە زانایانی هیندستانە و نووسەری ئەم نوسخەیە (محمد بن سعید ی بن عبدالرحمن القاری)یە و لە ذی الحجە (٨٢٤)دا نووسراوەتەوە {مقدمە د. عیوضی، دیوان حافظ، امیر کبیر، تهران ١٣٧٩ چاپ اول } بەهەرحاڵ هەریەکە لەم شێوانە راستن و هەڵبژاردنی هەریەکێکیان پەیوەستە بە سەلیقەی شیعری ساغکەرەوە یا راڤەکەرەوە.

خواجە دەڵێ گوتم بە جوانان خۆشە هەوایەك لەباغی جوانییەوە هەڵکات، ئەم میسراعەی خواجە جۆرێك لە خۆگێلکردنی شاعیری تێدایە بۆ زانینی رای بەرامبەر یاخود لەڕاستیدا بۆ جەختکردنەوە لەسەر مەسەلەیەکی گرنگی عیرفانی/ حافظی کەهەمیشە دووبارە جەختی لەسەر دەکاتەوە، لەڕاستیدا ئەبوایە ئەم میسراعە بە پێچەوانەوە بوایە، چونکە ئەوە خودی خواجەیە کە جەخت لەچاکی و جوانی هەوای کوچەی دۆست دەکات نەوەك شاجوانی خەیاڵ، بەڵام هونەری خۆگێلکردن بەکاردەهێنێ بۆ جەختکردنەوە: گوتم بەجوانان چەندە خۆشە ئەو هەوایەی کە لەباغی جوانییەوە هەڵدەکات، گوتی نا هەوایەك چاکە کە لەکوی مەعشوقەوە هەڵکات، واتە هەوایەك خۆشە لە عەشقەوە هەڵکات نەلە جوانییەوە چونکە (**شاهد آن نیست که مویی و میانی دارد**) لێرەدا حافظ جوانی بە تەنیا بەچاك نازانێت بەڵکو جوانی و هەوایەك خۆشە /چاکە کە لای یاری حەقەوە بێت.

لەهەموو نوسخەکانی دیکەشدا هەموو بەچاکتر زانینی هەوای کوچەی یار و دولبەرە لە هەوای بەیانی و هەوای باغی عەشق و هەوای کوچەی عەشق و...هتد.

**۶- گفتم که نوش لعلت ما را به آرزو کشت**

**گفتا تو بندگی کن کو بنده‌پرور آید**

گوتم لێوی شیرینت ئێمەی لەئارەزووی گەیشتن بە خۆیدا کوشت، گوتی تۆ بەندایەتی بکە، لێوم پاداشتت ئەداتەوە.

نوش لعل: شیرین لێو، لێوی شیرین، لێوی شیرینی یاقوتین.

بەآرزو کوشت: لەئارەزوودا کوشت.      بندەپرور: بەندە پەروەر.

کوبندەپر و آید: ئەبێتە بەندەپەروەر و پاداشتی بەندەکانی دەداتەوە.

گوتم بەیار: ئەی یار لێوی شیرینی یاقوتینی تۆ ئێمەی لەئارەزووی خۆیدا کوشت و ماڵوێران کرد، یار وتی: حافظ تۆ خەریکی غولامی و بەندایەتی لێوی من بە ئەو خۆی دڵی نەرم دەبێت و ئەبێتە بەندەپەروەر و پاداشتت ئەداتەوە.

واتە ڕێگەی گەیشتن بە لێوی مەعشوق تەنیا بەندایەتی سەرکرکردن و پاڕانەوەیە لە بەردەمیدا و هەر لەم ڕێگەیەوە پێی دەگەین، لێویش لە فەرهەنگی عیرفانیدا فەیز و لوتفی حەقە.

واتە گوتم لوتف و فەیزی ڕەحمەتی تۆ منی لەئارەزووی خۆیدا کوشت وتی بەندایەتی بکە خۆی دەڕژێتەوە بەسەرتدا.

**۷- گفتم دلِ رحیمت کی عزم صلح دارد**

**گفتا مگوی باکس تا وقت آن درآید**

گوتم دڵی میهرەبانت کەی نیازی ئاشتیی هەیە، گوتی مەڵێ بەکەس تا کاتی ئەوە بێت.

رحیم: میهرەبان.      عزم دارد: نیازی هەیە.      صلح: ئاشتی، ئاشتبوونەوە.

مگوی: مەڵێ.      وقت آن درآید: کاتی ئەوە بێت.

خواجە بەیار دەڵێ: کەی دڵی میهرەبانت بڕیار ئەدات لەگەڵ ئێمەدا ئاشت بێتەوە یاریش پێی دەڵێ: ئەم قسەیە لای کەس مەکە و بێدەنگی و پاراستنی راز بکە بەپیشە تاکاتی ئەوەدێت، یاخود ئەکەرێ (تاکاتی بگات) واتە شەرتی ئاشتبونەوە پاراستنی نهێنییە بێدەنگی بکە بەپیشە و بەکەس مەڵێ باکاتی بێت و ئاشت ببمەوە.

**۸- گفتم زمانِ عشریت دیدی که چون سرآمد**

**گفتا خموش حافظ کاین غصّه هم سرآید**

گوتم بینیت کاتی پێکەوە بوون و شادی چۆن بەسەرچوو، گوتی بێدەنگ بە حافظ، چونکەئەم خەفەتەش تەواو دەبێ.



سرآمد: بەسەرچوو، دوای هات.      خموش: بێدەنگ بە.

وتم بەیار ئەی یار بینیت کات و سەردەمی هاودەمی و شادی (چێژی هاودەمی لەگەڵ حەقدا) چۆن تەواو بوو، خەفەت هات، وتی بەسە حافظ ـ گلەیی مەکە ـ ئەم سەردەمی خەم و خەفەتەش بەسەردەچێ.

ئەکرێ ئەم بەیتە ئاماژەبێت بە پێکەوەبوونی کورتی خودا و مرۆڤ لەسەرەتادا و خەم و خەفەتیش سەردەمی دونیا بێت: دەڵێ گوتم بەیار بینیت سەردەمی هاودەمی چۆن بەسەرچوو گوتی بەسە حافظ سەرجەمی دونیا و خەم و خەفەتیش تەواو دەبێت و بەحەق دەگەیتەوە.

## غەزەلی دوو سەد و بیست و هەشتەم :

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەب**

**(مفعول فاعلاتن مفعول فاعلاتن)**

**١- دست از طلب ندارم تا کام من برآید**

**یا تن رسد به جانان یا جان ز تن برآید**

دەست لە داواکردن هەڵناگرم تا بەئاواتی خۆم دەگەم، یاجەستەم دەگات بە مەعشوق یا گیان لەجەستەم دەردەچێت.

طلب: داواکردن لە فەرهەنگی عیرفانیدا (طلب) قۆناغەکانی سەرەتای عارفە بۆ چوونە نێو عیرفان.

طلب چوار شتە: ((لوقمەی بێ شوبهە + نانی حەڵاڵ، زیکر و یادی بێ غەفڵەت و بێ ئاگایی، کاتێ بێ فەترەت ـ بێ وەستان و سستی، خەڵوەتی بێ زەحمەت))

دست از طلب ندارم: دەست لە تەلەب هەڵناگرم.

کام من بر آید: بەئاواتم بگەم، موورادم حاصل بێت.

تن: جەستە. رسد: دەگات. برآید: دەردەچێت.

خواجە جۆرە پەیمانێك بەخۆی دەدات کەوازلە (طلب) ناهێنم تا بەئاواتی خۆم دەگەم، ئاواتەکەشی ئەوەیە کە یاجەستە دەگات بەیار/ مەعشوق یادەمرێت و گیان لەجەستەی دەردەچێت.

**٢- بگشای تربتم را بعد از وفات و بنگر**

**کز آتشِ درونم دود از کفن برآید**

لەپاش مەرگم گۆڕەکەم هەڵدەرەوە سەیرکە کە لە تاو ئاگری دەروونم دووکەڵ لە کفنەکەم هەڵدەستێ.

بگشای: بکەرەوە، (لێرەدا) هەڵدەرەوە. تربت: گۆڕ.

دود از کفن برآید: دووکەڵ لەکفنەکەم هەڵدەستێ.

لێرەدا خواجە لەکاریگەری و جاویدانی ئاگری عەشقی نێو دڵی ئەدوێ و دەڵێ تەنانەت پاش مەرگیش هەر دەمێنێت و گەر گۆڕەکەم هەڵدەیتەوە دەبینی لەتاو ئەو ئاگرە کفنەکەم گڕی گرتووە و دووکەڵی لێ بەرز دەبێتەوە. ئەم بەیتە ئاماژە بەو بڕوایەی کە هەندێ لەعارفەکان هەیانە و پێیان وایە عەشق کۆتای نایەت و تەنانەت پاش مەرگیش هەربەردەوامە.



**٣- بنمای رو که خلقی واله شوند و حیران**

**بگشای لب که فریاد از مرد و زن برآید**

رووت نیشاندە کە خەڵکی سەرگەردان و حەیران بن، لێو هەڵێنە کە هاوار لە پیا و ژن بەرزبێتەوە.

بنمای: نیشاندە، دەرخە. خلقی: خەڵکی، خەڵکێکی زۆر.

واله: سەرگەردان، شەیدا.

بگشای لب: لێو هەڵبێنە، زار هەڵبێنە، قسە بکە.

فریاد: هاوار هەستێ، هاوار بەرزبێتەوە.

خواجە بەیاری عیرفانی و مەعشوقی دەڵێت: رووی دەرخە تابەو روو نمایش کردنە تەواوی خەڵکی شەیدا و سەرلێشێواو و حەیران بن و قسەبکە و زار هەڵبێنە تا لەحەیرانی و سەرگەردانیدا پیاو و ژن هاواریان لێ هەستێ.

**٤- جان بر لب است و حسرت در دل که از لبانش**

**نگرفته هیچ کامی جان از بدن برآید**

گیان لەسەر لێوە و حەسرەت لە دڵدایە چونکە بەبێ ئەوەی ئارەزوویەکم لەلێوی بشکێ گیان لەجەستەم دەردەچێ.

جان برلب است: گیان لەسەر لێوە، دواداییم، لەکاتی مردندا.

نگرفته هیچ کامی: هیچ ئارەزوویەکم بەدەست نەهێنا، بەهیچ ئاواتێکی نەگەیشتم.

بدن: جەستە.

حاڵەتی بەیتەکە لەسەر مەرگی عاشقدا گوتراوە یا حیکایەتی سەرمەرگی عاشقە کە دەڵێ: وا گیانم دەردەچێ بەڵام حەسەرەتێك لەدڵمدایە، حەسرەتەکەش ئەوەیە کە بەبێ ئەوەی بەهیچ ئاواتێکم لەلێوی مەعشوق بگەم و گوێم لەدەنگی بێت دەمرم و گیان لەجەستەم دەردەچێ.

**٥- از حسرتِ دهانش آمد به تنگ جانم**

**خود کام تنگدستان کی زان دهن برآید**

لەتاو حەسرەتی گیانم گەیشتە سەر لێوم / لەڕاستیدا کەی دەستکورت و مەحرومان لەو دەمە بەئاوات دەگەن.

تنگدست: دەست کورت، هەژار.

کام برآمدن: بەئاوات گەیشتن.

خود: (لێرە) بەڕاستی، لەڕاستیدا.

لەحەسرەتی دووری و نەگەیشتن بە دەمی یار دنیام لیّ تەنگ بۆوە و گیان گەیشتە کونە لووتم /سەر لێوم، ئەریّ بەڕاست کەی دەستکورت و هەژاران بەئاواتی ئەوەگەیشتوون کە بگەن بە دەمی ئەو.

گەر تەنگدست بە دەستکورت و هەژار لێکدەنەوە خواجە شەرحی حالّی خۆیان دەکات، بەلاّم لەفەرهەنگی عیرفانیدا ئەکریّ تنگدست بە ناموستەحەق لێکدرێتەوە واتە: من گەرچی لەتاو حەسرەتی قسەی مەعشوقی حەق گیان گەیشتە سەر لێوم، بەلاّم لەڕاستیدا کەی ناموستەحەقان بەو ئاواتە دەگەن ـ ئێمە موستەحەقی ئەونین کەبەو ئاواتە بگەین ـ.

**٦- بربوی آنکه در باغ یا بد جلا ز رویت**

**آید نسیم و هردم گرد چمن برآید**

بەئومێدی ئەوەی کە لەباغدا و لەبەرەکەتی رووتەوە سەفای دەستکەویّ، نەسیم بەردەوام دێت و بەدەوری گولّزاردا هەلّدەکات.

بربوی: بەئومێدی. یابد: دەستی کەویّ، پەیدای کا. جلا: رووناکی، سەفا.

گەرد چمن: بەدەوری چیمەن و گولّزاردا.

واتە: سەبا ـ نەسیم ـ یاشەمالّ بە ئومێددی ئەوەی کە لەبەرەکی رووتەوە سەفا و رووناکی دەستکەویّ بەردەوام دێتە باخ و بەدەوری گولّزاردا دەسوڕێتەوە، بەم پێیە تۆ گولّزاری باخ و سەفا بەخشی شەمالّی.

**٧- گویند ذکرِ خیرش در خیلِ عشقبازان**

**هرجا کە نام حافظ در انجمن برآید**

لەهەر شوێنیّ کە ناوی حافظ لەکۆڕ و مەجلیسێکدا ببردرێت، گرووپ و کۆمەلّی عاشقان بەچاکی باسی دەکەن.

ذکر خیر: بەچاکی باسکردن. خیل: گرووپ، کۆمەلّ. انجمن: کۆڕ، مەجلیس.

دەستەی عاشقان لەهەر کۆڕ و کۆبوونەویەکدا کەناوی حافظ بهێنرێت باسی چاکەی دەکەن.



## غەزەلی دوو سەد و بیست و نۆهەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسلّەمی موسبەغ**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلاتن)**

**١- چو آفتاب می از شرقِ پیالە برآید**

**زباغِ عارضِ ساقی هزار لالە برآید**

کاتیّ هەتاوی مەی لەژێر خەلاّتی پێکەوە دەربیّ، هەزار گولاّلّە لەباخی رووخساری ساقی دەردێت (دەڕوێت).

چو: کاتیّ، کە. آفتاب می: هەتاوی مەی.

شرق: رۆژهەلاّت، شوێنی هەلاّتنی رۆژ.

خواجە (مەی)ی بەهەتاو چواندووە و دەلّیّ کاتیّ مەی کەوەك هەتاوە لە رۆژهەلاّتی پێکەوە هەلّدیّ لەباخی رووخساری ساقیدا هەزار گولاّلّە دەڕوێت

واتە: مەی لەپێك دەرژێت بۆ نێو دەم رووخساری ساقی سوور هەلّدەگەڕیّ.

لەلێکدانەوەی عیرفانیشدا واتای بەیتەکە بەم شێوەیە: کەهەتاوی عەشقی ئیلاهی هەلّدێت روخساری مورشیدی کاملّ گەشاوە و کاریگەر دەبێت و بەهەزار دەنگ دەڕازێتەوە.

**٢- نسیم در سرِ گل بشکند کُلالەی سنبل**

**چو از میانِ چمن بوی آن کُلالە برآید**

کاتیّ کەبۆنی ئەو پرچە لوولەی یار لە گولّزاردا بێت شەمالّ پرچی لوولی سونبول لەسەری گولّدا دەشکێنیّ.

بشکند: دەشکێنیّ، بشکێنیّ. کلالە: پرچی لوول.

پرچی لوول شکاندن (یا هەرشتیّ شکاندن) لەسەری کەسێکدا (گولّ)دا سووککردن و بەکەم زانینی ئەو کەسەیە یان ئەو شتەیە.

خواجە دەلّیّ: کاتیّ /کە شەمالّ دەستی بەبۆنی تۆکرد لەگولّزاری بووندا تەواوی بۆنەکانی سروشت یا بۆنە سروشتییەکانی نێو بوون بەسووك و بیّ نرخ دەزانیّ و کاکۆلّی لوولی سونبول لەسەری گولّدا ـ گولاّلّە ـ دا دەشکێنیّ.

واتە کاتیّ شەمالّ لەتەجەلیات و جیلوەی سیفاتی جەمالی حەق بە ئاگابێت جوانییە سروشتییەکان ئەدا بەسەر یەکدا و نرخیان بۆ دانانێت.

**٣- حکایتِ شب هجران نه آن حکایت حالی است**
**که شمّه‌ای ز بیانش به صد رساله برآید**

چیرۆکی شەوی دابڕان ئەو چیرۆکی حاڵە نییە، کە بتوانرێت کـەمێکی بـە سـەر کتێـب بەیان کرێت.

شمەای: کەمێك، تۆزێك. رسالە: کتێب.

حیکایەت و چیرۆکی دووری و دابـڕان لەمەعـشوقی حـەق، حیمایـەتی و چـیرۆکی حـاڵ و بەسەرهاتێکی زۆر دوور و درێژە و تەنانەت لەو چیرۆکەش ناچێت کە تۆزێکی / کـە کـەمێکی بەسەد کتێب دوایی دێت. بەڵکو تەنیا کەمێکی چیرۆکی دابڕان بەسەد کتێـب نانووسـرێتەوە و هەردوایی نایەت.

**٤- زگرد خوانِ نگونِ فلك طمع نتوان داشت**
**کەبی ملالت صد غصّه یك نواله برآید**

ئومێدی ئەوە ناکرێ لەسینی و سفرەی خڕی هەڵگەڕاوەی فەلەکـە کـەبێ ناڕەحـەتی سـەد خەفەت یەك پارو بەدەستبهێنرێت.

گردخوان: وشەیەکەی لێکدراوە بەواتای سفرەی خڕ، سینی نان خواردن کە خڕە.
نگون: سەراوبن، هەڵگەڕاوە. طمع: ئومێد. ملالت: ڕەنج و عەزاب، نارەحەتی.
نوالە: پارو.

وەك هەمیشە خواجە لە بێ وەفایی و پڕڕەنج و عەزابی دونیـا و گـەردوون ئـەدوێ، دەڵـێ: گەر گەردوون و دونیا سفرەیەکەی خڕی شاهانە بێـت — کـە سـەراوبنە و بـێ وەفایـە — ئـەوا هەرگیز ناتوانرێ مروڤ بەو ئومێدە بێ کە بەسەد دەرد و خەفەت پارووەیەکی دەستکەوێ.

واتە: ژیانی دونیا و دەستکەوتەکانی بەخەفەت و ڕەنج ئاوێتە بوون، و بەبێ ڕەنج و خەفەت بەدەست ناهێنرێن.

**٥- گرت چونوحِ نبی صبر هست درغم طوفان**
**بلا بگردد و کام هزار ساله برآید**

گەر وەك پێغەمبەر نوح (د.خ) لەخەمی تۆفاندا سەبرت هەیە، بەڵات لێ دوور دەکەوێتەوە و ئاواتی هەزار ساڵەت دێتە دی.

نوح نبی: حەزرەتی نـوح پێغەمبـەر و ئـاواتی دەهـەزار سـاڵە (کـام هـزار سـاڵە)ش هـەر پەیوەستە بەتەمەنی ئەو پێغەمبەرە بەرێزەوە.

بلا بگردد: بەلادەگەڕێتەوە، لا دەچێت. برآید: دێتەدی (لێرەدا).



بۆ گەیشتن بەئاوات سەبر و ئارامی پێویستە، گەر تۆش وەك حەزرەتی نوح سەبر و ئارامیت هەیە لەبەرامبەر تۆفان (کارەسات) دا، وەك ئەو بەڵات لێ دوور دەکەوێتـەوە و ئـاواتی هـەزار ساڵەت دێتە دی.

عەرەب گوتەنی ((الصبر مفتاح الفرج)).

**٦- به سعیِ خود نتوان برد ره به گوهر مقصود**
**خیال بود که این کار بی حواله برآید**

بەهەوڵی خۆ ناتوانرێ ڕێ ببرێتە سەر گەوهەری ویست و ئارەزوو، خەیاڵە کەئەم کـارە بـێ تەقدیری (قەدەر) ویستی ئیلاهی بکرێت.

سعی: هەوڵ. خیال بود: خەیاڵە. حوالە: ویستی ئیلاهی، مەشیئەتی ئیلاهی و تەقدیر

لەڕاستیدا ئەم بەیتە بەتەواوی بۆچوونی جەبرییەتی ئەشعەرییانەی حافظە، کـەپێیان یـاخود ڕاستر پێمان، چونکە کورد —خۆمان ئەشعەرین) وایە هەموو شتێ بە قەدەر و ویستی ئیلاهییە و قەدەر پێش ویستی ئێمە کەوتووە، خواجەش دەڵێ:

مرۆڤ ناتوانێ بەهەوڵی خۆی گەنج و گەوهەری موراد و ئارەزوو بدۆزێتـەوە و ڕێ بەرێتـەوە سەری بەڵکو ئەم کـارە بەمەشـیئەت و ویـستی ئیلاهییـە و گەرکەسـێ وابـیر بکاتـەوە بـەبێ مەشیئەت و قەدەری ئیهلاهی ئەکرێت خەیاڵ پلاوە.

**٧- نسیمِ وصلِ تو گر بگـذرد بر تربت حافظ**
**زخاكِ کالبدش صدهزار لاله برآید**

گەر شەماڵی وەسڵی (ژوانی) تۆ بەسەر گۆڕەکەی حافظ هەڵکات، لەخاکی جەستەی سـەد هەزار ناڵە دێتەدەرێ.

بگـذرد: تێپەڕێ. تربت: گۆڕ. کالبد: جەستە، قاڵب.

لەهەندێ نوسخەدا لەبری (وصل)، (زلف ـ خلخالی قزوینی) یا(لطـف ـــ سـودی) هـاتووە، هەروەها لەبری (ناله)ش لە زۆربەی نوسخەکاندا — جگە لە سودی و عیوضی- (لاله) هاتووە.

بەهەرحاڵ جگە لە بەڵگەی مێژوویی لەڕووی واتاییەوە پەیوەندی نێوان (شەماڵی ژوان و ناڵـە) پتەو تۆکمەترە تا گوڵاڵە هەرچەندە ئەمەی دواییش وێنەیەکی زۆر جوانی شیعری دەخولقێنێ.

خواجە لەم بەیتەدا لەحەسرەتی قووڵی خۆی بۆ ژوانی ـ هەرگیز بەدی نەهاتووی ـ نێـوان خۆی و مەعشوقی حەق دەدوێت و دەڵێ: تەنانەت گەر لەپاش مـەرگیش شـەماڵێکیش ئـەو ژوان و دیدارە بەسەر گۆڕەکەمدا هەڵکات سەد هەزار خاڵە لە جەستەی ڕزیوی بـەخاك بـووم بەرز دەبێتەوە.

لەشەرعی عیرفانی لاهوریدا (٣، ٤، ٥) نەهاتووە، لەراستیدا کەلە نەسەقی گشتی عیرفانی بەیتەکە وردەبینەوە ئەو سێ بەیتە زیادەو نامۆن، بەندە پێم وایە هەر ئەم نامۆییە کە بوونە هۆی لابردنیان ئەگەر نا لەتەواوی نسخە پەسەندکراو و ساغکراوە دێرینەکاندا ئەم سێ بەیتە هەیە.



## غەزەلی دوو سەد و سییەم :

**بەحری مونسرح هەشتی مەتوی مەنحور**

**(مفتعلن فاعلات مفتعلن فع)**

**١- برسرِ آنم که گر ز دست برآید**

**دست به کاری زنم که غصّه سرآید**

نیازم وایە کە ئەگەر لەدەستم بێت، دەست بەکاریێ بکەم کە خەفەتم دوایی بێت.

برسر آنم: نیازم وایە.        زدست برآید: لەدەستم بێت، بکرێ.

دست بەکاری زنم: بەکارێك هەستم، دەست بەکارێ بکەم.

سراید: دوای بێت، کۆتایی بێت.

خواجە لەسەرەتای کارێکدایە کە پەردەی خەم و خەفەت ئەدڕێنێ و ئەڵێ: گەر خوا یارمەتیم بدات و لەدەستم بێت نیازم وایە بەکارێك هەستم کە خەفەتم دوایی بهێنێ: بەپێی نەسەقی شیعری عاشقانە و عارفانی خواجەش ئەو کارە عەشقی ئیلاهی / بادەنۆشییە، هەروەك (سودی) ئاماژەی پێداوە. {هروی، ج٢، ل١٣١٩}

**٢- منظر دل نیست جای صحبت اضداد**

**دیو چو بیرون رَوَد فرِشته درآید**

تەماشاگەی دڵ جێگەی هاودەمی دژەکان نییە، کاتێ کە دێو/ شەیتان چووەدەرەوە فریشتە دێتە ژورەوە.

اضداد: دژەکان (وەك شەیتان و فریشتە).        بیرون رود: بچێتە دەرەوە.

درآید: دێتەژورەوە، دەردەکەوێ.

دڵ کە تەماشاگەی سیفاتی ئیلاهییە، لەحاڵەتە پەست و نزمە مرۆییەکاندا ئۆردوگای شەیتان و شەهوەتەکانە.

لەم حاڵەتەدا مرۆڤ یاخود دڵی مرۆڤ تەنها جێگەی یەکێکیانی تێدا دەبێتەوە چونکە ((ما جعل الله لرجل من قلبين في دجوفه...)) { سورەتی الاحزاب ئایەتی ٤}.

واتە خودای گەورە دوو دڵی لەپیاوێکدا دروستنەکردووە، ئەم تەنیا دڵەی مرۆڤیش جێگەی دوو دژی تێدا نابێتەوە چونکە ((الضدان لا يجتمعان)) ـ دوو دژ پێکەوە کۆنابنەوە ـ ئەو دوو دژەش دێو/ شەیتان ـ سەران و دەسەڵاتدارانی دونیا و شەهوەتە دنیاییەکان ـ و (فریشتە) ـــ

خۆشەویستی و عەشقی حەق ـ ن، هەر بۆیە کاتێ شەیتان (دونیا) لەدڵدا دەرچێت ئەو کاتە فریشتە و جوانییەکانی عەشقی حەق دەردەکەون.

**٣- صحبتِ حکّام ظلمتِ شبِ یلداست**

**نور ز خورشید خواه بو که برآید**

هاودەمی و هاوڕێیەتی دەسەڵاتداران تاریکی شەوی یەڵدایە، نور لە خۆر داواکە ڕەنگە هەڵبێت.

صحبت: هاودەمی و هاوڕێیەتی. ظلمت: تاریکی.

شب یلدا: شەوی یەڵدا ـ درێژترین شەوی ساڵ کە شەوی سەرەتای زستانە ١٢/٢١ و تاریکترین شەوە.

خواه: داواکە. باشد: ڕەنگە، لەوانەیە.

خواجە لێرەدا هاودەمی پێکەوە ژیان لەگەڵ دەسەڵاتداراندا بەتاریکی شەوی یەڵدا دەداتە قەڵەم و بەمرۆڤ و ڕێبواران دەڵێ: داوای ڕووناکی لە هاودەمی لەگەڵ حاکماندا مەکە چونکە ئەو هاودەمییە تاریکی شەوی یەڵدایە، گەردەتەوێ نورین بیت، داوای نور لە هەتاو بکە چونکە ئومێد هەیە هەڵبێت.

**٤- بر درِ اربابِ بی مروّتِ دنیا**

**چند نشینی که خواجه کی به درآید**

لەبەردەرگای دەسەڵاتدارانی بێ ڕەحم و ناپیاوی دونیادا چەند دادەنیشی (گەدایی دەکەی) بەو ئومێدەی کە خاوەن ماڵ کەی بێتە دەرەوە.

ارباب دنیا: دونیایی، ئەهلی دونیا. بی مروت: بێ ڕەحم / ناپیاو.

نشینی: دادەنیشی. خواجە: خاوەن ماڵ. بەدرآید: دێتەدەرەوە.

ئەم بەیتە سەرەکۆنەی ئەو زاهید و زانا و سۆفییانەیە کە بەردەرگای ماڵە دەوڵەمەند و دەسەڵاتدارەکان چۆڵ ناکەن و بەو ئومێدەی کە پارە و پولێکیان دەستکەوێ، خواجە پێیان دەڵێ: تاکەی لەبەردەرگای ئەهلی دونیای بێ ڕەحم و ناپیاودا خەریکی سواڵکردنی و بەوئومێدەوە کەئاخۆ کەی خاوەن ماڵ دێتەدەرەوە و خێرێکتان پێ دەکات.

{شرح غزلهای حافظ، احمد بۆسنەیی ـ ترجمە د. عصمت ستارزادە}

{شرح سوری بر حافظ، انتشارات زرین / نگاە، چاپ هفتم، سال ١٣٧٢}

**٥- ترکِ گدایی مکن که گنج بیابی**

**از نظر رهروی که در گـذر آید**



واز لەگەدایی مەهێنە چونکە گەنج دەدۆزیتەوە، لەنێو چاوانی ڕێبوارێکەوە کە بەگوزەردا ـ کولاندا ـ تێپەڕبێت.

بیابی: دەدۆزێتەوە، دەستت دەکەوێ از نظر: لەنێو چاوانی، بەعینایەتی.

رهرو: سالك، ڕێبوار. گـذر: گوزەر، کۆڵان، دەوربەر.

لەنوسخەی لاهوریدا (ترك بكن) هاتووە، گەر (بکن) وەرگرین گەدایی هاوڕێیەتی دەسەڵاتدارانە و ئەم بەیتە تەواوکەری بەیتی پێشوو دەبێت. بەڵام تەواوی نوسخە بەردەستەکانی بەندە ـ مکن ـ هاتووە کەلەم شێوەیەدا گەدایی، ئازادییە لەکۆت و بەندی دونیا و گەدای دەرگای مەعشوقی حەقە، خواجە دەڵێ واز لە گەدایی و سواڵکەری بەردەرگای مەعشوقی حەق مەهێنە چونکە ڕۆژێ لەچاوی ڕێبوارێکی ڕێگەی حەقە کەوازی لەماڵ و دونیا هێناوە و بەیارمەتی ئەو ـ کەبەم گوزەرەدا تێدەپەڕێ گەنجی ئارەزوو ئاواتی لەمێژینەت (مەعشوق) پەیدا دەکەیت و دەستگیری ئەبێ.

**٦- صالح و طالح متاعِ خویش نمودند**

**تا که قبول افتد و چه در نظر آید**

چاکەکار و بەدکار کاڵای خۆیان نمایشکردووە، تابزانین کێ قەبوڵدەکرێ و چ کاڵایەك دەبێتە جێگەی سەرنج.

صالح: چاکەکار، چاکە. طالح: بەدکار، خراپەکار. متاع: کاڵا.

خویش: خۆیان. نمودند: نمایش کردووە، خستووەتە ڕوو.

قبول افتد: قەبووڵبکرێت.

در نظر آید: دەبێتە جێگەی سەرنج.

واتە: ئێستا لەدونیا چاك و خراپ کردەوە و کاڵای خۆیان دەرخستووە و هونەری خۆیان نیشانداوە، تابزانین حەق لەم دوانە کێیان قەبوڵدەکات و چ کاڵایەك دەبێتە جێگەی سەرنجی کردگار.

**٧- بلبلِ عاشق تو عمر خواه که آخر**

**باغ شود سبز و شاخِ گُل به برآید**

ئەی بولبولی عاشق تۆ داوای تەمەنی درێژ بکە، چونکە سەرئەنجام باخ سەوز دەبێت ولقی گوڵ دێتەبەر (گوڵ دەگرێ).

عمرخواە: داوای تەمەنی درێژبکە. شود سبز: سەوز دەبێت، دەژێتەوە.

شاخ: چڵ، لق. بەبرآید: دێتەبەر.

بولبولی عەشق هەمان (صالحی) بەیتی پێشووە کە عاشقانی حەقن، بەم پێیەش طالحان سۆفیلکە و زاهیدانی ریاکارن، لێرەدا خواجە لە بەرهەمی قەبوولکراوی حەق دڵنیایە بۆیە بە عاشقان دەڵێ داوای تەمەنی درێژ بکەن تادڵنیابن لەوەی بەرهەمی ئێوە لای خوا قەبوولکراوە، چونکە دواجار باخی رەنجی ئێوە سەوز دەبێت و لقەکانتان گوڵ دەگرن.

**٨- غفلتِ حافظ درین سراچه عجب نیست**

**هرکه به میخانه رفت بیخبر آید**

بێئاگایی حافظ لەم ماڵۆچکەیەدا سەیر نییە، هەرکەس چووە مەیخانە بەبێ ئاگایی دێتەوە.

غفلت: بێ ئاگایی لەفەرهەنگی عیرفانیدا بێ ئاگایی بوونە لە غەیری خوا و ئاوڕدانەوەیە لێیان.

سراچە: ماڵۆچکە، مەبەست لە ماڵۆچکەی بوون / وجودە.

مەیخانە شوێنی بێ ئاگابوونە و لەڕووی عیرفانیشەوە عەشق شوێن و مەقامی بێ ئاگابوونە لە غەیری خوا و مەعشوق، بۆیە خواجە دەڵێ: من کە چوومەتە مەیخانەی عەشقەوە سەیر نییە لەم ماڵۆچکەی دونیایە بێ ئاگابم و گوێی نەدەمێ چونکە سیفەتی خودی مەیخانە/ عەشق وایە مرۆڤ بێ ئاگا دەکات لە جگە لە مەعشوق.



## غەزەلی دووسەد و سی و یەکەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەصلەم**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لن)**

**١- زهی خجسته زمانی که یار بازآید**

**به کامِ غمزدگانِ غمگسار بازآید**

لەوکاتە پیرۆزەی کەیار دەگەڕێتەوە، بەئارەزووی غەمباران غەمڕەوێنەر دەگەڕێتەوە.

زهی: وای، بۆ سەرسوڕمان و ستایش بەکاردەهێنرێت.

خجسته: پیرۆز و موبارەك، خۆش، چاکە.

زمان: کات، زەمەن. بازآید: دەگەڕێتەوە. غمزدکان: غەمباران، غەمگینان.

غمگسار: غەمخۆر غەمڕەوێنەر (درکەیە لە دۆست).

خواجە سەرسوڕمان و ستایشی خۆی بۆ ئەوکاتە خۆش و پیرۆزە دەخاتەڕوو کە یاری خەمڕەوێنی عاشقی غەمبارەکان دەگەڕێتەوە، ئەو دەڵێ: وای لەو کاتە خۆشەی کە یار دەگەڕێتەوە و بەئارەزوو و مورادی غەمباران دەگەڕێتەوە و غەمەکانیان دەڕەوێنێتەوە یاغەمیان دەخوات.

**٢- به پیش شاهِ خیالش کشیدم ابلقِ چشم**

**بدان امید که آن شهسوار بازآید**

ئەسپی چاوانم لەبەردەم شای خەیاڵیدا دانا، بەو ئومێدەی کە ئەو شاسوارە بگەڕێتەوە.

ابلق: ئەسپی رەش و سپی، ئەسپی باز، بازەی چاو. کشیدم: دامنا.

بدان: بەو.

واتە: چاوی رەش و سپی خۆم وەك ئەسپێك لەبەردەم پادشای خەیاڵی ئەو یارە شاسوارەمدا دانا و خستمە خزمەتی، ئەمەش بەو ئومێد و هیوایەی کەئەو شاسوارە (بەبینینی ئەسپی بازەی چاوم) دڵی نەرم بێت بەم ئەسپە بگەڕێتەوە.

**٣- مقیم برسر راهش نشسته‌ام چون گرد**

**بدان هوس که بدین رهگذار با زآید**

وەك گەرد و تۆز بەردەوام لە سەرەڕێی دانیشتووم، بەو ئارەزووەی کە بەم رەهگوزەرەدا بگەڕێتەوە.

مقیم: بەردەوام، دایمە.        برسرراهش: لەسەرەڕێیدا.

نشستەام: دانیشتووم.

گرد: گەرد و تۆز.        بدان هوس: بەو ئارەزووەی.

وەك چۆن هەرگیز گەرد و تۆز لە جادە نابڕێ (بەتایبەتی ڕێگەی خۆڵی جاران) خواجەش دەڵێ: ئاوا بەردەوام بەسەرەڕێی ئەو یارەدا (کەئەکرێ شاشوجاع بێت ـ بەگوتەی د. غنی، هروی، ج٢، ل٩٧٧) دانیشتووم تا بەڵکو بێرەدا بگەڕێتەوە و بیبینم.

**٤-   اگرنه در خمِ چوگانِ او رود سرِ من**

**ز سر چه گویم و سر خود چه کار بازآید**

ئەگەر سەری من لەپێناو خواری گۆچانی ئەودا بەخت نەبێ، لەبارەی سەرەوە چ بڵێم و ئەم سەرەی خۆم بەکەڵکی چ کارێك دێ.

خم چوگان: خواری گۆچان.    رود: بەخت بێت.    چ کار بازآید: بەکەڵکی چی دێت.

سەری من شیاوی ئەوەیە لەبەردەم ئەودا بەخت بێت گەر بەخت نەبێ بە کەلکی هیچ نایەت.

**٥-   دلی که با سرِ زلفین او قراری کرد**

**گمان مَبَر که در آن دل قرار بازآید**

دڵێك کە قەراری لەگەڵ سەری زولفەکانی ئەودا بەست، ئیدی گومان مەبە کە ئارامی و قەرار بگەڕێتەوە بۆ ئەودڵە.

زلفین: ئەڵقەی دوو زڵف.    قراری کرد: قەراری عەشق و خۆشەویستیدا.

قرار: سەبر و ئارامی.

گەر دڵ لەگەڵ زولفی پڕنهێنی یاردا قەراری بەست ئیدی هەرگیز سەبر و قەراری تێدا نامێنێت و گومان مەبە کە ئارامی بۆ بگەڕێتەوە.

**٦-   چه جورها که کشیدند بلبلان از دی**

**به بوی آنکه دگر نو بهار بازآید**

بولبولان چ ستەمێکیان لەدەست مانگی (دەی) کێشاوە، بەو ئومێدەی کەجارێکی دیکە نەوبەهار بگەڕێتەوە.

جور: ستەم.

دی: دەی، دەیەمین مانگی ساڵی کۆچی هەتاوی و یەکەمین مانگی زستان، واتە ١٢/٢١ تا ١/٢١ ی ساڵی میلادی.

نوبهار: بەهاری تازە.



عاشقان لەسەرما و سۆڵەی زستانی عەشق نارەحەتی زۆریان کێشاوە و بەو ئومێدەوە ژیاون کە نەوبەهاری عەشق بگەڕێتەوە.

**٧-   ز نقشبندِ قضا هست امیدِ آن حافظ**

**که همچو سرو به دستت نگار بازآید**

حافظ ئومێدی ئەو لەنیگارکێشی قەدەر /قەزا هەیە، کەیاری باڵابەرزی ـ وەك دارسەرو ـ بێتە بەردەستت (بکەوێتە دەستت و پێی شادبێت).

نقشبند: نگارکێش.

واتە ئەی حافظ ئومێدی ئەو هەیە لە خوا (نیگارکێشی قەزا) کەهەرئەو قەدەرەکانی مرۆڤ دادەنێ و دایناوە، ئەویارە بەژنرێکەی بەنسیب بکات و بیگەڕێنێتەوە بۆ لات.

## غەزەلی دوو سەد و سی و دووەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسلەم موسبەغ**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)**

**١- اگر آن طایرِ قدسی ز دَرَم بازآید**

**عمرِ بگذشته به پیرانه سرم بازآید**

گەر ئەو باڵندە پیرۆزە لەدەرگامەوە دەبێتەوە بەپیری تەمەنی رابردووم دەگەڕێتەوە.

طایر قدسی: باڵندەی پیرۆز، باڵندەی جیهانی باڵا و عەرش، جوبرەئیل، درکەیە لە مەعشوق / مەحبوب. زدرم: لەدەرگاوە. بگذشته: تێپەریو، رابردوو.

پیرانه سر: پیری.

خواجە یاری خۆی بەباڵندەی پیرۆزی جیهانی باڵا ئەداتە قەڵەم و دەڵێ گەربگەڕێتەوە بۆ لام لەم پیرییەدا جوان دەبمەوە و عومری رابردووم دەگەڕێتەوە.

من تۆم هەبێ بە پیریش دەچمەوە نێو منالّی (لەگۆرانی عەتا قەرەداغی یەوە)

لەبەیتی هەشتەمدا وەسفی پادشایەك كراوە و بەگوتەی د.غنی، ئەگەری ئەوە هەیە، کەئەم غەزەلە ـ غەزەلی پێشووش ـ بۆ رۆیشتنی شاشوجاع و دەسەڵاتی شا مەحەمەد واتە ساڵانی نێوان (٧٦٥ ـ ٧٦٧) نوسارابێت و خواجە ئومێدی هاتنەوە و گەڕانەوەی بخوازێت، {د.هروی، ج٢، ل٩٨١}

**٢- دارم امّید برین اشک چو باران که دگر**

**برقِ دولت که برفت از نظرم، بازآید**

ئومێدەوارم، بەم فرمێسکی وەك بارانە، جارێکی دیکە تیشکی خۆبەختی کە لە بەرچاوم ون بوو بگەڕێتەوە.

دارم امید: ئومێدەوارم، ئومێدم وایە.

برق: بروسکە بە تیشك.

برفت از نظرم: لەبەرچاوم ون بوو / رۆیشت.

یاری ونبوو/ رۆیشت بەبروسکەی خۆشبەختی دەزانێت و دەڵێ: ئومێدم بەم فرمێسکی وەك بارانەی خۆم هەیە کەجارێکی دیکە بروسکەی خۆشبەختی (کە هەوەرە بروسکە لەکاتی باراندا دەبێت) ـ یار ـ ی لەبەرچاوان رۆیشتوو/ ونبوو بگەڕێتەوە.



**٣- آن که تاجِ سر من خاكِ كف پایش بود**

**از خدا می طلبم تا به سرم بازآید**

ئەوکە تاجی سەری من خاکی ژێر پێی بوو، لە خوام داوایە بگەڕێتەوە سەر سەرم.

کف: ژێر — ناو. کف پا: ژێر پێ. بەسرم: سەرسەرم، گەورەییم.

واتە ئەو یارە کە تاجی سەرم خاکی ژێر پێی بوو، لە خوام داوایە جارێکی دیکە بگەڕێتەوە و ببێتەوە بەگەورە و تاجی سەرم.

**٤- خواهم اندر عقبش رفت و به یاران عزیز**

**شخصم ار باز نیاید خبرم بازآید**

بەدوایدا دەڕۆم و گەر جەستەم نەگەڕێتەوە بۆلای یارانی ئازیز خەبەرم دێتەوە بۆیان.

اندر: بە. عقب: داوا. اندر عقبش: بەدوایدا.

شخص: جەستە، پەیکەر.

من کەبەدوی یاردا دەڕۆم، گەر خۆم نەگەڕێمەوە بۆ لای یارانی ئازیز ئەوا هەواڵم دێتەوە بۆیان.

**٥- گر نثار قدم یار گرامی نکنم**

**گوهرِ جان به چەکارِ دگرم بازآید**

گەر گەوهەری گیانم نەکەمە قوربانی پێی یاری بەڕێز ئیدی بە کەڵکی چ کارێکی دیکەم دێت.

گرامی: بەڕێز، رێزدار. به چەکار دگرم بازآید: بەکەڵکی چی دیکەم دێت.

واتە: من گەوهەری گیانی خۆم دەکەم بەقوربانی بەرپێی یار (یا لەبەرپێی یاردا گیانم دەکەمە قوربانی ئەو) گەر ئەم کارەش نەکەم ئیدی گەوهەری گیانم بەکەڵکی هیچ کارێکی دیکەم نایەت.

**٦- مانعش غلغل چنگست و شکر خواب صبوح**

**ورنه گر بشنود آه سحرم بازآید**

رێگری ئاوازی چەنگ و خەوی شیرینی بەیانییە، وەگەر ناگەر گوێی لەئاهی بەیانییانم دەبیستێ دێتەوە.

مانع: رێگر. غلغل: خوێندنی (ئاوازی) باڵندە، قوڵە قوڵ.

غلغل چنگ: ئاوازی چەنگ، دەنگی چەنگ.

شکر خواب: خەوی شەکرین، خەوی شیرین.

صبوح: بەیانی، مەستی شەرابی بەیانییان.

یار گەر ئاه و ناڵەی بەیانییانم ببیستێ دێتەوە بەڵام ئەوەی کە بووەتە ڕێگر لەبەردەم بیستنی ئەم ئاه و ناڵەی مندا ئاوازی چەنگ و ساز و خەوی شیرینی مەستی شەڕابی صبوحییە، واتە چونکە یار سەرگەرمی گوێگرتن لە ئاوازی ساز و چەنگە و مەستی خەوی شیرینی شەڕابی صبوحییە بۆیە گوێی لەناڵەی بەیانییانی من نابێ کەلە دووری ئەو هەردەم ناڵەمە  وەگەرنا گەر گوێی لەناڵەم بێت دەگەڕێتەوە بۆ لام.

**٧- کوس نو دولتی از بامِ سعادت بزنم**

**گر ببینم که مهِ نو سفرم بازآید**

گەر بزانم مانگی تازە سەفەرکردووم دەگەڕێتەوە لەسەربانی خۆشبەختیدا تەپڵی تازە چوونەسەر تەخت لێ دەدەم.

کوس: تەپڵ.   کوس زدن: تەپڵێ لێدان

نو دولتی: کەسێ کەتازە بەپلە و پایەیەك گەیشتبێ و چووبێتە سەر تەخت.

بام: سەربان.   سعادت: خۆشبەختی، بەختەوەری.

نو سفر: تازە سەفەرکردوو.

جاران لەکاتێکدا کەکەسێك بەپلە و پایەیەك بگەیشتایە تەپڵیان لێدەدا، کە(کوس نو دولتی) یە لەچەند کاتێکی دیکەشدا تەپڵ لێدراوە وەك سەرەتا و کۆتایی مانگی ڕەمەزان یا بەگشتی لەکاتی بڵاوکردنەوەی هەواڵێکدا تەپڵیان لێدەدا، هەروەها لەکاتی گەڕانەوەی پاشا و سوڵتانی شار و وڵاتیشدا تەپڵیان لێدەدا.

تەپڵ لێدانی ئەم بەیتە لەجۆری یەکەم و دووەمە چونکە لەکاتێکدا بەگەڕانەوەی یار وەك ئەوە وایە خواجە (شاعیر) پلە و پایەیێکی بەرزی پێدرابێت، جگەلەمەش خواجە یاری بە (مانگ) هێناوە.

تەپڵی گەیشتن بەپایە لێدان لەسەربانی خۆشبەختیدا، درکەیە لەزۆر زۆر خۆشحاڵ بوون.

واتە: گەر ئەو یارە تازە سەفەرکردووەم بگەڕێتەوە زۆر زۆر خۆشحاڵ و خۆشبەخت دەبم.

**٨- آرزومند رخِ شاه چو ماهم حافظ**

**همّتی تا به سلامت ز درم بازآید**

حافظ ئارەزووی دیداری رووی وەك مانگی پاشام هەیە، هیمەتێ تا بە سەلامەتی بگەڕێتەوە بۆ لام.



آرزومند: ئارەزوومەندی.   همتی: هیمەتێ، واتە هیمەتێ بکە و دۆعایە بخوێنە.

واتە ئەی حافظ ئارەزووی دیداری رووی وەك مانگ جوان و درەوشاوەی پاشام هەیە، هیمەتێ بکە و دۆعایە بخوێنە تا بەسەلامەتی بگەڕێتەوە و خۆی بکات بەدەرگادا.

## غەزەلی دوو سەد و سی و سێیەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسلەم**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لن)**

**١- اگر به بادەی مشکین دلم کشید شاید**

**که بوی ِخیر ز زهد ریـا نمی آید**

ئەگەر بەشەرابی مسکین دڵم رادەکێشرێ شایستەیە، چونکە بـۆنی خێـر لـە زوهـدی ریـا بازانە نایەت.

بادە مشکین: شەڕابی میسکین، شەڕاب بۆنی میسکدار، جاران بـۆ بۆنخۆشـی و تامخۆشـی میسك و گوڵاو ماددەی بۆنخۆش دەکرایە شەڕابەوە.

کشد: رادەکێشری، حەزی لێی دەبێ. شاید: شایستەیە، حەقی خۆیەتی.

ئەگەر دڵم مایلی شەڕابی بۆنخۆشە (کەبۆنێکی میسکی لێ دێت) حـەقی خۆیـەتی چـونکە ئەو بۆنی خۆشە کەچی زوهیدی ریابازانە هیچ بۆنێکی خێری لێ نایەت کەمرۆڤ بەرەوخۆی یادڵ بەرەوخۆی راکێشێ.

بێگومان شـەڕاب، عەشـقی خۆشەویـستی حـەق و عیرفانـە کـەژیانی رەندانـدنی خواجـە قوتابخانەیەکی تایبەتی تایبەت بەخۆی ئەو رەوتەیـە، کەتیایـدا دوژمـنی زوهـدی ریابازانـە و خۆشیان لە زوهد نایەت ـ بەمەرجێ پێشوەختەوە نەبێت ـ.

**٢- جهانیان همه گر منع کنند از عشق**

**من آن کنم که خداوندگار فرماید**

گەر هەموو جیهانییان (خەڵکی جیهان) مەنعی من بکەن لە عەشق، من ئەو دەکـەم کـە خواوەند فەرمانی پێکردووە.

منع من کند: مەنعم بکەن، قەدەغەم بکەن. خداوندگار: خوداوەند، خاوەن.

گەر تەواوی خەڵکی دونیا نەهێڵن من خەریکی عەشقی عیرفانی خـۆم بم، مـن هـەر ئـەوە دەکەم کە خوداوەند فەرمانی پێـداوە و لەسـەر عەشـقی خـۆم بـەردەوام دەبم، مـن گوێڕایـەڵی خوداوەند و خاوەنی خۆم دەکەم نەکە خەڵکی.

**٣- طمع ز فیض کرامت مبُر که خلقِ کریم**

**گنه ببخشد و بر عاشقان ببخشاید**



لەفەیزی بەخشندەی ئومێدبڕاو مەبە، چونکە خوای بەخشندە وایە کە گوناه دەبەخـشێ و دەبەخشێتە عاشقان.

فیض کرامت: لافاو فەیزی بەخشندەیی و کەریمی. خلق: خو.

ببخشد: عەفو کراو. ببخشاید: دەبەخشێ.

ئەی عاشقی راست لەفەیزی بەخشندەی حەق ئومێدبڕاو مەبە چونکە خولق و خوی کەریم و خوداوەندی بەخشندە وایە گوناهباران عەفوو دەکـات و لێیـان خـۆش دەبێـت و بەرەکـەت و فەزڵێش دەبەخشێتە عاشقان.

**٤- مقیم حلقەی ذکراست دل بدان امّید**

**که حلقەای ز سرِ زلفِ یار بگشاید**

دڵ لەئەڵقەی زیکردایە، بەو ئومێدەی کە ئەڵقەیەك لەسەری زوڵفی یاربکاتەوە.

حلقەی ذکر: کۆڕ و ئەڵقەی زیکر. بگشاید: بکاتەوە.

دڵ ئومێدێکی هەیە کە ئەویش کردنەوەی ئەڵقەیە کە لە ئەڵقە زۆر بێ شومارەکانی سـەری زوڵفی یار (کە رازە ئیلاهییەکانن) ئەم ئومێدە وای لێکردووە بەردەوام لەکۆڕی زیکردا دانیشێ و خەریکی زیکر کردن بێت تا بەڵکو ئەو ئاواتەی بێتە دی و یەکێ لە پەردەکانی سەر نهێنییـە ئیلاهییەکان لادرێت.

**٥- ترا که حسنِ خداداده هست و حجلەی بخت**

**چه حاجت است که مشّاطەات بیاراید**

تـۆ کـەجوانی سروشـتی و ژووری رازێنـراوەی بـەختت هەیـە، چ پێویـست دەکـات کـە ئارایشتگەر ئارایشتت بکات.

خداداده: خواداو، سروشتی. حجله: پەردەی رازاوەی بووك و زاوا.

مشاطه: ئارایشتگەر.

بیاراید: بڕازێنێتەوە، ئارایشتت بکا.

تۆ ئەی یار کە جوانی سروشتی و بەختی پاکت هەیە، ئیـدی چ پێویـست بـە رازاندنـەوەی دونیایی و دەستکرد هەیە.

**٦- چمن خوش است و هوا دلکش است و میْ بی غش**

**کنون بجز دل خوش هیچ در نمی باید**

گوڵزار خۆشە و هەوا دڵگیر و مەی بێ غەش، ئێستا جگـە لـە دڵـی خـۆش هـیچ شـتێ پێویست نییە.

دلکش: دڵگیر.          دل خوش: دڵ شاد، دڵی خۆش.

در نمی باید: پێویست نییە،زەرور نییە لە (دربایستن)وە هاتووە بەواتای پێویست بوون، زەرور بوون.

ئێستا کە تەواوی شتە سروشتییەکان لەبارن بۆ ئەوەی مرۆڤ بچێتە نێو حاڵەتی مەستبوون و عەشقەوە مرۆڤ تەنیا پێویستی بە دڵێکی شادە کە هەیبێ تا بچێتە نێو ئەو حاڵەتەوە چونکە گوڵزار خۆش و هەوا لەبار و دڵگیرە مەی و شەڕاب عەشق بێ غەش و سافە.

**٧- جمیله ایست عروسِ جهان پی هُشدار**

**کە این مخدّره در عقدِ کس در نمی آید**

جیهان (دونیا) بووکێکی جوانە، بەڵام ئاگاداربە، چونکە ئەم داپۆشراوە (مەستورە) لەکەس مارە ناکرێت.

جمیلە: جوان.          هشدار: بەئاگابە، ئاگاداربە ، وریابە.

مخدرە: کچێ یا ژنێ کە هەمیشە لە پشت پەردەوەیە و خۆی بۆ کەس دەرناخات، مەستورە، داپۆشراوە.

درعقد کس درنمی آید: لەکەس مارە نابڕدرێت، بەژنی کەس نابێت.

راستە دونیا زۆر جوانە و هەر لەبووکێکی رازاوە ئەچێت بەڵام وریابە دڵ بەدونیا نەبەستی چونکە ئەم مەستورەیە بەژنی کەس نابێت و لەکەس مارە نابڕدرێت، یابەژنی کەس نامێنێتەوە، بووکی هەزار زاوایە.

(این عجوزه عروس هزار داماد)

**٨- به لابه گفتمش ای ماهرُخ چه باشد گر**

**بەیک شکر ز تو دلخستەای بیاساید**

بە کڵۆڵی گوتم پێی ئەی روو وەك مانگ چ دەبێ ئەگەر بە ماچێکی تۆ دڵبریندارێك ئارام بگرێت.

لابە: کڵۆڵی، ناڵە و داواکاری، تکا.          ماهرخ: روومانگ.

شکر: شەکر، درکەیە لەماچ.          دلخستە: دڵبریندار و غەمبار.

بیاساید: ئارام بگرێت، بەئارامی بگات.

بەکڵۆڵی و تکاوە گوتم بەیاری رووخسار وەك مانگ جوان، ئەی یاری روو مانگ ئایا چی رووئەدات گەر دڵبریندارێکی عاشقی وەك من بەشەکرە ماچێکی لێوانت (کەلام و قسەیەکی خۆتت) ئارام بگرێت وکەمێ هێور بێتەوە.



**٩- به خنده گفت که حافظ خدای را مپسند**

**کە بوسەی تو رخ ماه را بیالاید**

بەخەندەوە گوتی، حافظ بۆ خاتری خوا پەسەندی مەکە کە ماچی تۆ رووخساری مانگ پیس بکات.

خدای را: بۆ خاتری خوا.          مپسند: پەسەندی مەکە، رازی مەبە.

بیالاید: روو پیس بکات، گوناهبار بکات.

خواجە دەڵێ کاتێ کە بەکڵۆڵی داوای ماچێکم لەگۆنای وەك مانگی لێکرد بەخەندەوە گوتی ئەی حافظ بۆ خاتری خوا رازی مەبە کە تۆی پیس بەماچێك رووخساری مانگ (یار) پیس ببێ یا بە بۆنەی ماچێکی تۆوە گوناهبار ببێ.

لەڕاستیدا ئەم دوو بەیتە لە حەقیقەتی پەیوەندی و دووری و نزیکی عاشق و مەعشوقی عیرفانی دەدوێ.

## غەزەلی دوو سەد و سی و چوارەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەصلەم**
**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لن)**

**١- نفس برآمد و کام از تو برنمی آید**
**فغان که بخت من از خواب درنمی آید**

گیان گەیشتە قورقوڕاگەم و ئاواتی بە تۆگەیشتنم نایەتەدی، هاوار کە بەختی من لەخەو هەڵناستێ.

نفس: گیان، هەناسە. برآمد: دەرهات. نفس برآمد: گیانم گەیشتە کونەلووتم، گیانم دەرچوو. برنمی آید: حاصل نابێت، نایەتەدی. درنمی آید: دەرنایەت.
از خواب درنمی آید: لەخەو هەڵناستێ.

خواجە (نەسەقی شێوەکە) لەدوادوایی عومری بێ ئومێدی و بەئاوات نەگەیشتندا دەڵێ: ئەی یار گیان گەیشتە بیناقاقام و کەچی هیچ ئاواتێکم لەتۆ ـ کە بەتەمابووم بە تۆ بگەم ـ نەهاتە دی، ئەویش خەتای بەختی خەواڵووی خۆم بوو کە لەماوەی تەمەنمدا لەخەو رانەپەڕی و یارمەتی نەدام، هاوار لەدەست ئەو بەختە خەواڵووەم.

**٢- صبا به چشم من انداخت خاکی از کویت**
**که آب زندگیم، در نظر نمی آید**

سروە خاکێکی کۆڵانی تۆی خستەچاوانم، کەئیدی ئاوی حەیات لەبەرچاوم بەهای نییە.

انداخت: خستە. آب زندگی: ئاوی حەیات ، ئاوی نەمری و بەتام.
درنظر نمی آید: بەهای نییە.

ئەی یاری حەق سەبا ـ سروە ـ رۆژێ گردێك لەخاکی بەردەرگا و کۆڵانی تۆی رژاندووە چاوانم و ئەو خاکە بوو بە سورمە و چاوانی کردمەوە و نەفەسی رەحمانی تۆ و پریشکێك لەعەشقی تۆ وای لێکردم کەهیچ شتێ جگەلە تۆ بەلامەوە ئەرزش و بەهای نەمێنێ، تەنانەت ئاوی حەیاتیش لەلام هیچ نییە.

**٣- قد بلند ترا تا به بر نمی گیرم**
**درخت کام و مرادم به بر نمی آید**

تابەنی بەژنی تۆ لەباوش نەگرم، درەختی ئارەزوو و ئاواتم نایەتە بەر.



بەبرنمی گیرم: لەباوەش نەگرم، لەئامێز نەگرم.
بەبرنمی آید: نایەتەدی.

خواجە بەر و ئەنجامی ئارەزوو و ئاواتی خۆی بە لەباوەش گرتنی یاری باڵابەرزی خۆی دەزانێت، بۆیە دەڵێ: تائەو کاتەی بەدیداری تۆ شاد نەبم، درەختی ئاوات و ئارەزووم بەرناگرێت و بەئاوات نەگەیشتووم.

**٤- مگر به روی دلارای یار ماور نی**
**به هیچ و جه دگر کار برنمی آید**

مەگەر بەڕووی ئارامی بەخشی دڵانی یاری ئێمە کار ئەنجامبدرێت، ئەگەرنا بەهیچ شێوەیەکی دی کار بەئەنجام ناگا.

دلارای: دڵ ئارام کەر، بەئارامی بەخشی دڵان، شتێ کە مایەی خۆشی و چالاکی بێت.
ورنی: وەگەرنا، ئەگەرنا، ئەگینا.
به هیچ وجە: بەهیچ شێوەیەك.
برنمی آید: بەئەنجام ناگات، ئەنجامنادرێت.

رووخساری دڵارامکەری یاری ئێمە مایەی ئەنجامدانی کاری عەشق و تەواوی کارەکانی دیکە و جگە لەڕووی ئەو بە هیچ جۆرێ (یا بەهیچ روویەکی دیکە) کاری عەشق یا هەر کارێکی دیکە بەرهەمی نابێت.

واتە: ویست و ئارەزووی عاشق هەر بەڕووی یار بە بەرهەم دێت وەگەرنا گەر فەیز و بەرەکەتی رووی یاری حەق نەبێ گشت کارەکان بێ بەرهەمن.

**٥- مقیم زلف تو شد دل که خوش سوادی دید**
**وزان غریب بلاکش خبر نمی آید**

دڵ لە زوڵفی تۆدا نیشتەجێ بوو، چونکە بەمەنزڵێکی چاکی زانی و ئیدی لەو غەریبە زەحمەتکێشەوە هەواڵێك نایەت.

سواد: رەشایی، رەشایی شار کە لە دوورەوە دەردەکەوێ، گوند و مەنزڵ.
بلاکش: زەحمەتکێش، مەینەتبار.

ئەی یار هەر کەدڵ گەیشتە مەنزڵی زوڵفی تۆ لەوێدا نیشتەجێ بوو چونکە پێی وابوو کەئەم شوێنە بۆ نیشتەجێبوون زۆر لەبارە، هەر لەو کاتەشەوە ئیدی هەواڵێك لەو دڵەغەریبە مەینەتبار و زەحمەتکێشەی منەوە نایەت و ئاگام لێی نییە.

**٦- ز شست صدق گشادم هزار تیر دعا**

**ولی چه سود یکی کارگر نمی آید**

لەکەوانی ڕاستگۆییەوە هەزار تیری دوعام هاویشت، بەڵام چ سوودێکی هەیە کەیەکێکیان کاریگەری نییە.

شست: مشت، ئەو پەنجەیەی کە مشتی تیری پێ دەگیرێت لە کاتی تەقاندندا، لێرەدا درکەیە لە کەوان.

کەوانی ڕاستگۆیی، واتە بەدڵ و بە ڕاستگۆیی. گشادم: هاویشتم.

واتە: بەدڵ و بەڕاستگۆی هەزار دوعام کرد بەڵام چ سوودێکی هەیە کەیەکێکیان کاریگەریی نابێت بەئاواتی خۆم ـ کەگەیشتنە بەیارـ ناگەم.

**٧- کمینه شرط وفا ترک سر بود حافظ**

**برو اگر زتو کار این قدر نمی آید**

حافظ کەمترین شەرتی وەفاداری سەرفیداکردنە، ئەگەر ئەمەندەت لێ نایەت، بڕۆ وازبێنە.

کمینە: کەمترین، لای کەم. ترك سر: سەردانان، سەرفیداکردن.

این قدر: ئەمەندە. نمی آید: لێت نایەت.

خواجە بە خۆی دەڵێ سەربەختکردن لەپێناو مەعشوقی حەقدا کەمترین شەرتی وەفادارییە، بۆ عەشقی ئەو، گەر ئەم کارە بچووکەت (ئەمەندە کارەت) لێ نایەت و توانای سەردانانت نییە لەپێناو مەعشوقدا بڕۆ واز لەعەشق بهێنە.

ئەم غەزەلە یەکێکە لە غەزەلە پاراوەکانی خواجە و چێژێکی جیاوازی هەیە، بۆیە بەپێی سەلیقەی جیاوازەکان گۆڕانی بەسەردا هاتووە و دەستکاری کراوە- بەتایبەتی بەیتەکانی دوایی- بێجگە لەوەی لەنوسخە باوەڕپێکراوەکاندا ئەم حەوت بەیتە هەیە، لەهەندێ نوسخەدا — خلخالی و پەیڕەوانی ئەو — ئەم بەیتی ـ تەخەلوس ـ ە نییە و لەبری ئەم سێ بەیتی دیکە هەیە بەم شێوەیە:

**بَسَم حکایتِ دل هست بانسیم سحر**

**ولی به بختِ من امشب سحر نمی آید**

قسە و باسی زۆرم لەگەڵ سروەی بەیانیدا هەیە، بەڵام لەبەختی من ئەوشەو سروە هەڵناکات و نایەت.

**درین خیال به سر شد زمانِ عمر و هنوز**

**بلای زلفِ سیاهت بەسر نمی آید**



لەم خەیاڵەدا کاتی عومر تێپەڕی و هێشتا بەڵای زوڵفی ڕەشت تەواو نابێت.

**زبس که شد دلِ حافظ رمیده از همه کس**

**کنون ز حلقەی زلفت بەدر نمی آید**

لەگەڵ ئەوەی کەدڵی حافظ لەهەموو کەسێ رایدەکرد، کەچی ئێستا لەئەڵقەی زوڵفت نایەتە دەرەوە.

لەو نوسخانەی کە ئەم سێ بەیتەیان نەهێناوە غەزەلێکی شەش بەیتییان هێناوە کەجگە لەم سێ بەیتەش سێ بەیتی دیکەی هەیە.(سودی) پێی وایە کە هەرچەندە ئەم غەزەلە لە زۆربەی دیوانەکاندا نەهاتووە بەڵام لەبەرئەوەی لە شێوازی خواجەوە نزیکە نووسینەوە و شەرحکردنی پێویستە. {شرح سودی، ج ٢، ل١٣٤٥}

نوسخەی (عیوضی، هروی..) دا ئەم غەزەلە شەش بەیتییە بەم شێوەیە:

**١- ز دل بر آمدم کار برنمی آید**

**ز خود برون شدم و یار درنمی آید**

دڵم لەدەستدا و کارم بەرهەمی نییە و لەخۆم خاڵی بوومەوە (وازم لەخۆم هێنا) و کەچی یار دەرناکەوێ.

**٢- درین خیال سر شد زمان عمر و هنوز**

**بلای زلف سیاهت بەسر نمی آید**

لەم خەیاڵەدا ژیانم کۆتایی هات و هێشتا بەڵای زوڵفی ڕەشت دوایی نەهاتووە (هەمان بەیتی نوسخەی خلخالییە).

**٣- چنان به حسرت خاك در تو می میرم**

**که آب زندگیم در نظر نمی آید**

ئاوا بەحەسرەتی خاکی بەردەرگای تۆوە دەمرم کەئاوی حەیاتم لەبەرچاوم هیچ بەهایەکی نییە (نزیکە لەبەیتی دووەمەوە).

لە(سودی) دا ئەم بەیتە نەهاتووە و لەبری ئەم بەیتە بەیتی خوارەوە هاتووە:

**همیشه آه سحرگاه من خطا نشدی**

**کنون چه شد که یکی کارگر نمی آید**

هەرگیز ئاهی سەحەرگاهی من بەهەڵە نەدەرۆیشت و (ئامانجی دەپێکا) ئێستا چی بووە کە یەکێکیان کاریگەر نابێت.

**-بسم حکایت دل هست با نسیم سحر**

**ولی به بخت من امشب سحر نمی آید**

قسە و باسی زۆرم لەگەڵ سروەی بەیاندا هەیە بەڵام لەبەختی من ئەمشەو سروە هەڵناکات (بەیتی نوسخەی خلخالی).

**ـ فدای دوست نکردیم عمر و مال، دریغ**

**که کار عشق ز ما این قدر نمی آید**

عومر و ماڵمان نەکردە فیدای دۆست، بەداخەوە ئێمە ئەوەندە کاری عەشقمان لێ نایەت (نزیکە لەبەیتی تەخەلوس).

**- زبس که شد دل حافظ رمیده از همه کس**

**کنون ز حلقەی زلفت به در نمی آید**

لەگەڵ ئەوەی کە دڵی حافظ لەهەموان رایدەکرد کەچی ئێستا لەئەڵقەی زوڵفت دەرنایەت (بەیتی تەخەلوسی نوسخەی خلخالی).

لەڕاستیدا لەبەر ئەوەی کە ئەوسێ بەیتەی کەلێرەدا تازەن — لەنوسخەی (خلخانی)دا نەهاتوون ـ دووبارەی بەیتەکانی غەزەلەکەن و لەوان نزیکن، بۆیە گەر ئەو سێ بەیتەش لابەرین تەنیا سێ بەیتی نوسخەی خلخانی دەمێنێتەوە و لەسێ بەیتیش غەزەل پێکنایەت، بۆیە بەندە لەو بڕوایەدام کەناکرێ ئەمە غەزەلێکی سەربەخۆ بێت.



## غەزەلی دوو سەد و سی و پێنجەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی مەقسور**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلان)**

**١- مژده ای دل که مسیحا نفسی می آید**

**که ز انفاس خوشش بوی کسی می آید**

موژدە ئەی دڵ کە کەسێکی مەسیح نەفەس دێت، کە لە هەناسەی خۆشییەوە بۆنی کەسێك دێت.

مسیحا نفس: عیسا نەفەس، مەسیح نەفەس، کەسێك کە هەناسەی وەك حەزرەتی مەسیحە و مردوو زیندوو ئەکاتەوە، ڕزگارکەر، ناڕەحەتی بەخش.

نفاس: هەناسە.

خواجە موژدە بەدڵی خۆی دەدات و دەڵێ مزگێنیم بەرێ ئەی دڵ کەکەسێکی رزگارکەر دێت کەسێ کە لەهەناسەی خۆشی بۆنی یار و کەسێکی ـ بەحەق کەس- دێت.

**٢- از غم هجر مکن ناله و فریاد که دوش**

**زدەام فالی و فریادرسی می آید**

لەتاو غەمی دووری و دابڕان ناڵە و هاوار مەکە، چونکە شەوی رابردوو فاڵێکم گرتووەتەوە — بەپێی ئەو فاڵە — فریادرەسێك دێت.

زدەام فالی: فاڵێکم گرتۆتەوە.

فریادرس: فەریادرەس،کەسێ کە لەڕۆژی تەنگانەدا بەهانای لێقەوماوانەوە دێت.

تەواوکەری بەیتی پێشووە و موژدە بەدڵ دەدا: ئەی دڵ ئێستا کەدووری لەیار و لە غەمی دابڕانەی لەتاو غەمی دابڕان و ناڵە و هاوار مەکە، چونکە من دوێنێ شەو فاڵێکم گرتووەتەوە و لەوفاڵەدا وای نیشانداوە کە فریادرەسێك دێت و رزگارت دەبێ. کەوایە مادام غەمی هیجرانی (دونیا)ت هەردوای دێت مەناڵێنە.

**٣- ز آتش وادی ایمن نه من خرم و بس**

**موسی آنجا به امید قبسی می آید**

هەر من لەئاگری وادی ئەیمەن خۆشحاڵ نیم و بەس (موسا)ش (د.خ) بەئومێدی پریشکێکەوە بۆ ئەوێ دێت.

آتش: ئاگر.

وادی ایمن: وادی ئەیمەن، ئەو دۆڵەی کە حەزرەتی موسا یەکەم جار ئاگر ـ نوری ئیلاهی ـ تێدادی.        خزم: دڵشاد، خۆشحاڵ.        قبس: پریشك.

لەڕووی ڕەوانبێژییەوە بەیتەکە ئاماژەیە بەچیرۆکی حەزرەتی موسا و بینینی ئاگر لەدۆڵ و بیابانی ئەیمەندا و ڕۆیشتن بۆ ئاگر.

عارفەکان ئاگری وادی ئەیمەن بە جیلوە و تەجەلی حەق دەزانن لەشێوەی ئاگردا، چونکە لەوکاتەدا حەزرەتی موسا پێویستی بەئاگر هەبوو گەر حەق بە جۆرێکی دیکە جیلوەی بکردایە حەزرەت نەدەڕۆیشت، بەڵام جیلوەی حەق لەشێوەی پێویستی حەزرەتی موسادابوو.

بۆیە ئاگری دۆڵی ئەیمەن جیلوەی سیفاتی یاری حەقە بۆ بەندە تایبەتەکانی.

خواجە لێرەدا دەڵێ: تەنیا من نیم بەنوری تەجەلی و جیلوەی سیفاتی حەق خۆشحاڵم و بەهیوام بەو پایەیە بگەم بەڵکو حەزرەتی موساش بەهیوای پریشکێ بوو لە نوری حەق هەرچەندە موسا ئەمەی نەدەزانی و بۆ (نار) چوو نەك بۆ (نور).

**٤- هیچکس نیست که درکوی تواش کاری نیست**

**هرکس آنجا به طریق هوسی می آید**

هیچ کەس نییە کەلە کۆڵانی تۆدا کارێکی نەبێ، هەرکەس بەئارەزوویەکەوە دێتە ئەوێ (کۆڵانی تۆ).

هوسی: ئارەزوویەك، هیوایەك.

دیسان خواجە بەیاری حەق دەڵێ: ئەی یار کەس نییە لەخزمەت تۆدا کارێکی نەبێت و نەیەتە بەردەرگات و دەستت بۆ بەرز نەکاتەوە، بەڵام هەرکەس بەهیوایەکەوە دێت و داواکاری شتێکە و شتێك ڕای دەکێشێت.

**٥- کس ندانست که منزلگه معشوق کجاهست**

**این قدر هست که بانگ جرسی می آید**

کەس نەیزانی کە مەنزڵگەی مەعشوق لەکوێیە، ئەمەندە دەنگی جەرەسێك (زەنگێك) دێت.

منزلگە: مەنزڵگە، شوێنی حەوانەوە.        بانگ جرس: دەنگی زەنگ.

جاران لە کاتی کارواندا دەنگی زەنگ لەسێ کاتدا دەهات:

١- لەکاتی گەیشتنی سەرقافڵە بەمەنزڵگە.

٢- لەکاتی هەستان بۆ ڕۆیشتن.



٣- لەڕێگەدا بەردەوام دەنگی زەنگەکان دەهات کە ئومێدی ڕێ لێ ون بوونی لەگەڵ دابوو{خرمشاهی، ج٢، ل ٨٠٤}.

هیچ کەسێ نازانێ مەنزڵگەی مەعشوقی حەق لەکوێدایە، تەنانەت لای عارف و عاشق و تایبەت و پێغەمبەرانیش بەڵام ئەوەندە هەیە کەدەنگێك دێ کە لەڕێگەداین بۆ لای حەق و ئومێدی گەیشتن هەیە.

لەفەرهەنگی عیرفانیدا ئەو جەرەس و زەنگە بە ئیلهامات و نیگا (وەحی) پیاوچاکان و پێغەمبەران لێکدراوەتەوە.

واتە: هیچ کەسێك ناتوانێ مەنزڵگەی یاری حەق بزانێت بەڵام ئیلهام و نیگاشی بەردەوام ئومێدەوارمان دەکات و حەقمان لێ ون نابێ.

**٦- دوست را گر سر پرسیدن بیمار غم است**

**گو بران خوش که هنوزش نفسی می آید**

گەر دۆست نیازی هەواڵ پرسی بیماری خەمی هەیە، بڵێ خۆش بڕۆ چونکە هێشتا هەناسەیەك دەدات.

پرسیدن: هەواڵپرسی، بەسەرکردنەوە، مواجە.

سرست: نیازی هەیە، لەسەریدایە.

بیمار غم: نەخۆشێك کەنەخۆشی غەمی دووری هەیە

گو: بڵێ، پێی بڵێ.

بران خوش: خۆش بڕۆ، خێراکە.

هنوزش نفسی آید: هێشتا هەناسەکەی تیاماوە، هێشتا نەمردووە.

بەیار بڵێن گەر دەیەوێت سەردانی ئەوعاشقە بکات کە نەخۆشی غەمی دووری هەیە، خێرا بڕوات چونکە ئەو لەسەرەمەرگدایە و هێشتا نەمردووە و هەناسەیەکی تیاماوە بافریاکەوێت.

**٧- خبر بلبل این باغ بپرسید که من**

**نالەای می شنوم کز قفسی می آید**

هەواڵی بولبولی ئەم باخە بپرسن چونکە من ناڵەیەکە دەبیستم کە لە قەفەسێکەوە دێت.

خبر بپرسید: هەواڵ بپرسن.

خواجە خۆی بەبولبولی باخی عەشق دەزانێت و دەڵێ یاران هەواڵێکی ئەم بولبولەی باغی عەشق بپرسن چونکە من گوێم لەناڵەیەکە لەقەفەسێکەوە دێت.

**٨- یار دارد سر آزردن حافظ یاران**

**شاهبازی به شکار مگسی می آید**

یاران، یاری نیازی وایە حافظ ئازار بدات، سەیرکەن شابازێك بۆ راوی مەگەزێك دێت.

آزردن: ئازاردان. شاهباز: شاباز. مگسی: مەگەزێك.

خواجە لەبەرامبەر شابازی یاردا خۆی بە مەگەزێك دەزانێ و دەڵێ یاران یاردەیەوێ ئازارم بدات منێکی کلۆڵ و بێ دەسەڵات لەبەردەم ئەودا وەك مەگەزێکی بەردەم شابازێك وام.

لەهەندێ نوسخەدا لەبری (آزردن) (پرسیدن) یا (دل)هاتووە.



## غەزەلی دوو سەد و سی و شەشەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی مەقسور**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلان)**

**١- رسید مژده که آمد بهار و سبزه دمید**

**وظیفه گر برسد مصرفش گل است و نبید**

موژدە گەیشت (درا) کە بەهار هات و سەوزایی سەری لەخاك دەرهێنا، گەر رۆژانە بگات لەگوڵ و شەرابدا سەرفی دەکەم.

سبزە: سەوزایی. دمید: سەری لەخاك دەرهێنا، سەوزبوو، روا.

وظیفە: رۆژانە، مەعاش، پارەیەك کەبۆ مرۆڤ دەبڕدرێتەوە (مانگانە بێت یا رۆژانە).

مصرف: سەرفکردن، خەرجکردن. نبید: شەرابی خورما، شەراب (بەگشتی).

خواجە دەڵێ: موژدەدرا کە بەهار هات و گوڵ و سەوزایی سەریان لەخاك دەرهێنا و کەش و هەوا لەبارە بۆ خۆشگوزەرانی و شەرابنۆشکردنی عاشقانە، بۆیە لەم کەش و هەوا لەبارەدا گەر پارەمان بگاتە دەست بۆ گوڵ و شەرابی عەشق خەرجی دەکەین.

**٢- صفیر مرغ برآمد بط شراب کجاست**

**فغان فتاد به بلبل نقاب گل که کشید**

ئاوازی باڵندە هات، سوراحی شەراب لەکوێیە، بولبول کەوتە هاوار کەمێ پەردەی لە روی گوڵ لادا.

صفیر: ئاواز. برآمد: هەستا، هات، کەوتە بەرگوێ.

بط: سوراحی شەراب کە لەشێوەی مراویدا دروستکراوە.

فغان فتاد بەبلبل: بولبول کەوتە هاوار.

کشید: لایدا.

خواجە لەهاتنی بەهار ئەدوێت کەتیایدا کەش و هەوا لەباردەبێ و درێژەی بەیتی پێشووە.

دەڵێ: کەبەهار هاتووە باڵندەکان کەوتوونەتە خوێندن و وەك ئەوی کە کەسێکیش پەردەی لەسەر رووخساری گوڵ لادابێت بولبولیش کەوتووەتە هاوار و ناڵە- لەشەوق و تاسەدا یان لە حەسرەتی دەرکەوتنی گوڵدا بۆ ئەغیار، ئەی ساقی کوا شەرابی خۆشەویستی تامنیش لەم بەهاری عیشقەدا وەك ئەوان سەرمەست بم.

**۳-ز روی ساقی مهوش گلی بچین امروز**

**که گرد عارض بستان خط بنفشه دمید**

ئەمڕۆکە بەدەوری خەتی رووخساری باخدا گوڵی وەنەوشە رواوە لەڕووی ساقی مانگ ئاسا گوڵێ بچنە.

مهوش: مانگ ئاسا. بچین: بچنە. گلی بچین: گوڵێ بچنە- ماچێ بکە.

گرد: دەوری. عارض بستان: روخسای باخ.

لە سەرەتای بەهاردا کە روخساری باخ بە وەنەوشە دەورەدراوە و رازاندوویەتییەوە، تۆ بەفرسەتی بزانە و لە روخساری ساقی جوانی مانگ ئاسا- واسطە ی رێگەی حەق- بەهرەمەند ببە گوڵێکی ئەو فەیزە بچنەرەوە.

**٤- چنان کرشمەی ساقی دلم ز دست ببرد**

**که با کسی دگرم نیست برگ گفت و شنید**

کریشمەی ساقی وادڵی لە دەست رفاندووم کەلەگەڵ کەسی دیکەدا تاقەتی قسە و گوێکرتنم نییە.

کرشمە: ناز و کریشمە. دلم ز دست ببرد: دڵی رفاندم.

برگ: تاقەت، ویست، نیاز. گفت و شنید: گفتوگۆ، قسەکردن و گوێگرتن.

ناز و کرێشمەی ساقی بەیەکجاری دڵی رفاندووم و دڵم لەدەست داوە، بەجۆرێك کەئیدی تاقەتم نییە لەگەڵ هیچ کەسی دیکەدا گفتوگۆ بکەم و بکەومە قسە.

**٥-ز میوەهای بهشتی چە ذوق دریابد**

**هر آن کە سیب زنخدان شاهدی نگزید**

لەمیوە بەهەشتییەکان چ چێژێك وەردەگرێت، ئەو کەسەی کە گازی لە سێوی چەناکەی یارێك نەگرت.

ذوق دریابد: چێژوەرگرتن. سیب: سێو.

زنخدان: چەناگە. نگزید: گازی لێنەگرێت، قەپی لێنەگرێت.

لەڕاستیدا میسراعی بەیتەکە پاش و پێشن، واتەخواجە دەڵێ: کەسێ کە لێرە لەدونیا گاز لەسێوی چەناگەی یارێك نەگرێت ناتوانێ لەمیوەکانی بەهەشتیش چێژ وەرگرێت (شاهد) لای هەندێك لەعارفەکان مورشید و رابەری تەریقەتە — بەتایبەتی زۆربەیان کە باوەڕیان وایە بەبێ مورشید مرۆڤ بەهیچ کوێ ناگات و خواجە لەم غەزەلەدا لەبەیتی هەشتەمدا زۆر بەڕوونی و ئاشکرایی ئەم رایە دەخاتەڕوو.



واتە کەسێ کە لێرە بەخزمەتی مورشید و پیرێکی تەریقەت نەگات و لە حزوری ئەمدا نەبێ و لە هاودەمی و ئامۆژگاری و رێنماییەکانی بەهرەمەند نەبێت چێژ لە میوەکانی بەهەشت وەرناگرێت.

بەگشتی: سێوی چەناگەی یار، مەعریفەتی شهودییە و چێژوەرگرتن لە میوەکانی بەهەشتیش وابەستەی مەعریفەتی شهودی ئەم دونیایەیە.

**۶-من این مرقّع رنگین چو گل بخواهم سوخت**

**که پیرِ بادە فروشش بە جرعەای نخرید**

من ئەم خیرقە خەت خەتە کە کە وەك گوڵ رەنگینە بەمەی سوور بووە- و پیری مەیفرۆش بەقومێك شەڕاب نایکرێت دەسووتێنم.

مرقع: خەت خەت، وەك شاڵی کورتی کە پارچە پارچە و بەیەکەوە لکێنراون، جاری واهەبووە کە پارچەکان لکێنەچوون و ڕەنگاوڕەنگ و رەنگین بووە.

رنگین چو گل: سوور و رەنگاوڕەنگ وەك گوڵ، کەبەهۆی مەینۆشییەوە سوور و رەنگاوڕەنگ بووە.

بخواهم سوخت: دەیسووتێنم، لەداهاتوودا چونکە ئەم رێژەیە بۆ داهاتووە و لەکوردیدا نییە.

نخرید: نایکرێ.

خواجە دەڵێ: من ئەم خرقە پارچە پارچە رەنگاوڕەنگەی خۆم — کە رەمزی سۆفیلکەیی رەسمی منە و بەشەڕابی عەشقیش سووربووە و لای پیری بادەفرۆش -مورشیدی عارفی حەق- قومە شەڕابێکیش ناهێنێ (و بەقومە شەڕابێك لێم ناکرێ) دەسووتێنم و فڕێی دەدەم.

واتە: واز لە سۆفیلکەیی دەهێنم و رێگەی پیری بادەفرۆشی عەشقی حەقیقی دەگرم.

**۷-عجایب رە عشق ای رفیق بسیاراست**

**زپیش آهوی این دشت شیر نر بدوید**

ئەی رەفیق سەیر و سەرسوڕهێنەری رێگەی عەشق زۆرە، نەڕەشێر لەبەردەم ئاسکی ئەم دەشتەدا هەڵدێت (رادەکات).

شیرنر: نەڕەشێر (لەبنەڕەتدا شێری نێرە کەزۆر ئازایە).

بدوید: رادەکات، هەڵدێت.

خواجە لە سەیر و سەمەرەکانی رێگەی عەشقی حەقیقی ئەدوێت و دەڵێ: ئەی رەفیقان ئەم رێگەیە عەجایبی زۆر زۆرە، و رێگەیەکە کە تیایدا نەڕەشێری دەرەوە لە بەردەم ئاسکی ئەوێدا هەڵدێ.

واتە: گەرمرۆڤ بچێتە نێو ڕێگــە و دونیـای عەشـقەوە، هێنـدە دلێـر دەبـی کـە نەڕەشـێر لەبەردەمی هەڵدێت.

مولانا گوتەنی: زهره شیر است مرا جان دلیر است مرا.

**٨- بەکوی عشق منه بی دلیل عشق قدم**

**کە گم شد آنکە در این رە بە رهبری نرسید**

بەبێ ڕێبەر و دەلیلی ڕێگە پێ مەخەرە نێو کۆڵانی عەشقەوە چونکە ئەوکەسەی کە لەم ڕێگەیەدا بەرابەرێك نەگەیشت ونبوو.

منە قدم: هەنگاو مەنێ، پێ مەخەرە.    دلیل: ڕێبەر، دەلیل و پێشەنگ.

نرسید: نەگەیشت.

وەك گوتمان عارفەکان بوونی مورشید و رابەر بەپێویستی ڕێگەی عەشق دەزانن و ڕۆیشتن لەم ڕێگەیەدا بەبێ رابەر و مورشید بەئەستەم دەزانن.

خواجەش بەدڵنیاییەوە دەڵێ: لەم ڕێگەیەی عەشقی حەقدا هەرکەس تووشی رابەرێك نەبوو کەلەگەڵ خۆی بۆ مەنزڵی بەرێت، ونبوو، ئامان تۆش بەبێ دەلیل و رابەر پێ مەخەرە نێو کۆڵانی عەشقەوە و هەنگاو هەڵمەگرە.

**٩- مکن ز غصّە شکایت کە در طریقِ طلب**

**بە راحتی نرسید آنکە زحمتی نکشید**

شکات لەخەفەت مەکە، چونکە لەڕێگەی داواکردندا ئەوکەسەی کە زەحمەتی نەکێشا بەرەحەتی و ئاسودەیی نەگەیشت.

راحتی: ئاسودەیی، رەحەتی، ئارامی.    زحمتی نکشید: زەحمەتی نەکێشا، هەوڵی نەدا.

خواجە لێرەوە هەوڵدان و زیارەت یا چلەکێشان و...هتد بەمەرجی گەیشتن دەزانێت لەڕێگەی داواکردنی ئاسوودەیی و گەیشتن بەیادی حەقدا، بۆیە بەڕێبواران دەڵێ، لەدەست خەفەت و غەمی عەشق شکات مەکە و بێزار مەبە چونکە لەم ڕێگەیەدا کەسێ بەئاسودەیی دەگات کە هەوڵبدات و زەحمەت بکێشێ بەپێچەوانەوە ئەوی هەوڵی نەدا و زەحمەتی نەکێشا بەئارامی و ئاسودەی نەگەیشت.

**١٠- خدای را مددی ای دلیل راه حرم**

**کە نیست بادیەی عشق را کرانە پدید**

ئەی دەلیلی ڕێگەی حەرەمی یار بۆ خاتری خوا یارمەتییەکم بدە، چونکە کەناری (ئەوسەری) بیابانی عەشق دیارنییە.



خدای را: بۆ خاتری خوا، لە ڕێی خوا.    مددی: هاوکارییەك، یارمەتییەك.

بادیەی عاشق: بیابانی عەشق.    کرانە: کەنار، ئەوسەر و ئەمسەر.

پدید: دیاربوون.    نیست پدید: دیارنییە.

هەمیشە خواجە (ڕێگە / ئاگر / دەریا) ی عەشق بەترسناك و دوایینەهاتوو، نەبڕاوە دەزانێت، لێرەدا لەگەڵ ئەم رایەدا داوای یارمەتی لە مورشیدی حەق و دەلیلی ڕێگەی حەرەمی یاردەکات کە یارمەتی بدات و دەستی بگرێت چونکە ڕێگە/ بیابانی عەشق نەبڕاوەیە و ئەم سەری دیار نییە.

**١١- گلی نچید ز بستان آرزو حافظ**

**مگر نسیم مُروّت درین هوا نوزید**

حافظ لە باخی ئارەزوو گوڵێکی نەچنی، ئەڵێی شەماڵی جوامێری لەم هەوایەدا (هەلومەرج) هەڵی نەکرد.

نچید: نەچنی.    مروّت: جوامێری، پیاوەتی، مەردایەتی.

هوا: هەوا، کەش و هەوا.

خواجە لە باخی ئارەزووی خۆیدا هیچ گوڵێکی نەچنیوە و بەهیچ ئارەزوویەکی نەگەیشتووە بۆیە گومان لەهەوا و کەشەکە دەکات و دەڵێ: ئەڵێی لەم هەوا و کەشەدا ئەسڵەن نەسیمی پیاوەتی هەڵی نەکردووە تا من بە ئاوات بگەیەنێ، لەزۆربەی نوسخەکاندا لەبری (هوا) (چمن) هاتووە کەمەبەست لەدونیایە بەڵام لەبەرئەوەی کەئەم غەزەلە زۆرترین شێوەی ساغکردنەوەی هەبوو، هەروەها جیاوازییەکی زۆر زۆر لەنێوان نوسخەکاندا هەبوو کە لە (٨) بەیتەوە تا (١٣) بەیت هاتووە، ئێمە پەیڕەویمان لەنوسخەی (عیوضی) کرد و لەبەر ئاڵۆز نەکردنی بارودۆخەکە و تێکەڵاونەبوونی شێوەکانی دیکەش تەواوی جیاوازییەکانی دیکەمان فەرامۆشکرد وەگەرنا (چمن) جوانترە.

وەك گوتم لەنوسخەی خلخالی —قزوینی و خرمشاهی دا ئەم غەزەلە لە (٨) بەیتە و لە لاهوری و سودی دا (١٣) بەیت و لە (هروی) دا (١٢) بەیت و لە عیوضی دا (١١) بەیتە، بەندە پەیڕەوی لە نوسخەی ساغکراوەی جەنابی د.عیوضی کردووە، ئەمەش بەدوو بەڵگە:

١- بەندە بەشەرمەزارییەوە ناوێرم خۆم لەقەرەی دروستکردنی نوسخەکەی دیکە بدەم.

٢- بەتێکەڵاوکردنی نوسخەکان و هەڵبژاردنی تێکەڵاوییەك لەشێوەکان هیچ سوودێك بە غەزەلەکان ناگات و جیاوازییەکی دیکە دێنێتە ئاراوە.

## غەزەلی دوو سەد و سی و حەوتەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسلەمی موسبەغ**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان)**

**١- معاشران ز حریفِ شبانه یاد آرید**

**حقوقِ بندگیِ مخلصانه یاد آرید**

هاوڕێیانی بەیارگەیشتوو، یادی هاوپێکی شـەوانەی خۆتـان بکەنـەوە و مـافی بەندایـەتی موخلیسانەی ئەو بهێننەوەیاد.

معاشران: ئەوانەی کەگەیشتوون بەیار و لەگەڵ ئەودا دەژین.

حریف: هاوپێك. شبانە: شەوانە.

یاد ارید: یادبکەنەوە، بەیاد بهێننەوە. حقوق: حەقدەست، ماف.

خواجە ڕوو لەو هاوپێکانەی شەوانی تەنیایی خۆی دەکات کە ئێستا گەیشتوون بەدیـداری یاری حەق و لەگەڵ ئەودا دەژین و پێیـان دەڵـێ: یـادی هـاوپێکی ئەڵقـەی عەشـق و مەسـتی شەوانەی خۆتان بکەنەوە و لەخزمەت یاردا حەقدەست و کرێ و مـافی بەندایـەتی و گوێڕایـەڵی موخلیسانە و پاکی من بەبیر بهێننەوە.

**٢- بە وقتِ سرخوشی از آە و نالەی عشّاق**

**بە صوت و نغمەی چنگ و چغانە یاد آرید**

لە کاتی سەرخۆشیدا بە دەنگ و ئاوازی چەنگ و ساز، ئـاه و ناڵـەی ئێمـەی عاشـق بەیاد بهێنینەوە.

بەوقت: لەکاتی. چغانە: جۆرە سازێکە.

لەدرێژەی بـەیتی یەکەمـدا خواجـە بـە(معاشـران) دەڵـێ: لەکاتێکـدا کـە لەگـەڵ یـاردا سەرمەستن و لەدەنگ و ئاوازی مۆسیقاوە خەریکی شادی گێڕانن، ناڵە و ئاهی ئێمە عاشـقانی مەحروم لەخۆشی و سرور و ژوانی یار بـەیاد بهێننـەوە. جۆرەکـانی یادکردنـەوە لەبەیتـەکانی دیکەدا باسدەکات.

**٣- چو لطف بادە کند جلوە در رخِ ساقی**

**ز عاشقان بە سرود و ترانە یاد آرید**

کاتێ کە سەفا و جوانی شەراب لە ڕووخساری ساقیدا جیلوە دەکات بە سروود و گـۆرانی، عاشقان بەیاد بهێننەوە.



لطف بادە: سەفا و نوری بادە، جوانی بادە. ترانە: گۆرانی.

ئەی هاوڕێیانی بەیار گەیشتوو کاتێ کـە نـور و سـەفای شـەراب لـە ڕووخسـاری سـاقیدا دەردەکەوێت (واتـە کـاتێ مورشـید- لەفەرهـەنگی عیرفانیـدا — لەعەشـقدا مەسـت دەبێـت ئاسەواری عەشق لە ڕووخساریدا دەردەکـەوێت ئـەو کاتـە بـە گـۆرانی و سـرود یـادی ئێمـەی عاشقانی مەحروم بکەنەوە.

**٤- چو در میان مراد آورید دستِ امید**

**ز عهدِ صحبت ما در میانە یاد آرید**

کاتێ کەدەستی ئومێدتان خستە کەمەری مورادەوە، یـاری سـەردەمی هـاودەمی لەگـەڵ ئێمەدا بکەنەوە.

میان: کەمەر.

دەستی ئومێد خستنە کەمەری ئارەزوو و ئاوات، ئومێدی بەئاوات گەیشتنە، یاخود خودی بـەئاوات گەیشـتنە. کـاتێ کەبـەئاواتی خۆتـان گەیشـتن وـ بـەیار گەیشـتن ـ یـادی ئێمـەی هاودەمیشتان بکەنەوە.

**٥- نمی خورید زمانی غم وفاداران**

**ز بی وفایی دورِ زمانە یاد آرید**

کاتێ غەمی وەفاداران ناخۆن بێ وەفایی دەوری ڕۆژگار بەیاد بهێننەوە.

نمیخورید غم: غەم ناخۆن، بیرتان بە لایانەوە نییە. زمانی: کاتێ.

ئەی یاران ئێستاکە بەئاوات گەیشتوون غەمی ئێمەی وەفادار ناخۆن و ڕیگەچارەیەکمان بـۆ گەیشتن بەمەعشوق بۆ نادۆزنەوە، بیری بێ وەفایی دەوری ڕۆژگار بکەنەوە، کەچەندە بێ وەفایە و ڕۆژگارێك ئێوەش دەکەونە نارەحتییەوە و کەس غەمتان ناخوات.

**٦- سمندِ دولت اگر چند سرکشیدە رود**

**ز همرهان بە سرِ تازیانە یاد آرید**

گەرماوەیەك ئەسپی بەختت سەربەرز بڕوات، بە سەرە قامچیش بێت یادی هاوڕێیان بکەرەوە.

سمند: ئەسپ، سودی نووسیویەتی ئەسپی هۆڵاکـۆ، کەئەسـپی جەنگـە و بـەزۆری ئەسـپی ڕەنگ قاوەیی و سپییە. { شرحی سودی، ج٢، ل ١٣٧٢}

سمنددولت: ئەسپی بەخت. چند: چەند ڕۆژێ، ماوەیەك.

سرکشیدە: سەربڵند، سەربەرز. رود: بڕوات.

بە سر تازیانە: بەسەرەقامچی، مەبەست لە کەم و تۆزێکە.

واتە: باماوەیەکیش بەختت لە ترۆپکدا بێت بەڵام هەر یادی هاوڕێیانت بکەرەوە باتۆزێکیش بێت.

د.هروی لەشەرحەکەی خۆیدا (سەرەقامچی) بۆ چیرۆکی یوسف و زولێخا گێڕاوەتەوە، کە لە کاتی پیری زولێخا و دەسەڵات گرتنەدەستی حەزرەتی (یوسف) دا، گوایە رۆژێ کەحەزرەتی یوسف زولێخا دەبینی لە حاڵی دەپرسێ کاتێ کە حەزرەتی یوسف قامچی بەدەستە و بەسواری ئەسپەوەیە، زولێخا پێی دەڵێ قامچییەکە بدە دەستم یا بیخەسەر دڵم تا بزانی حاڵی عەشقم بۆ تۆ چۆنە، لەریوایەتی یەکەمدا کە دەیداتە دەستی قامچییەکە ئاگر ئەگرێ و لەریوایەتی دووەمدا کە ئەیخاتە سەردڵی ترپەی دڵی زولێخا بەدەستی حەزرەتی یوسف دەگات{هروی، ج٢، ل١٠٠٢-١٠٠٤ }

بەهەرحاڵ ئەم چیرۆکە و ئەسپ و بەخت و ئیقباڵ و سەری قامچی و یادکردنەوەی هاوڕێی هاوەڵان لەگەڵ یەکدا رێکدەکەون، بەڵام پێدەچێ ـ رای زۆرینەی راڤەکارەکانی غەزەلەکانی حافظیش وایە و نموونەی مێژوویی شیعریان زۆرە ـ کەهەر مەبەست لە کەمێك و بەسەر پێی یەکەوە دەبێت.

**٧- به وجه مرحمت ای ساکنانِ صدرِ جلال**

**ز رویِ حافظ و این آستانه یاد آرید**

ئەی ئەوانەی لەسەر تەختی گەورەیی فەرمانڕەوایی دانیشتوون — لەڕووی مەرحەمەتەوە یادی رووی حافظ و ئەم بەردەرگایە بکەنەوە.

به وجه مرحمت: لەڕووی مەرحەمەت و بەرزییەوە، بێ زەحمەت.

ساکنان: نیشتەجێبوان.

صدر جلال: لوتکەی گەورەیی و عەزەمەت، تەختی گەورەیی.

خواجە لێرەدا (معاشران) بەوانە دەزانێت کەگەیشتوون بە یار و ئێستا لەئەوج و لوتکەی گەورەییەدان بۆیە داوایان لێدەکات کە رەحمیان هەبێت و یادی حافظ بکەنەوە کە لەبەر دەرگای یاردایە و هێشتا بەژوانی ئەو شادمان نەبووە.



## غەزەلی دوو سەد و سی و هەشتەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەقسور**

**(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان)**

**١- ابر آذاری برآمد باد نوروزی وزید**

**وجه می می خواهم و مطرب که می گوید رسید؟**

هەوری ئازاری دەرهات و بای نەورۆزی هەڵیکرد، پارەی مەی و موتریبم دەوێ کێ دەڵێ درا؟

آزار: مانگی ئازار بەمارت/مارس سەرەتای بەهار. ابر آزاری: هەوری بەهاری.

نوروز: نەورۆز. وجه: پارە، خەرجی.

رسید: درا، لە سەر منە، جاران لە مەجلیسدا کەکسێك باسی پێویستی خۆی دەکرد کەسێکی نەجیب دەیگوت رسید / درا واتە من پارەکەت بۆ ئەدەم.

واتە: ئەوا کات کاتی بەهارە و هەوری بەهار دیارە و بای نەورۆزی هەڵدەکات من لەم بەهارەدا مەی و موتریب (وەسیلەی عەشقم) دەوێ بەڵام خەرجییەکەیم نییە کێ پیاوەتیم لەگەڵ دەکات و دەڵێ لەسەر منە و من پارەکەی ئەدەم.

**٢- شاهدان در جلوه و من شرمسارِ کیسه‌ام**

**بار عشق و مفلسی صعب است و می باید کشید**

جوانان لە جیلەودان من شەرمەزاری گیرفانم (کە خاڵییە) باری عەشق و موفلیسی گرانە و دەبێ راکێشرێ.

شرمسار: شەرمەزار. کیسە: گیرفان.

مفلسی: موفلیسی، بێ پارەیی، گیرفان بەتاڵی.

صعب: گران، سەخت، دژوارە.

میباید کشید: دەبێ راکێشرێ، دەبێ تەحەمول بکرێت.

خواجە خۆیان (عاشقان) بەموفلیس و گیرفان خاڵی ئەداتە قەڵەم، ئێستا لەم حاڵەتەشدا یاران و مەعشوق / جوانان خۆیان نمایش دەکەن، بەڵام لەگەڵ ئەمەدا خواجە شەرمەزاری گیرفان بەتاڵییە چونکە عەشق و عاشقی و نازهەڵگرتنی جوانان بەبێ پارە و بە گیرفانی بەتاڵ دژوار و سەختە بەڵام چ بکرێت بارەو دەبێ راکێشرێ و تەحەمولی بکرێت.

ئەم بەیتە گەر لەروانگەی عیرفانییەوە لێکدرێتەوە موفلیسی و گیرفان بەتاڵی، بێ بەش بوونە لە سیفاتی بەندی عاشقانە/عارفانە.

**٣- قحط جود است آبروىِ خود نمى بايد فروخت**

**باده و گل از بهاىِ خرقه مى بايد خريد**

قاتی پیاوەتییە، نابێ ئابڕووی خۆ بفرۆشیت بەڵکو پێویستە بە پارەی خرقە بادە و گوڵ بکڕێت.

قحط: قات، نەبوون و نەمانی شتێك. جود: پیاوەتی، جوامێری.
نمیباید فروخت: نابێ بفرۆشیت. بها: پارە، نرخ، بەها.
میباید خرید: ئەبێ بکڕیت. فروخت و خرید دژی یەکن.

خواجە لێرەدا — سەرباری ئەوەی رەخنە لە کۆمەڵگە دەگرێ — وەڵامی بەیتەکانی پێشوو دەداتەوە کە لەکاتێکدا یار لە جیلوەدابوو و هەوری بەهاریش هەڵی کردبوو ئەم بێ پارە و موفلیس بوو، بەتەمابوو کەسێك وەسیلەی چوونە نێو عەشقی بۆ ساز بکات، بەڵام لێرەدا دەڵێ: قات و قڕی پیاوەتییە و پیاوەتی نەماوە بۆیە نابێ بەداواکردن ئابڕووی خۆت ببەی، یان نابێ لەبەرامبەردا ئابڕووی خۆت بفرۆشی باشتر وایە خرقەی بەرمان بفرۆشین و بە قیمەتەکەی بادە و یار بکڕین.

**٤- گوييا خواهد گشود از دولتم كارى كه دوش**

**من همى كردم دعا و صبحِ صادق مى دميد**

ئەڵێی (پێدەچێ) کە بەختم گرێی کارێکم بۆ دەکاتەوە، چونکە شەوی رابردوو من دوعام دەکرد و (سوبحی سادیق) هەڵدەهات.

گوییا: ئەڵێی، پێدەچێ، رەنگە. خواهد گشود: دەکاتەوە. دولتم: بەختم.
همی کردم: دەمکرد.

صبح صادق: سوبحی سادیق، سپێدەی راستەقینە، لەکاتی سپێدەدا دوو (صبح — بەرەبەیان) هەیەکە یەکێکیان (کازب) و ئەوی دیکەیان (صادق) ە، کە یەکەمیان رووناکبوونەوەیەکی کەم وکورتی ئاسۆیە و پاشان تاریك دەبێتەوە و دواجار (سپێدە راستەقینە) (صادق)ە کە بەرەبەیانە و کاتێکی زۆر لەبارە بۆ گیرابوونی نزا و پاڕانەوە.

می دمید: هەڵدەهات، فوی پێدادەکرد.

گەر(میدمید) بەواتای هەڵهاتن بێت، دیاریکردنی کاتی دوعاکردنەکەیە، لەم لێکدانەوەیەدا خواجەدەڵێ: رەنگە بەختم گرێ کوێرەی کارەکەم (کاری عەشقم)- رزگاربوون لەموفلیسی ـ بکاتەوە چونکە شەوی رابردوو لەکاتێکدا کەسپێدەی دەدا کە کاتی گیرابوونی دوعایە — وبالاسحار هم یستغفرون- من خەریکی پاڕانەوەو دوعاکردن بووم.



بەڵام گەر (می دمید) بەواتای فوپێداکردن بێت، موبارك کردن و دوایی هێنانی دوعایە، چونکە وەك نەریتێك پاش دوعاکردن فودەکرێت، ئەوەدەڵێ، گرێ کوێرەی کارم دەکرێتەوە چونکە شەوی رابردوو کەمن دوعام دەکرد سپێدەی راستەقینە فوی پێدادەکرد.

**٥- با لبىّ و صد هزاران خنده آمد گل به باغ**

**از كريمى گوييا درگوشه‌اى بويى شنيد**

گوڵ بەلێوێك و سەد هەزاران خەندەوە هاتە نێو باخ، ئەڵێی لەسوچێکدا — لەکەنارێکدا- هەستێکی بە بەخشندەیەك کردووە.

بویی شنید: هەستێکی کردووە.

کە قات و قڕی گوڵ بوو، قات و قڕی پیاوەتی و کەسی بەخشندەبوو، ئێستا کە گوڵ بەسەد هەزار خەندەوە هاتووەتە نێوباخ و باخی رازاندۆتەوە، خواجە ئەمە بە ئەگەری مانی پیاو چاك و بەخشندەیەك ئەزانێ، بۆیە دەڵێ: ئەڵێی گوڵ لەگۆشە و کەنارێکدا هەستی بەبوونی بەخشندەیەك /جوامێرێك کردووە ئاوا بەخەندە و پێکەنینەوە خۆی نمایشکرد.

**٦- دامنى گر چاك شد درعالم رندى چه باك**

**جامه‌اى در نيكنامى مى بايد دريد**

گەر کراسێك لە ژیانی رەندیدا بدڕێنین چ باکمانە، پێویستە کراسێکیش لە پیاوچاکیدا بدڕێنین.

دامن: کراس. چاك شد: دڕا، دڕێنرا.
نیکنامی: پیاوچاکی.
میباید درید: ئەبێ بدڕێنرێ.

لەبری کراس دڕاندن لە ژیانێکدا، لەکوردیدا کراس کۆنکردن دێت، بۆ نموونە دەڵێن فلان کەس کراسێکی کۆن نەکرد بەواتای کەم ژیا، جیهانی رەندی کە جیهانێکە ناوبانگی حەقیقی — لای حەق- دەبەخشێتە مرۆڤ، خواجە دەڵێ گەر کراسێکمان لە ژیانی رەندیدا کۆنکردووە و بەرەندی ژیاوین چ باکمانە، چونکە پێویستە کراسێکیش لە، (پیاوچاکی و ناوبانگ) دا بدڕێنرێت و بکرێتە قوربانی / یان کۆنکرێت.

گەر (نیکنامی) پیاوچاکی بەواتای حەقیقی وەرگرین، ئەوا خواجە بە چاکی لە رەندی دواوە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە هەمیشە خواجە (رەندی) بە هۆی ئابڕوچوون دەزانێ (کەلەچاوی خەڵکی عەوامەوە سەیری دەکات) بۆیە لێرەشدا میسراعی دووەمی بەواتای پێچەوانە لێکدەدرێتەوە.

واتە: ئێمە گەر لەژیانی رەندیدا کراسێکمان کۆنکردووە چ باکە، پیاو دەبێ تۆزێکیش لە قەلبیدا (رەندی کە لە چاوی عەوام و سۆفیلکەکانەوە بەدناوییە) لەبەدناویدا (واتای پێچەوانەی پیاوچاکی) ژیان بەسەر ببات و کراسێ کۆنبکات.

لەڕاستیدا راڤەکەرە فارسەکان خۆیان لەلێکدانەوەی ئەم بەیتە بواردووە، ئەوەش لەبەر نەزانینی یان ئالۆزی و سوانی واتای کراس دڕاندنە، چونکە لەفارسی ئەمڕۆدا کراس دڕاندن بۆ خۆشی یا تازیە باری و کۆستێکە، و بەواتای کراس کۆنکردن نایەت.

بەبڕوای بەندە کراس دڕاندن = کراس کۆنکردنە کەئێستاش لەشێوەزاری جافدا بەکاردەهێنرێت لەبەر ئەوەی سودی نزیکەی (٤٥٠) ساڵێك بەر لەئێستا ژیاوە بەئاسانی و بێ روونکردنەوە بەم جۆرە لێکی داوەتەوە. {شرح سودی ج٢، ل٧-١٣٦٨} .

**٧- این لطایف کز لبِ لعلِ تو من گفتم که گفت**

**وان تطاول کز سر زلف تو من دیدم که دید**

ئەم گوتە مانادار و ناسکانەی کەمن لەبارەی لێوی یاقوتینی تۆوە گوتوومە، کێ گوتوویەتی ئەو ستەمەی کەمن لەدەست سەری زولفی تۆ دیومە کێ دیویەتی.

لطایف: گوتەی ناسك و مانادار.     تطاول: ستەم.

واتە: من گوتەیەکی مانادار و شیعرێکم لە بارەی لێوی یاقوتینی تۆوە نووسیوە کە کەس نەیتوانیوە بینووسێ هێندە ناسکە، کە ستەمێکیشم لەدەست پرچی تۆوە دیوە کە کەس نەیدیوە.

**٨- عدلِ سلطان گر نپرسد حالِ مظلومانِ عشق**

**گوشه‌گیران را زِ آسایش طمع باید برید**

گەر دادپەروەری سوڵتان لەحاڵی مەزلۆمانی عەشق نەپرسێتەوە، دەبێ گۆشەگیران لە ئاسایش و ئارامی بێ ئومێد بن.

سلطان: پاشا، سوڵتان، فەرمانڕەوا.     نپرسد: نەپرسێتەوە.

طمع بریدن: بێ ئومێدبوون، بێ هیوابوون.

گەر سوڵتانی ئەزەل بەهانای زوڵم لێکراوانی عەشقەوە نەیەت و دەستگرۆییان نەکات ئەوا پێویستە گۆشەگیران — کەهەمان عاشقانی مەزلۆمن — لەخۆشی و ئارامی بێ ئومێد بن.

**٩- تیرِ عاشق کش ندانم بر دل حافظ که زد**

**این قدر دانم که از شعرتَرَشْ خون می چکید**

نازانم کێ تیری عاشق کوژی دالەحافز، بەڵام ئەوەندە دەزانم کە لەشیعری تەڕی خوێن دەتکا.



عاشق کش: عاشق کوژ.     زد: لێیدا.     این قدر: ئەوەندە.     دانم: دەزانم.

شیعری تەڕ شیعری ناسکە، خواجە بۆ خۆی دەڵێ، نازانم کێ تیری عاشق کوژی لێدام بەڵام هێندە هەیەکە کوژراوم و خوێن لەشیعرە تەڕەکانم دەتکێ.

واتە: عەشقەکە شیعرەکانی ناسك کردووم بەڵام مەعشوق لەپشتی پەردەوەیە و نازانم کێیە.

# غەزەلی دوو سەد و سی و نۆیەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی مەقسور**
**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلان)**

**١- بیاکه رایتِ منصور پادشاه رسید**
**نوید فتح و بشارت به مهر و ماه رسید**

وەرەکە ئالاّی سەرەکەوتنی پاشا گەیشت مژدەی سەرکەوتن و رزگاری بە خۆر و مانگ گەیشت.
رایت: ئالاّ.
منصور: سەرکەوتن، یاخود مەبەست لە مەنسور پادشای مظفرییە کەلە (٧٩٠- ٧٩٥) دا دەسەلاّت دار بووە.
رسید: گەیشت. نوید: موژدە. فتح: ئازادکردن، رزگارکردن. مهر: خۆر.
خواجە خەلّکان ئاگادار دەکاتەوە کە پاشامان سەرکەوت و ئالاّی سەرکەوتن لەپێش سوپاوە دەڕوات گەیشتە جێ و موژدەی ئەم رزگارکردن و سەرکەوتنەش بەهەموو لادا بلاّوبووەوە و گەیشتە خۆر و مانگ.

**٢- جمال بخت ز رویِ ظفر نقاب انداخت**
**کمالِ عدل به فریادِ دادخواه رسید**

جوانیی بەخت پەردەلە رووی سەرکەوتن لادا، کەمالی دادپەروەریش بەهانای داواکاری (شکات کەری) مەزلۆمەوە هات.
ظفر: سەرکەوتن. نقاب انداخت: پەردەی لادا.
بەفریاد رسید: بەهانای هات، بەفریای کەوت.
دادخواه: شکات کەر، کەسێ داوای هاتنەدی دادپەروەری بکات.
لە سەرکەوتنی پاشادا بەختی چاك و جوان بوو پەردەی لەسەر رووی سەرکەوتن لادا و کەمالّ و ترۆپکی عەدل و دادپەروەری پاشاش بەهانای لێقەوماوان و دادویستانەوە هات.

**٣- سپهر دورِ خوش اکنون زند که ماه آمد**
**جهان به کام دل اکنون رسد که شاه رسید**

ئێستا کە مانگ هاتووە گەردوون دەور و گەڕانی جوان و پەسەند دەکات و ئێستاکە شا گەیشتووە، جیهان بەئاواتی دلّی خۆی دەگات.



سپهر: گەردوون، ئاسمان. دور زند: دەسوڕێتەوە، دەگەڕێت.
بەکام دل رسد: بەئاواتی دلّی دەگات.
سپهر رۆژگار و (ماه)یش پادشایە، خواجە لە ستایشی شادا دەلّێ: ئێستاکە پاشا — مانگی گەردوون — هاتووە و گەیشتووە هەم گەردوون جوان و پەسەند بووە و هەم خەلّکی جیهانیش بەئاوات و ئارەزووی خۆیان دەگەن.

**٤- ز قاطعانِ طریق این زمان شوند ایمن**
**قوافلِ دل و دانش که مردِ راه رسید**

ئێستا کە پیاوی رێگا (بەلّەد و دلێر) گەیشتووە ئیدی قافلّەکانی دلّ وزانست لە رێگر و جەردەکانی رێگە بێ خەم دەبن.
قاطعان طریق: رێگران، جەردە و دزان. شوند ایمن: پارێزراو دەبن، بێ خەم دەبن.
قوافل: قافلەکان. مرد راه: پیاوی رێگا، پیاوی دلێر و بەتوانانی رێگەزان.
قافلّەکانی دل و زانست، قافلّەی رۆحانی و عیرفانییەکان و زانا و عالمەکانن، کەلەگەلّ هاتنی پاشای نوێدا گیانیان پارێزراو دەبێت.

**٥- عزیزِ مصر به رغم برادرانِ غیور**
**ز قعرِ چاه برآمد و به اوج ماه رسید**

عەزیزی میسر بەکوێرایی چاوی برا حەسوودەکانی لەبنی (قوولاّییی) بیر هاتەدەرەوە بەلوتکەی مانگ گەیشت.
عزیز مصر: عەزیزی میسر، سەرۆك و فەرمانڕەوای میسر، مەبەست لە حەزرەتی یوسفە ـ د.خ ـ.
بەرغم: بەکوێرایی چاوی. برادر: برا. غیور: حەسوود.
قعر: بن، قوولّترین شوێنی چالّ. چاه: بیر. اوج: لوتکە.
ئەم بەیتە بە بوونی عەزیزی میسر کە حەزرەتی یوسف و برا حەسوودەکان و بنی بیر و لوتکەی مانگ و دەسەلاّتداری ئاماژەیە بەچیرۆکی حەزرەتی یوسف و برا حەسوودەکانی و فڕێدانە نێو بیری و پاشان فرۆشتنی بەکاروانێك و گەیشتنە میسری و دواجار بوونە دەسەلاّتدار.
چیرۆکە کە لەسورەتی (یوسف) دا بە دوورودرێژی باسکراوە.
واتە: هەرچەندە زڕبرا حەسوودەکانی یوسف ئەویان خستە نێو بیر، بەلاّم بەکوێرایی چاویان لەبنی بیر دەرهات و بەلوتکەی حوکم و فەرمانڕەوایی گەیشت.

لێرەدا مەبەست لە عەزیزی میسر -بەپێی بەیتی یەکەم — مەنسور پاشایە کە یەحیاپاشا رکابەری و دژایەتی دەکرد و ماوەیەك دوورخرابووەوە { هروی، ج٢، ل ١٠١١}.

**٦- کجاست صوفیِ دجّال کیش ملحد شکل**

**بگو بسوز که مهدی دین پناه رسید**

سۆفی دەجال ئایین و مولحید شێوە لە کوێیە، پێی بڵێ بسووتێ، چونکە محەمەدی مەهدی هات، کە دین لە پەنای ئەودایە.

کجاست: لە کوێیە، کوانێ.

دجال: کەسێکی کافرە لەپێش سەرهەڵدانی محەمەدی مەهدییە و دێت و خەڵك گومڕا دەکات، هەرکەس شوێنی کەوێت کافر دەبێت، لەفەرمودە و ریوایەتدا هاتووەکە یەك چاوی هەیە و لەنێو چاوی نووسراوە کافر.

دەجال توانایەکی لەڕادەبەدەری هەیە و توانای مردن و زیندووکردنەوە و کاری لەڕادەبەدەر — فوق العادە- ی هەیە، هاتنی دەجال یەکێکە لەنیشانە گەورەکانی دونیا ئاخر، پاش ئەمیش حەزرەتی موحەمەدی مەهدی دێت کەلە زۆر ریوایەتدا هاتووە کە لە نەوەی پێغەمبەرە ـ د.خ- و لەڕۆژهەڵاتی وڵاتانی ئیسلامییەوە سەرهەڵدەدات و ئایین لەدەست دەجال رزگار دەکات.

**٧- صبا بگو که چەها برسرم درین غم عشق**

**زآتشِ دلِ سوزان و دودِ آه رسید**

سروە بڵێ کە لەم غەمی عەشقەدا لە ئاگری دڵی سووتناك و دووکەڵی ئاهەوە چیم بەسەرهاتووە.

سوزان: سووتاو، سووتناك.

واتە: ئەی سروەی بەیان کەتۆ ئاگاداری ژیانی من بوویت ئێستا خەبەر بە پادشای دادپەروەر بدە و پێی بڵێ کە لەنەبوونی ئەودا و لەغەمی دووری ئەودا و لەتاو ئاگری دڵ و دووکەڵی ئاه و حەسرەت و ناڵەم چیم بەسەر هاتووە.

**٨- زشوقِ رویِ تو شاها بدین اسیرِ فراق**

**همان رسید کز آتش به روی کاه رسید**

ئەی شاهم لەتاسەی رووی تۆ ئەوە بەسەرئەم دیلی دابڕانەدا هاتووەکە لەئاگرەوە بەسەر رووی کادا هاتووە.

شاها: ئەی پادشا. اسیر فراق: دیلی دابڕان.

کاه: کا.



واتە: وەك چۆن ئاگر کا دەسووتێنێ، منیش لەدووری تۆدا و لەتاسە و حەزی دیداری رووی تۆدا ئەوا سوتاوم وەك کای نێو ئاگرم لێهاتووە.

**٩- مرو خواب که حافظ به بارگاهِ قبول**

**ز وردِ نیم شب و درسِ صبحگاه رسید**

مەخەوە، چونکە حافظ بەویردی نیوەشەو دەرسی بەرەبەیانان بەمەقامی قەبووڵبوونی دوعا و نزا گەیشت.

مرو به خواب: مەخەوە، خەوت لێ نەکەوێ.

واتە: تۆ گەر دەتەوێ بەپلە و پایەیەك بگەیت خوا نزا و پاڕانەوەت لێ قەبووڵبکات، شەوان مەخەوە (کەم بخەوە) سەحەران بێدار بە چونکە حافز بە ویردی نێوەشەوان و دەرس ومەدرەسەی بەیانییان بەم مەقامە گەیشتووە.

وەك د.هروی نووسیویەتی بەپێی مێژووی دەسەڵات گرتنەدەستی مەنسور پاشا (٧٩٠-٧٩٥) مێژووی نووسینی ئەم شیعرە بۆ (٧٩٠) ی کۆچی مانگی دەگەڕێتەوە کە کۆتاییەکانی تەمەنی خواجەیە.

هەرچۆن بێت، ئەم رووداوە مێژووییە و دەسەڵات گرتنە دەستی مەنسور پاشا و دژایەتی براکەی شا یەحیا مان بە (درکە) کانی وەك (عزیز مصر، برادران غیور، صوفی دجال...، مهدی دین پناه...) دەدات، گەر ئەم رووداوە نەکەینە باکگراوندی غەزەلەکە ئەو درکانە مەبەستی دیکە دەگەینن، بەندە لێرەدا لەبەرئەوەی غەزەلەکە ئاماژەی ئاشکرا و راستەوخۆی بۆ رووداوە مێژووییەکە تێدایە درکەکانم بەهیچ واتایەکەی دیکە لێکنەدایەوە چونکە پێموایە ئەم کارە تا رادەیەکەی زۆر تەئویلکردنێکی بێ مانای دەستنیشکراوێکی تەئویل هەڵنەگرە، چونکە تەئویل بۆ دەقە موجەرەکان سوودبەخشە.

## غەزەلی دوو سەد و چلەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفونی مەقسور**
**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلان)**

**١- بوی خوش هرکه ز باد صبا شنید**
**از یار آشنا نفس آشنا شنید**

هەرکەس بۆنی خۆشی تۆی لەسروە بۆنکرد، لەیاری ئاشناوە هەناسەی ئاشنای بیست

شنید: بیستن. بو شنید: بۆنکردن لەزمانی فارسیدا (بیستن) بۆ بۆنیش بەکاردەهێنرێت بەڵام لەزمانی کوردیدا (کردن) بەکاردەهێنرێت.

آشنا: ئاشنا، هۆگر، ناسراو. نفس: هەناسە، قسە.

خواجە سروە (سەبا) بەئاشنا و ناسراوی رازەکانی مەعشوق دەزانێ و خودی مەعشوقیش هەر بە ئاشنا دەزانێت، بێگومان لێرەدا بەپێچەوانەی زۆرێك لە غەزەلەکانی دیکەوە دەدوێت کە سەبا بەخەبەرچن و دووزمان و قسە بڵاوکەرەوە دەزانێ.

ئەو لێرەدا دەڵێ: هەر کەسێك — خۆشبەختێك _ کەبۆنی خۆشی یاری لەبای سەباوە هەست پێکرد، واتە سەبا بۆنی خۆشی یاری بۆ برد، ئەو لەیارێکی ئاشناوە — سەبا- بۆنی هەناسەی ئاشنایەکی- مەعشوق-ی کردووە.

لەهەندێ نوسخەدا لەبری (نفس) (سخن - قسە) هاتووە واتە: لەیاری ئاشناوە خەبەر و قسەی یاری ئاشنای گوێلێبووە.

**٢- اینش سزا نبود دل حق گزار من**
**کز غمگسار خود سخن ناسزا شنید**

ئەمەی شایان نەبوو دڵی وەفاداری من، کەلەیاری خەمرەوێنی خۆیەوە قسەی نەشیاوی بیست.

اینش: ئەمەی.
سزا: شایان، لایق، شیاو.
حق گزار: بەوەفا، حەق بەجێ هێنەر، موتیع و گوێڕایەڵ.
غمگسار: خەمرەوێن، کەسێ کە هاودەمی ئەو خەم دەرەوێنێتەوە.
ناسزا: نەشیاو، نالایق، ناموستەحەق.



دیارە یار قسەی بە حافظ/شاعیر گوتووە بۆیە خواجە لێرەدا بەگلەیی دەردی دڵی خۆی دەردەبڕێت، دەڵێ دڵی گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری من شایانی ئەوە نەبوو کەیاری خەمرەوێن کەدەبوایە غەمی دڵم لابەرێت — لەبری لاواندنەوە قسەی نەشیاو و نالایقی پێ بڵێت.

**٣- یارب کجاست محرم رازی که یك زمان**
**دل شرح آن دهد که چه دید و چەها شنید**

پەروەردگارا کوا مەحرەمی رازێك کە زەمانێ دل ئەوی بۆ باس کات کە چی بینی و چی بیست.

یك زمان: زەمانێ، کاتێکی کورت. شرح دهد: باسی بکات.

گەرچی خواجە زۆر نارەحەتە لەو قسەیەی کەیاری خەمرەوێن پێی گوتووە بەڵام لەسەرتەریقەتی عاشقان نایەوێ لای هەموو کەسێك باسی بکات، بۆیە لێرەدا دەڵێ، یارەب مەحرەمی رازێك لەکوێیە کە کاتێکی کورت باسی ئەو رازانەی لابکەم کە لەدونیای عەشقدا دیومە و پێی بڵێی کەچی بینی و چی بیست.

**٤- ای شاهِ حسن چشم بەحال گدا فکن**
**کاین گوش بس حکایتِ شاه و گدا شنید**

ئەی پاشای جوانی چاوت لەحاڵی گەدابێت، چونکە ئەم گوێچکەیە زۆری حیکایەتی شا و گەدا بیست.

چشم فکن: چاوت لێ بێت، سەیری کە، ئاوڕی لێ بدەرەوە.

ئەی یار کەتۆ پاشای وڵاتی جوانیت ئاوڕێ لەم گەدایەی عەشق بدەرەوە: چونکە ئەم گوێچکەیەی من زۆر باسی پادشا و گەدای بیستووە.

سەبارەت بە باسی پادشا و گەدا چەند لێکدانەوەیەك هەیە لەوانە:

١- پادشا هەمیشە لەگەڵ گەدایاندا میهرەبان بووە و ئاوڕی لێداونەتەوە تۆش وەك پادشایانی میهرەبان ئاوڕێ لەم گەدای عەشقە بدەرەوە، لێرەدا زیاتر هاندانی شای جوانی — مەعشوق-ە کە ئەم لێکدانەوە لەڕوانگەی عیرفانی / حەقیقییەوە نزیکە و هەمیشە مەعشوق میهرەبانە.

٢- ئەکرێ ئەم باسی پادشا و گەدایە بیرخستنەوەکی ترساندن ئامێز بێت بۆ پادشایان، واتە گوێچکەی ئێمە پڕە لەباسی مردنی پادشا و گەدا و تۆش دەمریت یاخود گوێچکەمان پڕە لە باسی پادشا و بوونەگەدا و گەدابونە پادشا و ئەکرێ تۆش لەپاشایەتی بکەویت و ببیتە گەدا.

ئەم لێکدانەوی دووەم ماددییانەیە و لەگەڵ نەسەقی گشتی غەزەلەکەدا ناگونجێ و لێکدانەوەی یەکەمیان شیاوترە.

**٥- خوش می کنم به بادەی مشکین مشام جان**

**کز دلق پوش صومعه بوی ریا شنید**

نە هەستی بۆنکردنی گیانم لەخرقە پۆشی خانەقاوە بۆنی ریای کرد بە بادەی میسکبار خۆشی دەکەمەوە.

خوش میکنم: خۆشی دەکەمەوە، چاکی دەکەمەوە.

مشام جان: هەستی بۆنکردنی گیان.

دلق پوش: خرقە پۆش (مەبەست لە سۆفیلکەی رەسمییە).

کاتێ کە گیانم بۆنی ریای سۆفیلکەی خرقەپۆشی خانەقای هەڵمژی و پەرێشان بوو، تێکچوو بەبۆنی شەرابی میسکاوی، کە بۆ بۆنخۆشی تێی دەکرێت — چاکی دەکەمەوە.

واتە: نارەحەتی و رەنجی گیانم کە لە ریای سۆفییەکانی خانەقاوە دوچاری دەبێت بەعەشقی حەق دەرەوێنمەوە.

**٥- ما باده زیرِ خرقه نه امروز می کشیم**

**صد بار پیرِ میکده این ماجرا شنید**

ئێمە هەر ئەمرۆ نییە کە شەراب دەخەینە ژێر خرقەوە پیری مەیخانە سەد جار ئەم بەسەرهاتەی بیستووە.

می کشیم: دەیخەینە. ماجرا: قسە و باس، بەسەرهات.

شەراب لەژێر خیرقەدا شاردنەوە، بریتییە لە شاردنەوەی عەشقی حەق و تەریقەتی رەندی لەژێر بەرگی سۆفییانەی رەسمیدا، واتە خۆ ئێمەی عاشقان کە خۆمان بەسۆفی ئەدەینە قەڵەم هەر ئەمرۆ نییە پیری تەریقەتی حەق سەد جار ئەم بەسەرهاتەی بیستووە و دەزانێ کە ئێمە سۆفی نین و عاشقین بەڵام دەیشارینەوە.

**٦- ما میْ به بانگِ چنگ نه امروز می خوریم**

**بس دَوْرشد که گنبدِ چرخ این صدا شنید**

ئێمە هەر ئەمرۆ نییە کەبەدەنگی چەنگەوە مەی دەخۆینەوە، رۆژگاری زۆر تێپەڕی و گومبەتی ئاسمان ئەم دەنگەی بیست.

بانگ: دەنگ، ئاواز. دور شد: رۆژگار تێپەڕی. گنبد: گومبەتە.

گنبد چرخ: گومبەتی ئاسمان، گومبەتەی گەردوون.



لەرواڵەتدا واتای ئەم بەیتە لەگەڵ بەیتی پێشوودا پێچەوانەیە، چونکە لەبەیتی پێشوودا هەر ئەمرۆ نییە کە شەراب دەشارنەوە و لەم بەیتەدا هەر ئەمرۆ نییە کەشەراب بەئاوازی چەنگ و سازەوە دەنۆشن و چەرخی گەردوونی زۆریش تێپەڕیوە و ئەم باسەی گوێ لێبووە.

بەڵام لەحەقیقەتدا ئەم پێچەوانەیی و دژایەتییە دەڕەوێتەوە گەر ئەم بەیتە پەیوەست بێ بە مەی حەقیقی ئەلەستی ئیلاهییەوە.

**٧- سرّ خداکه عارفِ سالك به کس نگفت**

**در حیرتم که باده فروش از کجا شنید**

رێبواری عارف سڕی خودای بەکەس نەگوتووە پێم سەیرە کە بادەفرۆش لەکێی بیستووە.

سالك: رێبوار. درحیرتم: سەرم سوڕماوە، پێم سەیرە، متحیرم.

خواجە لێرەدا دەڵێ دوو کەس نهێنی و رازی ئیلاهی دەزانن کەیەکەمیان عارفانی سالکی تەریقەت و دووەمیان بادەفرۆشان / عاشقانی حەقیقەت، بەڵام پێم سەیرە لەکاتێکدا عارف بەکەسی نەگوتووە بادەفرۆش لەکێی بیستووە.

میسراعی یەکەمی ئەم بەیتە لەسەر بنەمای ئەم گوتەی شێخ جونەیدی بەغدادی (من عرف ربه کل لسانه) نووسراوە، هەر بۆیە خواجە دڵنیایە کەعارف سڕی خودایی بەکەس نالێت.

**٨- ساقی بیاکه عشق ندا می کند بلند**

**کان کس کەگفت قصەی ما هم ز ما شنید**

ساقی وەرە (شەراب بێنە) چونکە عەشق بەدەنگی بەرز بانگ دەکات (هاوار دەکات)، ئەوکەسەی چیرۆکی ئێمەی گێڕایەوە لەخۆمانی بیست.

ندا میکند: بانگ دەکات، هاوار دەکات. بلند: بەدەنگی بەرز.

عەشق خۆی بەدەنگی بەرز هاوار دەکات کە هەرکەس بەسەرهات و مەسەلەی ئێمەی — عەشقی — گێڕایەوە و لەئێمە خۆمانەوە بیستوویەتی، نەوەك بەهەوڵ وکۆششی زانستی و بەڵگە پەی پێ بردبێت، مادام عەشق ئەم حەقیقەتە دەڵێ ساقی وەرە و شەرابی عەشقی حەقم بدەرێ تا عاشق و مەست بم و عەشق چیرۆکی خۆیم پێ بڵێت.

ئەم بەیتە دەقاودەقی واتای گوتەی عارفانەی (عرفت ربي بربي) یە.

**٩- محروم اگر شدم ز سرِکویِ او چه شد**

**از گلشنِ زمانه که بوی وفا شنید**

گەر لەسەر کووچە (قرب) ی ئەو مەحروم بووم، چی بوو! لەباخی رۆژگار بۆنی وەفای کرد

چەشد: چ بوو، چی روویدا، گرنگ نییە، جێگەی سەرسوڕمان نییە. گلشن: باخ.

(محروم شدم) بەواتای مەحروم بووم/ بێ بەش بووم لەپلەی قورس و نزیکی یار و نەمتوانی لەبەردەرگای قوربی جانادا هەڵکورمێم.

(سودی) لەشەرحەکەی خۆیدا (شدم) بە (ڕۆیشتم) لێکدەداتەوە کە ئەگەر بەمردن و کۆتایی هاتنی ژیان لێکیدەینەوە واتایەکی زۆر تەواوتر لە بەبێ بەشبوون دەگەیەنێت.

واتە: من گەر بە بەشی لەکووچەی یاردا ڕۆیشتم و تەمەنم دوایی، هیچ جێگەی سەرسوڕمان نییە، چونکە ئێستا لەدونیا داین و کێ لەدونیادا بۆنی وەفاداریی کردووە تا ئێمە بیکەین، کەوایە ئەوباخی زەمانەیە کە درەخت و گوڵی وەفای تێدا نییە و کەئێمەش لەکوچەی قوربی یاردا بەمەحرومی دەڕۆین/ دەمرین.

یامەحروم دەبین لەژوان شتێکی ئاساییە و جێگەی سەرسوڕمان نابێت.

**١٠- پندِ حکیم عین صواب است و محض خیر**

**فرخنده بخت آن کە بە سمع رضا شنید**

پەندی حەکیم دروستن و خێرو چاکی تەواون، ئەو کەسەی کە گوێی لێبگرێت و بەگوێ بکات، خۆشبەختە (خۆش شانسە).

عین: زات، خود. صواب: ڕاست، دروست. محض: خالس، تەواو، بێ غەش، لەبەرخاتری. فرخندە: خۆش، شاد، چاکە. بە سمع رضا شنید: بەگوێی کرد، گوێی لێ گرت و قەبووڵیکرد.

خواجە پێی وایە پەندی حەکیم ڕاست و دروستن و خێری تەواون یابۆ خێر و خۆشین، بۆیە هەرکەسێ بەگوێیان بکات بەختی چاکی هەیە و خۆش شانسە.

**١١- حافظ وظیفەی تو دعا گفتن است و بس**

**در بند آن مباش کە نشنید یا شنید**

حافظ ئەرکی تۆ دوعاکردنە و بەس گوێ مەدە بەوەی کە کێ نەیبیست و کێ بیستی.

وظیفە: ئەرك. دعا گفتن: دوعاکردن. بس: بەس، تەنیا.

دربند آن مباش: گوێ مەدەبەوەی، بەدوای ئەوەوە مەبە، لێی مەپێچەرەوە.

خواجە هوشیاری بەخۆی دەدات کە لەکاتی دوعاکردندا بیر لەوە نەکاتەوە کە کێ گوێی لێ دەبێ و کێ گوێی لێ نابێت بەڵکو تەنیا بیری لای دوعاکردنەکەی بێت و بەس.



# غەزەلی دوو سەد و چل و یەکەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی مەقسور**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلان)**

**١- معاشران گره از زلف یاد بازکنید**

**شبی خوش است بدین قصّەاش دراز کنید**

هاودەمانی یار گرێی پرچی یار بکەنەوە، شەوێکی خۆشە و بەم کارە درێژی کەنەوە.

گرە: گرێ. بازکنید: بکەنەوە. شبی خوش است: شەوێکی خۆشە(مەبەست لەپرچی ڕەشی یارە). قصە: کار، بابەت، شێوە، چیرۆك. درازکنید: درێژی بکەنەوە.

بە ڕەچاوکردنی تەواوی ئەو جیاوازییانەی لەنێوان ساغکەرەوە و ڕەخنەگرە گەورەکانی ئێراندا هەیە سەبارەت بەم بەیتە و شەرحکردنی، دەتوانین دڵنیابین کەئەم شێوە ساغکردنەوەی سەرەوە ڕاستترین شێوەی بەیتەکەیە - چ لەڕووی واتاییەوە یا زمانییەوە.

لێرەدا و لەم لێکدانەوەیەدا میسراعی دووەم شەرحی میسراعی یەکەمە، لەمیسراعی یەکەمدا خواجە داوا لەو هاوپێکانەی جاران دەکات- کە ئێستا بەیار گەیشتوون و لە مەقامی قورب و خەڵوەتی ئەودان — کەگرێی زوڵف/ پرچی یار بکەنەوە بێگومان پرچ کەبەسترابێت کورتتر دیارە و کاتێ دەکرێتەوە درێژ دەبێت، بۆیە خواجە دەڵێ پرچی ڕەشی یار شەوێکی خۆشە (ڕەشە) بەم کاری گرێ کردنەوەیە درێژی بکەنەوە.

لەڕووی عیرفانییەوە پرچی لوول و گرێدراو- نهێنی ڕازەکان-ە و کردنەوەشی — ئاشکراکردن و زانینی نهێنییە خوداییەکان-ە.

بۆیە خواجە بە کامڵان دەڵێ نهێنییە ئیلاهییەکانمان پێ بڵێن، زانینی ئەم نهێنییانە زۆر خۆشە و زیاترمان پێ بڵێن.

واتاکانی دیکەی بەیتەکە بەم شێوەیە:

(شب) بەواتای شەو بەکارهێنراوە، واتە: ئەی هاودەمانی بەیار گەیشتوو گرێی پرچی یار بکەنەوە و تا بەرەبەیان بەم کارەش شەو درێژبکەنەوە یا بەم کار ڕۆژ بکەنەوە، هەروەك چۆن عارفان بە ڕکعێ سجودێ، وشەیەك ڕۆژیان دەکردەوە یاخود ئەکرێ درێژکردنەوەی شەو، درێژکردنەوەی شەو بێت بە موعجیزە و کەرامات، وەك نموونەی (شێخ شرف الدین ابو علی قلندر) کە جەنابی لاهوری لەشەرحەکەیدا نووسیویەتی: ((شەوێك لەگەڵ مەعشوقی حەقدا لەژواندا بوو، شەوەکەی درێژکردەوە و نەیدەهێشت ڕۆژ هەڵبێت، تائەو کاتەی کە نەوەران و

خەڵکی لەدرێژی شەوەکە نارەحەت بوون و بەهاوارەوە چوونە بەردەرگای شێخ و بینییان کە شێخ لەگەڵ مەعشوق لەژواندایە و بەردەوام ئەم بەیتە دەڵێتەوە:

**گر شبی دست دهد وصل تو از غایت شرق**

**تا قیامت نشود صبح دمیدن ندهم**

پاشان بەتکای خەڵکی مۆڵەتی رۆژی دا و رۆژهەڵات. {لاهوری، ج ٣، ل١٥٤٦}.

**٢- حضور خلوت انس است و دوستان جمعند**

**وان یکاد بخوانید و در فراز کنید**

ئاوا رەگی خەڵوەتی هاودەمییە و (لەخەڵوەتی هاودەمی دا) یاران کۆن (وا ن یکاد) و بخوێنن و دەرگا داخەن.

انس: هاودەمی. در: دەرگا. فراز کنید: داخەن.

(وان یکاد) ئاماژەیە بە ئایەتی ((وإن یکاد الذین کفروا لیزلقونك بأبصارهم لما سمعوا الذکر ویقولون انه لمجنون)) ئایەتی (٥١) ی سورەتی (القلم)، خوێندنی ئەم ئایەتە بۆ بەرگرتن و بەتاڵکردنەوی کاریگەری چاوپیسییە.

لێرەشدا خواجە هەربەو مەبەستە بەکاری هێناوە، ئەوەدەڵێ خەڵوەتی هاودەمییە لەگەڵ مەعشوقدا و عاشقان و یارانی تەریقەت جەمعن و هەموویان کۆبوونەتەوە، بۆ ئەوی لەچاو نەچن و (وان کاید) بخوێنن و دەرگاش داخەن با نامەحرەمان نەیەنە ژوورەوە.

فراز کنید/ یا: فرازکردن، وشەیەکە کەواتای دژیەکی هەیە و بەواتای کردنەوە و داخستنیش دێت هەرچەندە تەواوی رەخنەگر و راڤەکارانی دیوانی خواجە تەنیا مانای یەکەمیان (داخستن) وەرگرتووە بەڵام ئەکرێ واتای دووەمیش (کردنەوە) راست بێت واتە:

خەڵوەتی هاودەمییە و یاران / عاشقان هەموو کۆبوونەتەوە و هەموو شتێ بۆ جیلوەی یاری حەق ئامادەیە (وان یکاد) بخوێنن و دەرگابکەنەوە تا یار جیلوەبکات.

**٣- رباب و چنگ به بانگ بلند می گویند**

**که گوش هوش به پیغام اهل راز کنید**

روباب و چەنگ بەدەنگی بەرز دەڵێن: بەدڵ گوێ لەپەیامی ئەهلی راز بگرن.

روباب و چەنگ جۆرێ سازن، کە لە مەجلیس و مەحفەلی ئەهلی راز (ئەهلی تەریقەت) دا لێدەدرێت و ئەوان دەخەنە (سماع)ەوە، خواجە پێیوایە ئەو دەنگەی کە لە روباب و چەنگەوە هەڵدەستێ پەیامێکە بە دەنگی بەرز پێمان دەڵێت: زۆر بەچاکی و وشیارییەوە گوێ لەپەیام و قسەکانی ئەهلی دڵ/ راز بگرن.



لاهوری پێی وایە ئەم بەیتە پەیوەستە بەبەیتی پێشووەوە و خواجە جەخت لەسەر بەیتی پێشوو دەکاتەوە (خوێندنی — وان یکاد — و دەرگا داخستنی) واتە: قسە و پەیامی ئەهلی راز — خوێندنی ئایەتی چاوپیسی و دەرگا داخستنە بەڕووی نائەهلاندا.

**٤- به جان دوست که غم پرده بر شما ندرد**

**گر اعتماد بر الطاف کارساز کنید**

بەگیانی دۆست گەر پشت بە لوتفی کەریمی کارساز ببەستن غەم پەردەتان لەسەر هەڵناداتەوە.

بەجان دوست: قەسەم بە گیانی دۆست.

پرده بەشما ندرد: پەردەتان لەسەر هەڵناداتەوە، ئەم ئیدیەمە بەواتای (ریسواکردن) یا (زاڵبوون بەسەردا) دێت.

اعتماد: پشت بەستن. الطاف: کۆی لوتفە. کارساز: کارساز و کار رێکوپێك یەکێکە لەسیفاتەکانی حەق هەروەك لە کوردیشدا دەگوترێت: کەریمی کارساز.

بەیتەکە لەپشت بەستن بەخوا — توکل- ئەدوێت بێگومان هەر کەس پشت بەخوا ببەستێ خوا یارمەتیی دەدات وەك لەسورەتی (الطلاق) ئایەتی (٣) دا هاتووە ((ومن یتوکل علی الله حسبه)) (توکل) ی عارفان خۆدانە دەست خودا و سفرکردنەوەی ویستی خۆیە — لێرەدا بەدرێژی لە توکل نادوێین.

بەهەر حاڵ خواجە (توکل) بەرزگاری لە خەم و خەفەت و زاڵبوونیان دەزانێت بۆیە بە دڵنیاییەوە بەگیانی دۆست سوێند دەخوات هەر کەس تەوەکەلی بە حەزرەتی حق (کەریمی کارساز) هەبێ خەم بەسەریدا زاڵ نابێت، یاخود (وەك د.هروی دەڵێ) غەمی عەشق ریسوای ناکات.

لەم لێکدانەوەی (د.هروی) دا، واتایەکی تەوای عیرفانی بە —توکل- دراوە.

**٥- میان عاشق و معشوق فرق بسیار است**

**چو یار ناز نماید شما نیاز کنید**

جیاوازی زۆر لەنێوان عاشق و مەعشوقدا هەیە، کاتێ کەیار ناز دەکات ئێوە بەکەساسییەوە تەمەنا و داوابکەن.

میان: لەنێوان. فرق: جیاوازی، فەرق. ناز نماید: ناز بکات.

خواجە دان بەوەدا دەنێت کە جیاوازی زۆر زۆر لەنێوان عەشق و مەعشوقدا هەیە، بۆیە کاتێ کە مەعشوق ناز دەکات نابێ عاشقیش ناز بکات، بەڵکو دەبێ داوای خۆی بەکەساسییەوە بخاتەڕوو.

**۶- نخست موعظەی پیر صحبت این حرف است**

**که از مصاحب ناجنس احتراز کنید**

یەکەمین ئامۆژگاری پیری هاودەم ئەم قسەیە: لەهاوڕێیەتی ناجنس دوورکەونەوە.

نخست: یەکەمین، ئەوەڵین. صحبت: هاودەم، هاوڕێ. حرف: قسە.

مصاحب: هاوڕێیەتی. ناجنس: ناکەس، پیاو خراپ، بەدجنس.

احتراز کنید: دوورکەونەوە، وازبێنن.

واتە یەکەمین ئامۆژگارییەك کە مورشیدی کامل بۆ مورێدەکانی دەکات ئەمەیەکە واز لەهاوڕێیەتی پیاوی خراپ و ناکەس بهێنن، چونکە وەك حەزرەت ـ د.خ ـ دەفەرموێت: ((المرء علی دین خلیله فلینظر احدکم من یخاف الله))

**۷- هر آن کسی کەدرین حلقه نیست زنده به عشق**

**بر او نمرده به فتوای من نماز کنید**

ئەو کەسەی کە لەم کۆڕەدا نییە بەعەشق زیندوونەبۆتەوە، بەنەمردوویی بەفتوای من نوێژی مردووی لەسەر بکەن.

زندە: زیندوو. براو: لەسەر ئەو. نمرده: نەمردوو (هێشتا زیندوو).

نمازکنید: نوێژبکەن — مەبەست لە نوێژی مردووە.

خواجە پێیوایە کۆڕی عاشقان کە عەشقی تێدایە ئەبێتە مایەی زیندووکردنەوەی خەڵك، بۆیە هەرکەس لەمەجلیس و کۆڕی عاشقاندا نەبێ و بەبەرەکەتی عەشق دڵی زیندوو نەبێت، بەمردووی دادەنێت و فتوادەدات هەربەزیندوویی نوێژی مردووی لەسەر بخوێنن، چونکە لەحەقیقەتدا مردووە نەوەك زیندوو.

**۸- وگر طلب کند انعامی از شما حافظ**

**حوالتش به لب یار دلنواز کنید**

وە ئەگەرحافز داوای بەخششێکی کرد، ئەو بۆ لای لێوی یاری دڵدەرەوە بنێرن.

انعام: بەخشش- خێر و چاکە.

حوالت کنید: بینێرن، حەواڵەی کەن.

دلنواز: دڵدەرەوە، ئارامبەخشی دڵ.

خواجە بەیارانی هاودەم وکۆڕی عەشق دەڵێ: گەر داوای شتێکیشم لێکردن بمنێرن بۆ لای لێوی یاری ئارامی بەخشی دڵان تائەو خێرێکم پێ بکات.



## غەزەلی دوو سەد و چل و دووەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی مەقسور**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلان)**

**۱- ای صبا نکهتی از کویِ فلانی به من آر**

**زار و بیمارِ غمم راحتِ جانی به من آر**

ئەی سروە لەکوچەی فلانەوە بۆنێك بۆ من بهێنە، لاواز و نەخۆشی غەمم رەحەتی گیانێك بۆ من بهێنە.

نکهت: بۆن. بەمن: بۆ من. ار: بهێنە.

زار: لاواز، بێ توانا، زەبوون.

بیمار: نەخۆش راحت جان: رحەتی گیان، ئارامی گیان.

(ی) لە (فلانی و جانی) دا بۆ نەناسراوە.

خواجە بەسروەی بەیان دەڵێ: ئەی سروە کەتۆ لەکووچە و کۆڵانی یارەوە هەڵدەکەیت، بۆنێکی یار (نەفەسێکی رەحمانی جیهانی سیفات) بۆ منی لاواز و نەخۆشی غەم بهێنە، چونکە ئەو بۆنەی یاری حەق بۆ منی نەخۆش و زەبوون ئارامی گیانە و بەوبۆنە گیانم ئۆقرە دەگرێت.

**۲- قلب بی حاصل مارا بزن اکسیرِ مراد**

**یعنی از خاكِ درِ دوست نشانی به من آر**

ئیکسیری موراد بدە لە دڵی قەڵبی بێ بەرهەمی ئێمە، واتە: لەخاکی بەردەرگای دۆستەوە نیشانەیەك بۆ من بهێنە.

بی حاصل: بێ بەرهەم، بێ ئەنجام (رەنج بەخەسار). بزن: لێیدە.

اکسیر:کیمیا، ئیکسیر- وەك پێشتر ئاماژەی پێکراوە — ئەو ماددەیە کە ماددەی بێ بەها دەگۆڕێت بە تۆخمی گرانبەهای وەك ئاڵتون.

خواجە هر رووی لەسروەی بەیانە و پێی دەڵێ: دڵی من کە تۆخمێکی قەڵب و تەزویرە هیچ بەرهەمێکی نییە، بە ئیکسیری موراد و بەئاوات گەیشتن پۆختەی بکە و ئیکسیرەکی لێدە، ئەم میسراعە بەمیسراعی (عجز) شەرح دەکات واتە: مشتە خۆڵێکم لەخاکی بەردەرگای یارەوە بۆ بێنە.

واتە: من ئاواتم ئەوەیە کە تۆزە گەرد و خاکێکی بەردەرگای یاری حەق لەسەر دڵم دانێم تاوەکو بەو خاکی کیمیایە دڵم چاك بێت، ئەی سەبا تۆ بەئاواتم بگەیەنە و ئەو تۆزەم بۆ بێنە تا دڵم پوختە بێت.

**٣- درکمین گاه نظر با دل خویشم جنگ است**

**ز ابرو و غمزه‌ی او تیر و کمانی به من آر**

له کەمینگای نەزەر (سەیرکردن) دا لەگەڵ دڵی خۆمدا لەشەڕدام، لەبرۆ غەمزەی ئەو تیر و کەوانێك بۆ من بێنە.

کمین گاه: شوێنی بۆسەنانەوە، کەمینگا.      خویش: خۆم.

ئەی سروەی بەیان: من لە بۆسەی تەماشاکردندا لەگەڵ دڵی خۆمدا لەشەڕدام (کەبۆچی دڵی من بەدووی هەرجوانێك دەکەوێت) بۆ ئەوەی لەم شەڕەدا سەرکەوتوو بم لەبرۆی یار کەوانێك و لەغەمزەشی تیرێکم بۆ بهێنە تا ئەم شەڕە لەدڵم ببەمەوە (چونکە دڵی من هەر بەجوانی یار تەسلیم دەبێت و ئیدی ناچێتە بۆسەی تەماشاکردنەوە).

واتە: دڵم حەزی لەتەماشای جوانانی مەجازییە،جوانییەکی یارم بۆ بهێنە تا دڵم روو لە جوانان وەرگێڕێ.

**٤- در غریبی و فراق و غم دل پیر شدم**

**ساغر می زکف تازه جوانی به من آر**

لەتاو غوربەت و دووری و غەمی دڵ پیربووم، پێکی مەی لەدەستی تازە لاوێکەوە بۆ من بهێنە.

پیر شدم: پیربووم.      کف: دەست.

لە غەمی دڵ و غوربەت و دابڕاندا پیربووم، پێکی شەڕابی عەشقم لەدەستی تازە لاوێکەوە —واسطة- بدەرێ تا جوان ببمەوە.

**٥- منکران را هم ازین می دو سه ساغر بچشان**

**و گر ایشان نستانند روانی به من آر**

دوو سێ پێك لەم مەیە بە ئەوانە بدە کەدژی شەڕابنۆشین تا تامی کەن، گەر ئەوان وەریان نەگرت یەکسەر بۆ منی بهێنە.

منکران: ئەوانەی دژی مەینۆشین، لێرەدا مەبەست لە — سۆفی و زاهیدانە.

بچشان: پێیان تام بکە، بیاندەیە تا تامی بکەن، نۆش بکەن.      نستانند: وەرنەگرن، نەیان وێت.

روانی: یەکسەر، فەورەن.

دوو سێ پێکی مەیی عەشق بدە بەو زاهید و سۆفییانەی کە دژی عەشقی حەقیقین تانۆشی بکەن، گەر نەیانویست رامەوەستە و یەکسەر بۆمنی بهێنە.



**٦- ساقیا عشرت امروز به فردا مفکن**

**یا ز دیوانِ قضا خطّ امانی به من آر**

ئەی ساقی: خۆشی ئەمڕۆ مەخەرە سبەینێ یا لەدیوانی قەدەرەوە نووسراوێکی ئەمانەتدان بۆ من بهێنە (کە دەگەمە بەیانی).

عشرت: هاودەمی و خۆشی و چێژی هاودەمی، خۆشگوزەرانی.      فردا: سبەینێ، بەیانی.

مفکن: مەخەرە.      دیوان قضا: دیوانی قەدەر و چارەنووس، ئەو جێگایەی کە قەزا و قەدەری تێدایە و چارەنووسی مرۆڤی تێدا دەنووسرێت.

خط امانی: نووسراوی ئەمان دان، نووسراوێك کە تیایدا پەنا و ئەمان بەکسێك ئەدرێت.

خواجە بەساقی — مورشید- دەڵێت، ئەمڕۆ کەئێمە لەچێژ و لەزەتی هاودەمی و ئونسی حەقداین و خەریکی خۆشگوزەرانین شەڕاب بهێنە و مەیخە بەیانی، چونکە کێ گرەنتی ئەوە دەدات کە بەیانی ئێمە زیندوو بین، ئەگەر ئەم کارەش دەکەیت ئەوا لەدیوانی چارەنووس و قەزاوە ئەمانێکمان بۆ بێنە کە تا سبەینێ ئیزراعیل گیانمان ناکێشێت و لە چارەنووسمان بەیانیش دەنووسرێت.

**٧- دلم از دست بشد دوش چو حافظ می گفت**

**ای صبا نکهتی از کویِ فلانی به من آر**

شەوی رابردوو کاتێ حافظ دەیگوت ئەی سروە لەکووچەی فلانەوە بۆنێك بۆ من بهێنە دڵم لەدەست چوو — لەخۆشیدا پەرێشان و بێ ئاگابوو.

ازدست بشد: لەدەست چوو.

کاتێ کە شەوی رابردوو حافظ دەیگوت ئەی سروە بۆنێکی یارم بۆ بێنە و دڵم ئەمەی بیست لەتاودا بێ ئاگا و پەرێشان بوو، چونکە هێندە حەزی لەبۆنی یار بوو تەنیا بەبیستنی ئەم قسەیە هۆشی لەدەستدا و مەفتون بوو.

## غەزەلی دوو سەد و چل و سێیەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی مەقسور**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلان)**

**١- صبا ز منزل جانان گـذر دریغ مدار**
**وز او به عاشق بی دل خبر دریغ مدار**

سروە درێغی لە ڕۆیشتن بۆ مەنزڵی جانان مەکە و درێغیش لە هێنانی خەبەری ئەو بۆ عاشقی بێ دڵ مەکە.

گذر: ڕۆیشتن، تێپەڕین. دریغ مدار: درێغی مەکە، قەدەغە مەکە.

بی دل: بێ دڵ. عاشق بی دل: واتە عاشقی دڵ لەدەست چوو، عاشقی شەیدا.

خواجە ئەم غەزەلەش بە ئاخاوتن لەگەڵ سروەی بەیان دەست پێ دەکات و پێی دەڵێت: ئەی سروە درێغی لە ڕۆیشتن بۆ هەوارگەی یار نەکەیت کە هەواری تێدا خستووە و کە ڕۆیشتیشی درێغی لە هێنانی ئەو بۆ ئەم عاشقە بێ دڵ و شەیدایە نەکەیت.

واتە: ئەی سروە بڕۆ بۆ هەوارگەی یار و هەواڵم بۆ بهێنە.

**٢- به شکر آنکه شکفتی به کام بخت ای گل**
**نسیم وصل ز مرغ سحر دریغ مدار**

ئەی گوڵ بە شوکرانەی ئەوەی کە بەئارەزووی خۆت پشکوتی، شەماڵی ژوان لەبولبول قەدەغە مەکە.

بەشکر: بەشوکرانەی. شکفتی: پشکووتی. مرغ سحر: بولبول.

گوڵی سوور بەئاواتی خۆی گەیشتووە و پشکوتووە، ئەم بەئاوات گەیشتنە شوکرانەی دەوێت، خواجە پێی دەڵێ با شوکرانەت بریتی بێت لەقەدەغە نەکردنی وەسڵ و ژوانی خۆت لەباڵندەی سەحەر —بولبول.

**٣- حریف عشق تو بودم چو ماه نو بودی**
**کنون که ماه تمامی نظر دریغ مدار**

هاودەمی عەشقی تۆ بووم کاتێ کە مانگی تازەبووی، ئێستا کە مانگی تەواوی — چواردەی — چاوی لوتفی خۆتم لێ قەدەغە مەکە.

حریف: هاودەم. ماه نو: مانگی تازە، مانگی یەك شەوە.

ماه تمام: مانگی تەواو، مانگی چواردە.



واتە: ئەی یار کاتێ منداڵ بوویت من عاشقی تۆ بووم و لەگەڵ عەشقتدا هاودەم بووم، ئێستا کە بوویتە مانگی چواردە و دەگەشێیتەوە ڕووی لوتفت لەمن هەڵمەکە و چاوی لوتفت لێم بێت.

**٤- کنون که چشمەی قند است لعل نوشینت**
**سخن بگوی و ز طوطی شکر دریغ مدار**

ئێستا کە لێوی یاقوتینی شیرینت سەرچاوەی شەکر و قەندە، قسە بکە و شەکر لە توتی مەگرەوە.

چشمە: سەرچاوە، کانی. نوشین: شیرین. سخن بگوی: قسەبکە.

ئەی یار: ئێستا کە لەعلی شیرینت سەرچاوەی قەند و شەکرە و منی عاشقیش تینوی قسەی ئەو دەم و لێوەی تۆم — هەروەك چۆن توتی حەزی لە شەکرە، دەکەوایە قسە بکە و شەکرە قسەی ئەو لێوەت لە توتی قەدەغەمەکە. — گوتراوە کە توتی زۆر حەزی لەشەکرە—.

**٥- جهان و هرچە درو هست سهل و مختصر است**
**ز اهل معرفت این مختصر دریغ مدار**

جیهان و هەرچی تێدایە ئاسان و کورتە، تۆ ئەم کەمە لە ئەهلی مەعریفەت مەگرەوە.

دروهست: تیایدایە.

جیهان مافیا: لای ئەهلی مەعریفەت شتێکی بێ بەهایە و بەدوی ناکەون، ئەی حەق تۆ ئەم شتە کەمە لەئەهلی مەعریفەت مەگرەوە و پێیان ببەخشە، واتە کەئەوان خۆیان شوێنی ناکەون تۆ پێیان ببەخشە.

د.هروی پێی وایە مەبەست لە (این مختصر) شەکری بەیتی پێشووە، کە لەڕاستیدا رایەکی زۆر جوان و بەجێیە {هروی، ج٢،ل ١٠٢٨ }.

واتە: ئەی یار دنیا و مافیها لای ئەهلی مەعریفەت بێ بەهایە، ئەوان شوێن قسە/ شەکری لێوی تۆ کەوتوون تۆش ئەو لوتفەیان لەگەڵ بکە و پێیان ببەخشە.

**٦- مکارم تو به آفاق می برد شاعر**
**ازو وظیفە و زاد سفر دریغ مدار**

شاعیر گەورەیی تۆ لەجیهاندا باسدەکات بۆیە خەرجی و پێداویستی سەفەر لەو مەگرەوە.

مکارم: گەورەیی، بەڕێزی. آفاق: جیهان.

می برد: دەبات. وظیفە: مەعاش.

ئەی یار مادام شاعیر باسی گەورەیی تۆ دەکات و بەهەموو جیهاندا بلاّوی دەکاتەوە تۆش یارمەتی بدە و مەعاش و خەرجی سەفەری رێگەی بۆ دابین بکە.

**٧- چو ذکر خیر طلب می کنی سخن این است**
**که در بهای سخن سیم و زر دریغ مدار**

کاتێ کە داوای باسکردن بە چاکە دەکەین، قسە ئەمەیە کە لە بەهای قسەدا زێڕ و زیو مەگرەوە.

ذکر خیر: باسکردن بەچاکە.    سیم و زر: زێڕ و زیو، پارە و پوول.

واتە: تۆ کە داوای ئەوە ئەکەیت کە بەچاکە باست بکەن، قسە بە پارە بکرە و خێر و چاکە بکە تابە چاکە باستکەن و رەزیل مەبە.

هەرچەندە من لەگەڵ ئەوەدانیم کە خواجە شاعیرێکی دەرباری بووبێت یاخود بۆخاتری پول و پارە بەشان و بالاّی کەسێکدا هەڵی دابێت، بەلاّم ئەم سێ بەیتەی دوایی بەجۆرێك ئەوە پیشان دەدات کە خواجە بەزمانێکی زۆر ئەدەبی (تەنانەت عیرفانیش کەئەکرێ بەیتەکان لێکدانەوەی عیرفانیش هەڵگرن) داوای پارە لەکەسێك دەکات لەبەرامبەر پیاهەڵدانیدا (والله اعلم).

**٨- غبار غم برود حال خوش شود حافظ**
**تو آب دیده ازین رهگذر دریغ مدار**

حافظ غوباری غەم دەڕوات و حاڵت چاك دەبێت، تۆش درێغی لەرژاندنی فرمێسکی چاو لەم رێیەدا مەکە.

هەروەك هەمیشە خواجە فرمێسکی چاو بەرێگەچارەی نەمانی خەم و هاتنی خۆشی دەزانێت، لێرەشدا ئەو دڵی خۆی دەداتەوە و بەدڵنیاییەوە دەڵێ: غوباری خەم دەڕوات و خۆشی دێتەوە بەلاّم بەمەرجێ تۆ لەم رێیەدا فرمێسك برێژە، چونکە ئەم فرمێسك رژاندنە کلیلی خۆشبەختییە.



## غەزەلی دووسەد و چل و چوارەم:

**بەحری هەزەجی شەشی مەقسور**
**(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیل)**

**١- الا ای طوطی گویای اسرار**
**مبادا خالیت شکّر ز منقار**

ئەلائەی توتیی نهێنی گۆ، یاخوا دەنووکت لەشەکر خاڵی نەبێت.

گویا: بێژەر.    طوطی گویای اسرار: ئەکرێ مەبەست لەتوتی خودی شاعیر یا نەفسی شەریف و یا خامەکەی شاعیر بێت.    مبادا: نەبێت.

خالی: خاڵی، دوور.   منقار: دەنوك.

خواجە لێرەدا ئافەرینی توتیی نهێنی بێژ/ گۆ دەکات و پێی دەڵێ: یاخوا دەنووکت لەشەکری قسەی نهێنی خاڵی نەبێت.

شەکر لەدەمت نەبڕێت، ئەکرێ بەواتای — دەمت خۆش بێت — یا- قسەی شیرینت لەدەم نەبڕێ بێت.

لە فەرهەنگی عیرفانیدا — هەروەك لەبەیتەکەشدا بەئاشکرا دەردەکەوێ —(توتی) مورشیدی کامڵ و پیری تەریقەتە کە نهێنییەکانی مەعشوقی حەق دەزانێت. هەروەك لەبەیتی دوایدا دەردەکەوێ:

**٢- سرت سبز و دلت خوش باد جاوید**
**که خوش نقشی نمودی از خطِ یار**

هەمیشە سەوز و دڵ خۆش بیت، چونکە وێنەیەکی جوانی خەتی رووخساری یارت پیشاندا.

سرت سەوز: سەرت سەوز بێت، سەرسەوز بیت (واتە) هەمیشە جوان و لاو بیت.

باد: ببێ.    جاوید: هەردەم، هەمیشە.

خوش نقش: وێنەیەکی جوان.

خط یار: خەتی رووخساری یار.

خواجە بەتوتی / پیری کامڵ دەڵێ: یاخوا هەمیشە و هەردەم جوان و دڵخۆش بیت مادام زۆر بەجوانی خەتی رووخساری جوانی یارت بۆ ئێمە خستەڕوو کە (جیهانی ئەرواحە لە نزیکی حەق دا) وەك ئەوەی کە وێنەت کێشابێت.

**٣- سخن سربسته گفتی با حریفان**

**خدا را زین معمّا پرده بردار**

بەماناوە قسەلەگەڵ هاوپێکاندا دەکەی، بۆ خاتری خوا پەردە لەسەر ئەم مەتەڵە لادە.

سخن سربستە: قسە کردن بە ماناوە، قسەی دژوار و بە کنایە قسە کردن.

حریفان: هاوپێکان.

معما: مەتەڵ. پردبردار: پەردە لادە.

ئەی پیری کامڵ — مورشید: لەگەڵ هاوشانانی خۆتدا بەجۆرێك قسە دەکەی کە ئێمە لێ تێ ناگەین و زۆر سەختە بۆمان قسەکانت ئەڵێی مەتەڵن بۆ خاتری خوا ئەم مەتەڵانە شیکەرەوە و بەسادەیی قسە بکە کەئێمەش تێبگەین

**٤- به روی ما زن از ساغر گلابی**

**که خواب آلوده‌ایم ای بختِ بیدار**

ئەی بەختی بێدار: ئێمە خەوالۆین، لەپێکی مەی گوڵاوێکمان بەڕوودا بپرژێنە — تا بەئاگا بێینەوە —.

زن /بزن: بپرژێنە، بدە. گلابی: گوڵاوێك. خواب آلودە: خەوالۆ.

مەبەست لە بەختی بێدار و بەختی چاك هەمان توتی (پیر و مورشیدی کامڵ)، دەڵێ: ئەی مورشید/ پیری نهێنی گۆ کە وەك بەختی بێداری، ئێمەی ڕێبواران خەوالۆین، تۆزێ شەڕابی عەشقی ڕەحمانیمان وەك گوڵاو بەڕوودا بپرژێنە تا بەئاگا بێینەوە.

**٥- چه ره بود این که زد در پرده مطرب**

**که می رقصند با هم مست و هشیار**

ئەمەچ ئاوازێك بوو موتریب لەپەردەدا لێیدا، کەمەست و هوشیار پێکەوە سەمادەکەن.

ره: ئاواز. زد: لێی دا، ژەندی. در پردە: لەئالەتی مۆسیقادا یاخود لەودیو پەردەوە کەجاران موتریب لەپەردەدا مۆسیقای لێدەدا و تێکەڵاوی ئەڵقەی سەما کردن نەدەبوو.

گەر پردە بەواتای دووەم وەرگرین، واتای بەیتەکە قووڵتر دەبێت، واتە: ئەمە چ ئاوازێك بوو کە موتریب (مەعشوقی حەق) لەپشت پەردەی حەوت ئاسمانەوە لێیدا ئاوا مەست و هوشیاری خستۆتە سەماوە.

بەڵام ئەگەر (پەردە) مۆسیقا بێت ئەکرێ موتریب هەمان توتی و بخت بیدار (واتە: مورشید و پیری تەریقەت بێت) ئەمە چ ئاوازێك بوو/ چ وەسیلەیەك پیری تەریقەت هێنایە ئارا وا هەموان چ مەست و چ هوشیار پێکەوە کەوتوونەتە حاڵ/ سماع.



**٦- ازین افیون که ساقی در می افکند**

**حریفان را نه سر ماند و نه دستار**

لەم تریاکەی کە ساقی کردیە مەییەوە، بادەنۆشان (هاوپێکان) نە سەریان ما و نە مێزەرە.

افیون: تریاك، ماددەی بێ هۆشکەر. افکند: کردیە، ڕژاندیە.

ماند: ما. دستار: مێزەرە، عەمامە، جامە و مشکی، هەرشتێ کە بەسەردا دەپێچرێت.

لەنەریتی کۆمەڵایەتی جاراندا دەبوایە پیاو شتێکی بەسەرەوە بێت و لەپاش تەمەنێك ئیدی سەری روتی عەیب بوو. بەیتەکە لەسەر ئەم بونیادە کۆمەڵایەتییە بونیاد نراوە جگە لەمە تریاك دەکرێتە شەڕابەوە تا کاریگەرتر بێت، خواجە دەڵێ: ئەمە چ ماددەیەکی بێهۆشکەر بوو کەساقی /مورشید کردیە شەڕابی عەشقەوە وا عاشقانی بادەنۆش لە(سماع) دا نە سەریان (هۆشیان) ما و نە مێزەرە و جامانە.

واتە مورشید کارێکی وای بە شەڕابی عەشقی حەقیقی کرد کە ڕەندانی تەریقەت کەوتنە حاڵەوە نە هۆشیان ما و نە پەیڕەوی لەنەریتی کۆمەڵگە و بەتەواوی لە ماددە و جەستە داڕنران.

**٧- سکندر را نمی بخشند آبی**

**به زور و زر میسّر نیست این کار**

ئاوێك (حەیات) بەئەسکەندەر نابەخشن ئەم کارە بەزۆر و سەروەت بەدەست نایەت (مەیسەر نابێت).

سکندر: ئەسکەندەر. نمیبخشند: نابەخشن.

ابی: ئاوێك، مەبەست لەئاوی نەمرییە

زور: زۆر، دەسەڵات. میسر نیست: بەدەست نایەت، مەیسەر نابێت.

- لێرەدا خواجە وەك هەمیشە هەوڵی دنیایی بێ نرخ دەکات و عینایەت و فەوڵی ئیلاهی بەهادار— ئەسکەندەر لەگەڵ ئەو هەموو دەسەڵات و سەروەتەی نەیتوانی ئاوی نەمری (ئاوی حەیات) بەدەست بهێنێ، هاوار- شاعیر دەڵێ: ئاوی حەیاتیان بەئەسکەندەر پێ نەبەخشی و خۆشی نەیتوانی بەدەستی بهێنێ چونکە بە دەسەڵات و سەروەت نییە و عینایەتی ئیلاهی پێویستە.

**٨- خرد هرچند نقد کائناتست**

**چه سنجد پیش عشق کیمیا کار**

هەرچەندە عەقڵ سکەی کائنات و بوونە، بەڵام لەبەرامبەر عەشقی کیمیاگەردا هیچ نییە.

خرد: عەقڵ. نقد: سکە. کائنات: بوون وجودی ماددی.

چه سنجد: چ بەهایەك هەیە، چۆن بەراورد ئەكرێ.

عەشقی حەق وەك كیمیاگەرێكە كە دڵە جەستەییەكان ئەگۆڕێت بۆ توخمی گرانبەهای مەعنەوی، عەقڵیش كە سكە و دراوی مادده و كائناتە و لەبوونی ماددیدا مامەڵەی پێدەكرێت و سەرداره، لەبەرامبەر عەشقدا هیچ بەهایەكی نییە و هەرناكرێ بەراوردیان بكەن، واتە: هەرچەندە عەقڵ لەدونیای ماددییاتدا دراو و سەرمایەیە بەڵام لەبەرامبەر عەشقی حەقدا بێ بەهایە.

ئەم بەیتە لەنوسخەی خلخالی و پیڕەوەكانیدا نەهاتووە.

**٩- بیا و حال اهل درد بشنو**

**به لفظ اندک و معنیّ بسیار**

وەرە بە گوتەی كەم و واتای زۆر گوێ لەحاڵی ئەهلی دەرد بگرە.

اهل درد: عارفان، ئەوانەی كە دەردی عەشقیان هەیە. اندك: كەم.

خواجە لەم چەند بەیتە كورت و پوختانەی خۆیدا ئێمە بۆ گوێگرتن لە حاڵی عارفان (ئەهلی دەرد) داوەت دەكات و دەڵێ: وەرە و بەم گوتە كورت و پڕمانا زۆرانە گوێ لەحاڵی عارفان بگرە كە دەردی دووری و فراقیان هەیە.

**١٠- بتِ چینی عدوی دین و دلهاست**

**خداوندا دل و دینم نگه‌دار**

بوتی چینی دوژمنی دین و دڵەكانە، خوداوەندا دڵ و دینم بپارێزە

بت: یار، مەعشوق. چینی: جوان، لەبەر ئەوەی چینییەكان بە نیگاركێشی بەناوبانگ بوون یار بە چینی ئەداتە؟ وەك بڵێی نیگاركێشانی چین وێنەیانكێشاوە هێندە جوان، یاخود ئەو كەنیزەكە جوانانەی كەجاران لەچینەوە ئەیانهێنا بۆ ئێران.

عدوی: دوژمن. نگەدار: بپارێزە.

یاری جوان دوژمنی جەستە و دینی رووكەشی ئێمەیە و تاڵانیان دەكات خوایە دڵ و دینی حەقیقی نێو عەشقم بپارێزە. لێرەدا و لەئاستی قووڵی واتای بەیتەكەدا دڵ و دینی یەكەم جیاوازە لەدڵ و دینی دووەم.

**١١- به مستوران مگو اسرارِ مستی**

**حدیثِ جان مپرس از نقشِ دیوار**

نهێنی مەستی بە مەستوران مەڵێ و پرسیاری قسەی گیانیش لە رەسمی دیوار مەكە.

مستوران: شاراوەكان، ئەوانەی كە دەردی عەشقیان نییە و خەریكی خۆشاردنەوەن و لەناخەوە درۆزن و فاسقن، بارسووكەكانی دەرەوەی دەریای عەشق، سۆفیلكە و خەڵكی عەوام.



حدیث جان: قسەی گیان، هەمان ئەسراری مەستی.

نقش دیوار: رەسمی دیوار، مەبەست لە مەستورانە.

مەستوران/ ئەوانەی كە لەدەرەوەی دەریای لەمەشقدان وەك رەسمی دیوار بێ رۆحن و گیانیان تێدا نییە بۆیە نە بەرگەی نهێنییەكانی دونیای عەشق دەگرن و نە هیچیشی لێ دەزانن، بۆیە تۆی عاشق نە نهێنییەكانیان پێ بڵێ و نەسەبارەت بە قسەی گیانیش (قسە و باسی عەشق) پرسیاریان لێ بكە لەخلفانیدا لەبری (مپرس از) (مگوبا) هاتووە سەرباری دووبارەبوونەوەی (مگو با) لەهەر دوو میسراعەكەدا و لەدەست دانی جوانی واتایی بەیتەكە لە زۆربەی نوسخە دێرینەكانیشدا (مپرس از) هاتووە.

**١٢- به یمن دولت منصور شاهی**

**علم شد حافظ اندر نظم اشعار**

بەبەركەتی مەنسور پاشا، حافز لە دانانی شیعردا ناوبانگی دەركرد.

(مەنسور پاشا) — وەك باسمانكرد — دوایین پاشای ئال مظفرییەكان بوو كە حافظ لە شیعرەكانیدا زۆر بەچاكی باسی دەكات.

علم شد: ناوبانگی دەركرد. اندر: لە. نظم اشعار: دانانی شیعردا.

**١٣- خداوندی بەجای بندگان كرد**

**خداوندا ز آفاتش نگه‌دار**

گەورەیی دەرحەق بە بەندەكان دەكرد، خوایە لەئافات بیپارێزە.

خداوندی: گەورەیی، چاكە و پیاوەتی. بەجای: لەگەڵ، دەرحەق.

خواجە لەم دووبەیتەی دواییدا ستایشی مەنسور پاشای كردووە كە زۆر چاكەی لەگەڵ ژێردەستەكانیدا كردووە و دوعای پاراستن لە بەڵا و ئافاتی بۆ دەكات.

ئەم بەیتەی كۆتایی لەهەندێ نوسخەدا نەهاتووە، بەڵام لەبەرئەوەی لە زۆربەی نوسخە باوەڕپێكراوەكاندا هاتووە بەناچاری هێنامان، چونكە زۆر سادەیە و لەنەسەقی گشتی غەزەلەكە دەرچووە و دوای بەیتی تەخەلوس هاتووە- هەرچەندە ئەم بەڵگانەش بیانووی پوچەڵكرنەوەیان هەیە-.

# غەزەلی دووسەد و چل و پێنجەم

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی مەقسور**
**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلان)**

**١- ای صبا نکهتی از خاک ره یار بیار**
**بِبَر اندوهِ دل و مژدەی دلدار بیار**

ئەی سروە لەخاکی رێی یارەوە بۆنێك بهێنە و خەفەتی دڵ ببە و مژدەی دڵدار بهێنە.

بیار: بهێنە. ببر: گەر (ببەر) بێت، کە راستتر وایە ـ بەواتای: ببە دێت بەڵام (ببور) بێت — کە ئەگەری هەیە بەڵام ساغکرەوەکان لەسەر خوێندنەوەی یەکەم کۆکن، بەواتای ببڕە دێت، - بەپێی واتای گشتی بەیتەکە خوێندنەوەی یەکەمی راستە.

اندوه دل: خەفەتی دڵ.

وەك غەزەلەکانی پێشووتر، (یار) لەدوورە و خواجە داوا لەسەبا دەکات کە بۆن و خەبەری یاری بۆ بهێنێ تا ببێتە مایەی رەواندنەوەی خەمەکانی و گەشانەوەی دڵ و گیانی.

ئەی سروەی بەیان بۆنێك لەخاکی سەررێی یار بهێنە، خەفەتی دڵم برەوێنەرەوە و مژدەی هاتنەوەی یار/ نزیکبونەوەی یارم بۆ بهێنە.

**٢- نکتەی روح فزا از دهن دوست بگو**
**نامەی خوش خبر از عالم اسرار بیار**

باسی قسەیەکی گیانبەخشی دۆستم بۆ بکە، نامەیەکی جیهانی ئەسرارم بۆ بێنە کە خەبەری خۆشی تێدا بێت.

نکته از دهن دوست: قسەیەکی زاری دۆست.
روح فزا: گیانبەخش و شادی و خۆشی هێنەر.
خوش خبر: خەبەری خۆش.

ئەی سروە: قسەیەکی زاری دۆستم پێ بڵێ (کەگوێت لێ بووە) کە رۆحم پێ ببەخشێ و شادومانم کات و برۆ لەجیهانی غەیبیشەوە نامەیەکم بۆ بهێنە کەخەبەری خۆش (هاتنەوەی یار/ یاوەسڵی ئەو)ی تێدا بێت.

**٣- تا معطّر کنم از لطفِ نسیم تو مشام**
**شمّه‌ای از نفحاتِ نفس یار بیار**



تا لەلوتفی شەماڵی تۆوە هەستی بۆنکردنم بۆنخۆش بکەم، کەمێ لەبۆنی خۆشی هەناسەی یارم بهێنە.

معطرکنم: بۆنخۆش بکەم. مشام: هەستی بۆنکردن. شمه: کەمێك.
نفخات: بۆنی خۆش. نفس: هەناسە.

ئەی سروە تاتۆ لوتفت بەسەرمەوە هەبێت و لەلوتف و چاکەی تۆوە هەستی بۆنکردنم بۆنخۆش بکەم کە چوویت بۆ لای یار کەمێ لەبۆنی خۆشی رەبانی و رەحمانی هەناسەی یاری حەقم بۆ بهێنە تابەو بۆنە، هەستی بۆنکردنم بۆنخۆش بکەم.

**٤- به وفای توکه خاک ره آن یار عزیز**
**بی غباری که پدید آید از اغیار بیار**

بەوەفاداری خۆت سوێندت ئەدەم، بەبێ ئەوی غوبارێك لە نامۆکانەوە هەستێ خاکی سەررێی ئەو یارە ئازیزە بهێنە.

بەوفای تو: بۆ وەفاداری تۆ. پدید آید: هەستێ، دەرکەوێ.

غوبار لەنامۆکان هەستان، واتە: لەنامۆکان عەزیەتمان پێ بگات، خواجە سروە بە وەفاداری خۆی سوێند دەدات کە بەبێ ئەوەی ببینە مایەی حەسادەتی نامۆ و ئەغیار و عەزیەتمان بدەن بەئەسپائی و بەهێمنی برۆ خاکێکی سەررێ و بەرپێی یارم بۆ بهێنە.

**٥- گردی از رهگذر دوست به کوری رقیب**
**بهر آسایش این دیدەی خونباز بیار**

بەکوێری چاوی رەقیب گەردێك لە رەهگوزەر (شوێنی تێپەڕین)ی یار بۆ ئارامی ئەم چاوە پڕخوێنە بهێنە.

بەکوری: بەکوێری چاوی. گردی: گەردێك. رهگذر: شوێنی تێپەڕین، رێگە.
بهر: بۆ. ئاسایش: ئارامی، ئارامگرتن.
خونبار: خوێنین، چاوێ کە فرمێسکی خوێنین دەرێژێ.

خواجە گەردێکی بەرپێی یار بە ئارامی و شیفای چاوانی فرمێسکی خوێنینرێژی خۆی دەزانێت، بۆیە بەسروە دەڵێ: بەکوێرایی چاوی رەقیب برۆ ئەو گەردە بهێنە کەوەك کل بیکەمە چاوم و ئارام بگرێت.

**٦- خامی و سادەدلی شیوەی جانبازان نیست**
**خبری از برِ آن دلبر عیّار بیار**

خامی و گێلی شێوازی گیانفیدایان نییە لەو دولبەرە عەیارەوە خەبەرێك بهێنە.

خامی: خامی، ناپوخته و ناکاملی.          ساده‌دلی: ساده‌لەوحی، گێلی.

جانبازان: گیانفیدایان، گیانبەختکەران.

ئێمەی عاشقانی گیانفیدا، نەریتی دانیشتنمان لەگەڵ ناپوختە و گێل و نەفاماندا نییە، بۆیە خەبەرێکمان لەلایەن ئەو دولبەرە عەیارەوە بۆ بێنە لەگەڵیدا بژین.

**٧- شکر آن راکه تو در عشرتی ای مرغ چمن**

**به اسیران قفس مژده‌ی گلزار بیار**

ئەی بولبول بەشوکرانەی ئەوەی کە تۆ لە خۆشگوزەرانیدای، خەبەرێکی خۆشی گولزار بۆ ئەسیرانی قەفەس بهێنە.

مرغ چمن: باڵندەی گولزار و باخ کە بولبولی بە وەسڵ گەیشتووە.

بولبول لەقەفەسی دیلێتی رزگاری بووە و بەدیداری گوڵ شاد بووە، کە ئەکرێ ئەم شادبوونە هەمان توتی نهێنیزان بێت کە بەژوانی یاری حەق گەیشتووە، خواجە ئەم بەخۆشگوزەرانی و ژوان گەیشتنە بەشایانی سوپاس کردن دەزانێت بۆیە ئەڵێ: ئەی بولبولی نێو گولزار بە شوکرانەی گەیشتن بەخۆشی و ژوانت موژدەی خۆشی نێو گولزار بەئێمەی ئەسیری قەفەسی جەستە بدە.

**٨- کام جان تلخ شد از صبرکه کردم بی دوست**

**عشوه‌ای زان لب شیرین شکربار بیار**

چەشەی گیانم بەهۆی سەبرەوە کەبێ دۆست کردم تاڵ بوو، عیشوەیەك لەو لێوە شیرینە شەکر بارەوە بهێنە.

کام: چەشە، هەستی چەشتن.          تلخ: تاڵ.          شکر بار: شەکربار.

(کام جان تلخ شد) بەواتای کاریگەری لەگیانم کرد دێت و دەڵێ: تاڵی سەبری دووری دۆست کاریگەریی لەسەر گیانم کردووە و نارەحەتم و ژیانم ژەهری مارە، لەو لێوە شیرینە شەکربارەی یارەوە نازو خەمزەیەکم بۆ بهێنە تا کەمێ ئارام بگرم.

**٩- روزگاریست که دل چهره‌ی مقصود ندید**

**ساقیا آن قدح آینه کردار بیار**

رۆژگارێکە کەدڵ رووخساری ئارەزووی نەدیوە، ئەی ساقی ئەو پێکە ئاوێنە رەفتارە بێنە.

مقصود: ئارەزوو، ویستراو.

ایینە کردار: ئاوێنە رەفتار، وەك ئاوێنە کار دەکات و شتەکان پیشانئەدات.



خواجە روو لەساقی دەکات و پێی دەڵێ: ساقی ماوەیەکی زۆرە دڵ رووخساری یاری نەدیوە پێکی مەی / عەشق بێنە کە وەك ئاوێنەیە و یاری تێدا دیارە تایار ببینین، پێکی مەیی حەقیقی بێنە تامەست بین و یار جیلوەبکات.

**١٠ - دلق حافظ به چه ارزد به می اش رنگین کن**

**وانگهش مست و خراب از سر بازار بیار**

خەرقەی حافظ هیچ ناهێنێ بەمەی رەنگینی کە، ئەوکاتەش مەست و سەرخۆش بەبازاڕدا بهێنە.

بەچە ارزد: هیچ ناهێنێ، هیچ بەهایەکی نییە          به می اش رنگین کن: بەمەی رەنگینی کە، بەمەی بیشۆ.          وانگە: ئەوکاتە.          سربازار: ئەوسەری بازاڕ، درکەیە لە شوێنی قەرەباڵغ و جەنجاڵ.

خواجە بەپیری کامڵ دەڵێ: خیرقەی رەسمی سۆفییانەی حافظ بەکەڵکی هیچ نایەت و هیچ بەهایەکی نییە، بۆیە بیبە و بەشەڕابی عەشق بیشۆ و رەنگینی بکە، ئەو کاتەش کەوات کرد، حافظ لەوسەری بازاڕەوە- بەو خیرقە رەنگین بە مەییەوە — بهێنە تا تەواوی خەڵکی بزانن من عاشق و عارف بووم و وازم لەسۆفیگەری رەسمییانە هێناوە بوومەتە ئەهلی مەیخانە.

## غەزەلی دووسەد و چل و شەشەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفونی مەقسور**

**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلان)**

**١- عید است و آخر گل و یاران درانتظار**

**ساقی به روی شاه ببین ماه و می بیار**

جەژنە و کۆتایی وەرزی گوڵە و یاران چاوەڕێن، ساقی دوای بینینی مانگ چاوبەڕووی شارا هەڵبێنە و مەی بهێنە.

آخر گل: کۆتایی گوڵ، کۆتایی وەرزی بەهار.

درانتظار: لەچاوەڕوانیدان، چاوەڕوانن.

(بەروی شاه ببین ماه) جاران نەریت بوو کە ئەو کەسەی مانگی یەکشەوەی شەوالی دەدی چاوی دادەخست و بۆ پیرۆزی چاوی لەسەر شتێکی بەنرخ دەکردەوە وەك ئاو، پارە و ئاوێنەو...هتد، خواجە لێرەدا بە ساقی دەڵێ: کۆتایی مانگی ڕەمەزان و وەرزی بەهارە و یاران چاوەڕێی تۆن، پاش ئەوەی کەمانگی یەکشەوەی جەژنت بینی بۆ موبارەکی چاو لەسەر پاشا هەڵبێنە و خێرا شەرابی عەشقمان بۆ بێنە تا بینۆشین.

لەڕاستیدا جەژن کەکۆتایی هاتنی ڕەمەزانە با دەست بەتاڵبوون لەهەر فەرزێکی دیکە ئامادەگییە بۆ چوونەوە نێو عەشقی ڕەبانی.

**٢- دل برگرفته بودم از ایّام گل ولی**

**کاری بکرد همّتِ پاکانِ روزه‌دار**

دەستم لەڕۆژانی گوڵ (بەهار) شوشتبوو بەڵام، هیمەتی پاکانی ڕۆژوەوان کارێکی کرد(تێنەپەڕی).

دل برگرفته بودم: دەستم لێ شوشتبوو، بەتەمای نەمابووم، بێ هیوابووم.

کاری بکرد: کارێکی کرد.

روزه‌دار: ڕۆژوەوان.

کە ڕۆژانی بەهار و ڕەمەزان پێکەوە بوو، دەستم لەوە شوشتبوو کە لەم وەرزەدا مەستی عەشق بم بەڵام باشبوو کە هیمەتی پاکان و ڕەندانی ڕۆژوەوان کارێکی کرد و ڕەمەزان زوو تەواو بوو فریای مەینۆشی دەکەوین.



**٣- دل در جهان مبند و به مستی سؤال کن**

**از فیض جام و قصه‌ی جمشید کامگار**

دڵ بەدونیا خۆش مەکە بەمەستی لەبارەی فەیزی جام و چیرۆکی جەمشیدی کامیارەوە پرسیار بکە.

دل درجهان مبند: دڵ بەدونیاوە مەبەستە، دڵ بەدونیا خۆش مەکە.

واتە : دڵ بەدونیا خۆش مەکە و پرسیار کە بزانە جەمشید و فەیز و بەرەکەتی جامی جەمشید چۆن بوو.، لەکاتێکدا جەمشیدیش مردووە، واتە: دونیا ئەڕوا و وەك چۆن جەمشید نەما ئێمەیش دەڕۆین و ئیدی دڵ بەدونیا خۆش مەکە.

**٤- جز نقد جان به دست ندارم شراب کو**

**کان نیز بر کرشمه‌ی ساقی کنم نثار**

جگە لە سکەی گیان هیچی دیکەم بەدەستەوە نییە، کوانێ شەراب تا ئەویش بکەمە قوربانی نازی ساقی.

نقد: سکە، سەرمایە.      بەدست ندارم: نیمە، بەدەستمەوە نییە، شك نابەم.

کنم نثار: بکەمە قوربانی.

جگە لە سکە و سەرمایەی گیان هیچ شك نابەم، کوانێ شەراب تا بینۆشم و گیانیشم بکەمە قوربانی نازی ساقی عەشق.

**٥- خوش دولتیست خرم و خوش خسروی کریم**

**یارب زچشم زخم زمانش نگاه‌دار**

دەوڵەتێکی خۆش و شایەکی شاد و بەخشندەیە خوایە لە چاوی پیسی ڕۆژگار بیپارێزە.

خرم: شاد.      خسروی: پاشای.      چشم زخم: چاوی پیس.      نگاه دار: بیپارێزە.

ئەکرێ مەبەست لەم شایە ساقی بێت چونکە ئاماژەیەکی بۆ کەسێك یا شایەکی دیکەی تێدا نییە.

**٦- میْ خور به شعر بنده که زیبی دگر دهد**

**جام مرصّع تو بدین دُرِّ شاهوار**

لەگەڵ شیعری بەندەدا مەی بنۆشە چونکە پێکی نەخشینی تۆ بەم دوڕە شاهانەوە جوانییەکی دیکە دەبەخشێ.

می خور: مەی بنۆشە.      بنده: بەندە، مەبەست لە خۆیەتی.      زیبی: جوانییەکی.

جام مرصع: پێکی نەخشین کە بە نقێم و مرواری دەنەخشێنرێت و شاهانەیە.

شاهوار: شاهانه.          در شاهوار: مرواری شاهانه، مرواریيەك كە لايقی پاشايانە.

خواجە بەو پاشا ناديارە- ساقی /مورشيد-دەڵێ: لەكاتێكدا كەمەی دەنۆشيت لەگەڵ گوێگرتن لەشيعری مندا مەی بنۆشە چونكە شيعرەكانی من وەك مرواری گرانبەهای پاشايانە و گەر لەگەڵ شيعری مندا مەی بنۆشی جوانی زياتر دەبەخشێتە پێكە نەخشينەكەت بە مرواری.

د.هروی پێيوايە واتای بەيتەكە- بەتايبەتی ميسراعی دووەم — پێچەوانەيە، چونكە نووسيويەتی: كەپێكی نەخشينی تۆ بەجوانی خۆی جيلوەيەكی ديكە دەبەخشێتە مرواری گرانبەهای شيوەی من.

**٧- زانجا كە پردەپوشی عفوِ كريمِ تست**

**بر قلبِ ما ببخش كە نقديست كم عيار**

لەوێوە كە گوناهداپۆشەری يەكێ لە بەخشش و گەورەييەكانی تۆيە، رەحم بەدڵی ئێمە بكە چونكە سكەيەكی كەم عەيارە.

پردەپوشی: گوناهداپۆشەری، ستاری.          قلب: دڵ، سكەی قەڵب و تەزوير.

كم عيار: عەياری كەم كە مەبەست لە خراپی و لاوازييە.

دڵی قەڵبی ئێمە كە عەياری كەمە و تەواو خالس و پاك نييە تانای بەرگەگرتنی لەبەردەم گوناهاندا نييە لەوێشەوە كە گوناهپۆشی عەبدەكان يەكێكە لەسيفاتە جوانەكانی بەخشندەيی و لێخۆشبوونی تۆ هەر لەوێوە لەگەورەيی خۆت و بچووكی و كەم بەهايی ئێمە و رەحم بەدڵی بەندە بكە.

وەك خواناسان دوعا دەكەن: خوايە من شايانی ئەوە نيم كە رەحمی تۆ بمگرێتەوە بەڵام رەحمی تۆ هێندە زۆرە كەشايانی ئەويە منی زەبونيش بگرێتەوە.

تۆ كە ستاری رەحم بەدڵی لاوازم بكە و گوناهەكانم داپۆشە، خودايا

ئيلاهی من فيدای ستاری تۆ بم

ئيلاهی من فيدای غەفاری تۆبم

**٨- ترسم كە روز حشر عنان بر عنان رود**

**تسبيح شيخ و خرقەی رند شراب خوار**

ئەترسم رۆژی حەشر پێ بەپێی يەكتری برۆن (يەكسان بن) تەسبيحی شێخ خيرقەی رەندی شەرابخۆر.

عنان: رەشوە، هەوسار.          عنان برعنان: پێ بەپێ، يەكسان، پێكەوە، بەرامبەر.



شراب خوار: شەرابخۆر.

ئەترسم لە رۆژی حەشردا تەسبيح و تەسبيحاتی شێخی فێڵباز و رياكار لەگەڵ عەشق و خيرقەی رەندان / عاشقانی پاك وەك يەك بن، واتە دڵنيام وەك يەك نين و بەرامبەر نين بەڵام بڵێی وابێ.

**٩- حافظ چو رفت روزە و گل نيز می رود**

**ناچار بادە نوش كە ازدست رفت كار**

حافظ مادام رۆژوو (رەمەزان) تێپەڕی گوڵيش دەڕوات، ناچار بادە بنۆشە چونكە كار لەدەست دەچێت (دونيا كۆتايی دێت).

روزە: رۆژوو، مەبەست لەمانگی رەمەزانە.

خواجە بەخۆی دەڵێ: مادام رەمەزان تێپەڕی بەهاريش تێدەپەڕێت و تەمەن كۆتايی دێت بۆيە، دەستمان دەرچووە و كاری ئێمە نييە ناچار خەريكی شەرابی عەشق بە و خۆت بەتێپەڕينی تەمەنەوە مەشغوڵ مەكە.

## غەزەلی دووسەد و چل و حەوتەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسلەم**
**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لن)**

**١- روی بنمای و وجود خودم از یاد ببر**
**خرمن سوختگان را همه گو باد ببر**

رووت دەرخە و وجودی خۆمم لەیاد ببەرەوە، بلّێ با خەرمانی سووتاوان بابیبات.

روی: ڕوو. بنمای: دەرخە، بنوێنە، پیشانده (جیلوە بکە).

از یاد ببر: لەیاد بەرەوە، لەبیری ببەرەوە.

سوختکان: سووتاوان، سووتاوانی عەشق. گو: بلّێ، لێگەڕێ.

خواجە لێرەدا رووبە خودی یار و حەزرەتی حەق دەکات و داوای جیلوەکردنی لێدەکات، بەو دەڵێ:

رووت دەرخە و جیلوە بکە و فانیم بکە و بۆنی خۆمم لەبیر ببەرەوە، و بلّێ بە (باش) کە خەرمانی وجودی عاشقان/ سووتاوان ببات.

بۆنی خۆ لەبیربردنەوە و بردنی خەرمانی بۆنی دڵسووتاوان / عاشقان لەلایەن باوە، درکەن لە فەنا، بەگشتی خواجە بەیاری حەق دەڵێ، جیلوە بکە و من بە فەنا بگەیەنە تا خۆم بیر بچێتەوە.

**٢- ما چو دادیم دل و دیده به طوفان بلا**
**گو بیا سیل غم و خانه ز بنیاد ببر**

ئێمە کە دڵ و دیدەمان داوە بە تۆفانی بەڵا، لێگەڕێ با لافاوی غەم بێت و ماڵمان لەبن هەڵکەنێ.

زبنیاد: لەبنەڕەت و بنچینەوە.

ئێمەی دڵسووتاوان/ عاشقان کەدڵ و چاومان داوە بە تۆفانی بەڵا (عەشق) ئیدی ماڵمان بۆ چییە و لێگەڕێ / بلّێ با لافاوی خەم بێت و ئەم ماڵی جەستەیەمان لەبن دەربهێنێ و وێرانی بکات ئێمە کە چووینەتە نێو دونیای عەشقەوە بۆچی جەستەمان فەنا نەبێت.

**٣- زلف چون عنبر خامش که ببوید هیهات**
**ای دل خام طمع این سخن از یاد ببر**



هەیهات کێ زوڵفی وەك عەنبەری — بێ خەوشی ئەو بۆن دەکات، ئەی دڵی هەرزە ئاوات ئەم قسەیە لە یاد ببەرەوە.

عنبر خام: عەنبەری بێ خەوش و خالس. ببوید: بۆن بکات. هیهات: هەیهات بۆ دوورخستنەوە و باوەڕ نەکردن بە شتێك بەکار دێت، ئەستەمە. خام طمع: هەرزە ئاوات، بوونی ئاوات و ئارەزووی بێ جێ و ئەستەم.

کێ ئەتوانێ هێندە لەیار نزیك بێتەوە پرچی وەك عەنبەری بێخەوش و بۆنخۆشی ئەو بۆن بکات و (پەی بە رازێك ببات و جیلوەی سیفاتی ببینێ) ئەستەمە ئەمە رووبدات، ئەی دڵی هەرزە ئاواتی من کە ئەم ئارەزووەت هەیە، ئەم قسەیە لە مێشکی خۆت دەرکە و لە بیری خۆتی بەرەوە.

**٤- سینه گو شعلەی آتشکدەی فارس بکش**
**دیده گو آب رخ دجلەی بغداد ببر**

بلّێ بەسنگم، کە ئاگری ئاگردانی فارس بکوژێت، بەچاوانیشم بلّێ، ئابڕووی دیجلەی بەغدا ببات.

شعله: شوڵە شاگر. آتشکده: ئاگردان، مەعبەدی زەردەشتییەکان کەهەمیشە ئاگری تێدابوو و نەدەکوژایەوە. آب رخ: ئابڕوو.

واته: بهێڵە یا بلّێ تا سینەم هێندە بسووتێ کەئاگرەکەی لە ئاگری مەعبەدەکانی زەردەشتی ناوچەی فارس زیاتر بێت و ئەوان بکوژێنێتەوە و بەچاویشم بلّێ تا هێندە فرمێسك برێژێت لەئاوی دیجلە زیاتر بێت، هێندە زیاتر بێت کەئابڕووی دیجلە ببات و لەشەرمەزاریدا وشك بکات.

**٥- سعی نابرده درین راه به جایی نرسی**
**مزد اگر می طلبی طاعت استاد ببر**

بەبێ هەوڵ لەم ڕێیەدا بەهیچ شوێنی ناگەیت، گەر داوای حەقدەست دەکەیت بەگوێی مامۆستات بکە.

سعی نابرده: بەبێ هەوڵ و کۆشش. بەجایی نرسی: بەشوێنێك ناگەیت.

مزد: حەقدەست. طاعت استاد ببر: بەگوێی مامۆستا بکە.

بەبێ هەوڵدان لەم ڕێگەیەی عەشقەدا تۆی ڕێبوار بە هیچ شوێنێك / ئارەزوویەك ناگەیت، گەر دەتەوێ بگەیت بەحەقدەست و ئارەزووی خۆت بەگوێی مامۆستا/ پیر و مورشیدی خۆت بکە.

**۶- دولت پیر مغان باد که باقی سهل است**

**دیگری گو برو و نام من از یاد ببر**

دام و دەزگای پیری موغان پارێزراو بێت (بەرقەراربێت) کە هەرچی دیکـە هەیـە گرنگـی نییە، بڵێ بەوانی دیکە کە بڕۆن و ناوی من لەبیر ببەنەوە.

واتە: من تەنیا پێویستیم بە پیری تەریقەت هەیە و هیچی دیکەم بە لاوە گرنگ نییە.

دولت: دام و دەزگا. باقی: هەرچی دیکە هەیە، ماباقی.

سهل است: ئاسانە، گرنگ نییە.

گرنگ لای من مانەوەی پیری موغان و دەور و دەوڵەتییـەتی و جگـە لـەو ماباقی بـۆمن گرنگ نییە، بۆیە بە ئەوانی دیکە (جگەلەپیری تەریقەت/ موغان) بڵێ بڕۆن و ناوی مـن لـەبیر خۆیان ببەنەوە.

**۷- روز مرگم نفسی وعدەی دیدار بدە**

**وانگهم تا بە لحد فارغ و آزاد ببر**

ڕۆژی مەرگم هێندەی هەناسەیەك پەیمانی دیدارم بدەرێ و ئەوکاتە بەئاسوودە و ئازاد مـن تاگۆڕ ببە.

نفسی: هەناسەیەك. وعدە: پەیمان. لحد: گۆڕ. فارغ: ئاسوودە.

گەر ڕۆژی مەرگیشم بێت بۆ ماوەی هەناسـەیەك پـەیمانی ژوان و دیـدارم بـدەرێ، ئەوکاتـە ئیدی کە تۆ دەبینم بەئاسوودە و ئازاد و ڕەها لە غەم و مەینەتی عەشق دەمـرم و تـا لێـواری گۆڕ منی ئاسوودە و ئازاد ببە و بمنێژە.

واتە: گەر لەکاتی مەرگیشدا پەیمانی دیدارمان بدەیتێ بەئاسوودەیی و ئارامی دەمرم.

جیلوەی حەق بۆ عاشقانی حـەق لـەکاتی مەرگـدا لای عارفـەکان باسـکراوە و لـە (رمـوز الواهین) هاتووە کە (عاشقێکی ڕاست لەسەرمەرگدابوو، پێدەکەنی، گوتیان لـەم نارەحەتییـەدا بەچی پێ ئەکەنی، گوتی: چوجانان پردە رابر دارد از رخ دهند عشاق جان شادان و فرخ

کەیار پەردەی لەڕووی لادەدات عاشقان بەشادی و خۆشحاڵییەوە گیان تەسـلیم دەکـەن بـە (نقل) لە{ لاهوری، ج٣، ل١٧١٢ }.

**۸- دوش می گفت بە مژگانِ درازت بکُشم**

**یارب از خاطرش اندیشەی بیداد ببر**

شـەوی ڕابـردوو دەیگـوت بـەبرژانگی درێـژ دەتکـوژم، خوایـە بـیری سـتەم و زوڵفـی لەبیرببەرەوە.



مژگان دراز: برژانگی درێژ. از خاطرش ببر: لەبیری ببەرەوە، لەمێشکی دەرکە.

اندیشە: بیر، هزر. بیداد: ستەم، زوڵم.

دوێنێ شەوێ یار دەیگوت حافظ بەتیری برژانگی درێژم ئەتکوژم، خوایـە ئەمـە زوڵمـە و ئەم بیری زوڵم و ستەم کردنە لە مێشکی دەرکە با نەمکوژێت.

**۹- حافظ اندیشە کن از نازکی خاطر یار**

**برو از درگهش این نالە و فریاد ببر**

حافظ بیر لە دڵناسکی یار بکەرەوە و لەدەرگای بڕۆ و ئەم ناڵە و هاوارە ببە.

اندیشە کن: بیربکەرەوە. نازکی خاطر: دڵناسکی.

خواجە لەبەردەرگای یاردا کەوتووە و لەتاو دووری یار بەردەوام خەریکی هاوار و ناڵەیە، بەخۆی دەڵێ: تۆ نازانی یـار زۆر دڵـی ناسـکە و زوو دەڕەنجـێ و تـۆش لـەم بەردەرگایەیـدا بەردەوام خەریکی هاوار و ناڵەی، بۆیە بیر لەم دڵناسکییەی بکەرەوە و بەردەرگاکەی چۆڵ کە و ئەم هاوار و ناڵە ناڵەت لەم بەردەرگایە دوورخەرەوە تا دڵی نەڕەنجێ و بـە هـاوار و ناڵـەت ئازاری نەدەیت.

لێرەد خواجە ئەوە دەخاتەڕوو تەنانەت گەر نزیکیت بووە مایەی ئازاردانی یار دووربکەوەوە تا ئازاری نەدەیت.

# غەزەلی دووسەد و چل و هەشتەم

**بەحری هەزەجی شەشی مەحزوف**

**(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیل)**

**١- شب قدارست و طی شد نامەی هَجر**

**سلامٌ فیـــــــــهِ حتّی مَطْلَعِ الْفَجْــر**

شەوی قەدرە و نامەی دووری پێچرایەوە، هەتا سپێدەی بەیان لەم شەوەدا سلام بێت.

طی شد: پێچرایەوە، کۆتایی هات. هجر: دووری، دابڕان.

شب قدر: شەوی قەدر، لەیلەتولقەدر، یەکێ لە دە شەوەکانی کۆتایی مانگی پیرۆزی ڕەمەزانە

سەبارەت بە شەوی قەدر و پیرۆزی شەوی قەدر زۆرگوتراوە، زانایان پێیان وایە کە یەکێ لەشەوە تاکەکانە و پێغەمبەر ـ د.خ ـ دەفەرمووێت: ((تحرو لیلة القدر فی الوتر من العشر الاواخر من رمضان)) بخاری. بەزۆری بەشەوی (٢٧) ەمی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز دەزانن و خێری چاکەکردن و خواپەرستی لەوشەوەدا خێری زۆر زیاترە و خودی شەوەکە لەهەزار مانگ چاکترە دیسانەوە حەزرەتی موحەمەد ـ د.خ ـ دەفەرمووێت: ((من قام لیلة القدر ایمانا واحتساباً غفر له ما تقدم من ذنبه)).

واتە هەرکەس لەشەوی قەدردا بەئیمان و پاکییەوە هەستێتەوە بۆ عیبادەتکردن خوا لە گوناهی لەوەوبەری خۆش دەبێت (سلام فیه حتی مطلع الفجر) لەم شەوەدا تا سپێدەی بەرەبەیان سەلام و خۆشبەختی هەیە و تیایدایە. ئەم مصرعە ئایەتی (٥)ی سورەتی موبارەکی (القدر)ە.

شەوی قەدر، ئەو شەوەیە کەقورئانی پیرۆزی تێدا دابەزیوە و- بەڕای هەندێك چارەنووسی مرۆڤەکان تێدا دیاریکراوە.

خواجە موبارەکییەکی دیکە دەخاتە پاڵ شەوی قەدر و دەڵێ: شەوی قەدرە و لەگەڵ هەموو موبارەکییەکانیدا- لەم شەوەدا نامە و کتێبی دووری و فیراق پێچرایەوە و دوایی هات، ئەم شەوی قەدرە موبارەکەی کە تاسپێدەی بەرەبەیان هەر بەرەکەت و ئاشتی و سەلامە.

شەوی قەدر لەفەرهەنگی عیرفانیدا شەوی جیلوەی یار و فەنابوونە لەودا.

**٢- دلا در عاشقی ثابت قدم باش**

**کە در این رە نباشد کار بی اجر**

ئەی دڵ، لەعاشقیدا جێگیر بە، چونکە لەم ڕێیەدا کاری بێ پاداشت نییە.



ثابت قدم: جێگیر، تۆکمە، پۆڵایین. اجر: پاداشت.

خواجە دڵی خۆی ئاگادار دەکاتەوە کەئەی دڵ لەسەر عەشقی یار جێگیر و پۆڵایین بە و هەرگیز لەرزۆك مەبە چونکە لەم ڕێیەی عەشقدا هیچ کارێك بێ پاداشت نییە و پاداشت ئەدرێتەوە.

**٣- من از رندی نخواهم کرد توبە**

**ولو آذَیْتَنی بِالهَجرِ وَ الحَجْر**

من تۆبە لەرەندی ناکەم گەر بە بەجێهێشتن و قەدەغەکردنیش ئازارم بدەی.

نخواهم کرد توبە: تۆبە ناکەم (لەداهاتوودا).

ولو: گەر. اذیتني: ئازارم بدەیت. الهجر: جێهێشتن، دووری، جودایی.

الحجر: قەدەغەکردن لە بینین.

ئێستا کە شەوی قەدرە و نامەی جودایی و دابڕان پێچراوەتەوە و یار جیلوەی کردووە، خواجە پەیمانی بەردەوامی خۆی لەسەر عەشق/ ڕەندی و قەڵەندەری دووبارە دەکاتەوە و بەیار دەڵێ: تەنانەت گەر بە دووری و جێهێشتن و قەدەغەکردنیشم لە بینینت ئازارم بدەیت هەر واز لەعەشق و ڕەندی ناهێنم.

**٤- دلم رفت و ندیدم روی دلدار**

**فغان ازین تطاول آە ازین زجر**

دڵم لە دەست چوو. ڕووی دڵدارم نەدی، هاوار لەم ستەم و ئاە لەم ئەشکەنجەیە.

دلم رفت: دڵم ڕۆیشت، دڵم لەدەست چوو واتە بێ ئارام و بێ قەرار بووم و سەبرم نەما.

زجر: قەدەغەکردن، ئازار و ئەشکەنجە، نەهی کردن، ڕێگرتن.

دڵم ئارامی نەما و ڕووی یاری حەقم نەدی هاوار لەم زوڵم و ڕێگرتن و ئازارە کەلەتاو نەدیتنی ڕووی یاری حەق دەیکێشم.

**٥- بر آی ای صبح روشن دل خدارا**

**کە بس تاریک می بینم شب هجر**

ئەی بەیانی دڵ ڕوشن بۆ خاتری خوا هەڵبێ کە شەوی دووری زۆر تاریك دەبینم.

روشن دل: دڵ ڕووناك.

بر ای: هەڵبێ، دەرکەوە.

شەوی دووری و دابڕان لای زۆر تاریکە ئەی یار ئەی هەتاوی دڵڕووناك کە ڕووناکی لەدڵتایە و جیهانی پێ ڕووناك دەبێتەوە بۆ خاتری خوا هەڵبێ و دەرکەوە تاشەوی دووری و جودایی دوایی بێت.

**٦- وفا خواهی جفاکش باش حافظ**

**فَاِنَّ الرِّبح وَ الخُسرانَ فی التَّجْر**

حافظ گەر وەفات دەوێ بەرگەی ستەم و جـەفا بگـرە، چـونکە لەبازرگانیـدا قـازانج و زەرەر هەیە.

جفاکش: کەسێ کەبەرگەی ستەم و جەفا دەگرێت. باش: بە.

الربح: قازانج. الخسران: زەرەر، زیان. التجر: بازرگانی و مامەڵەکردن.

هەروەك چۆن بازرگانی هەر خۆشی و قازانج کردن نییە، زەرەریشی تێدایە و هەرکەس بازرگانی بکات دەبێ بەرگەی هەردووکیان بگرێت، تـۆش (ئـەی حـافظ) کـەداوای وەفـا و وەفاداری لەیار دەکەی دەبێ بەرگەی ستەم و عیتابەکانی یـار بگریـت و خۆڕاگربـە لەسـەر هەڵگرتنی جەفای یار. جەفای یـار تـەواوی هـەوڵ و موجاهەلـە و ریـازەت و چلەنـشینی و شەونوێژ و خۆبرسی کردنەکانی ڕێبواری ڕێگـەی حەقـە کـە بـەم شـتانەی قۆنـاغی یەکـەی تەریقەت تێدەپەڕێنێ.



## غەزەلی دووسەد و چل و نۆیەم

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی مەحزوف**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)**

**١- گر بود عمر و به میخانه رسم بار دگر**

**بجز از خدمت رندان نکنم کار دگر**

گەر تەمەن باقی بێت و جارێکی دیکە بگەمـەوە بەمەیخانـە، جگـە لـە خزمـەتی رەنـدان کارێکی دیکە ناکەم.

بود عمر: تەمەن باقی بێت، تەمەن درێژبێت.

رسم: بگەم لەچاوگی (رسیدن /گەیشتن) ەوە وەرگیراوە. باردگر: جارێکی دیکە.

کار دگر: کارێکی دیکە.

گەر خوا تەمەنم بدات و جارێکی دیکە بگەمەوە مەیخانە —کەمەیخانە شوێن و خەڵوەتگەی عاشقانی ڕێگەی یاری حەق یا نیشتمانی رەسەنی رۆح و گیانەکانمانـە کەمـەقامی واحدیەتـە- جگە لەوەی کەخزمەتی رەندان / عاشقانی یاری حەق دەکەم هیچ کارێکی دیکە ناکەم.

هەرچۆن بێت لەم غەزەلەدا خواجە لە هەست و سۆز و تاسەی قـووڵی خـۆی بـۆ مەیخانـەی عەشق ئەدوێت.

لـە نوسـخەی (خلخـالی) و هاوشـێوەکانیدا (گربـود عمـر) و (و)ی تێـدا نییـە، لـەم ساغکردنەوەیەدا خواجە دڵنیایە لەگەیشتنەوەی بەمەیخانە، بەڵام گومانی لەتەمەن درێژی خۆی هەیە، واتە:

((گەرتەمەن باقی بێت جارێکی دیکە بەمەیخانە دەگەمەوە))

ئەم شێوەیە تەنیا لەنوسخەی خلخالیدا هاتووە لەتەواوی نوسخە دێرینەکاندا (و) هاتووە.

**٢-خرّم آن روز که با دیدەی گریان بروم**

**تا زنم آب درمِکیدە یك بارِ دگر**

خۆشە ئەو رۆژەی کە بەدیدەی ئەشـکبارەوە بـڕوم تاجـارێکی دیکـە بـەردەرگای مەیخانـە ئاوپرژێن کەم.

خرم: خۆشە، شا لەڕاستیدا لە زمانی کوردیدا لەم حاڵەتەدا (خۆزگە) بەکاردێ.

دیدەگریان: چاوانی گریاوە، دیدەی ئەشکبارەوە.

زنم آب: ئاوپرژێن کەم، ئاوڕژێن کەم.          درمیکده: بەردەرگای مەیخانە.

خۆزگەم بەوڕۆژەی کەجارێکی دیکە بەچاوی پڕلەفرمێسکەوە دەچم بـۆ مەیخانـەی عەشـق، تابەفرمێسکی چاوانم جارێکی دیکە بەردەرگای مەیخانە ئاوڕژێن کەم و خزمەتێکی پێ بکەم.

**٣- معرفت نیست درین قوم خدایا سببی**

**تابَرَم گوهرِ خود را به خریدارِ دگر**

ئەم قەومە ماریفەتیان تێدا نییە، خوایە هۆکارێك –بسازێنە- تا گەوهەری خۆم ببەم بـۆ کڕیارێکی دیکە.

سببی: هۆکارێك، وەسیلەیەك.     برم: ببەم.     خریدار: کڕیار.

خواجە ڕەخنە لە سەردەم و قەومەکەی خۆی یا شارەکەی خۆی دەگرێـت کـە بێماریفـەتن و قەدری شیعر و گەوهەرەکانی حافظ ناگرن، بۆیە دەڵێ: خوایە هۆکارێکم بـۆ بـسازێنە تـابڕۆم و ئەم شیعرانەی خۆم-کە گەوهەرن- ببەم بۆ کڕیارێکی دیکە.

**٤- یار اگر رفت و حقِ صحبتِ دیرین نشناخت**

**حاشَ للّه که روم من ز پیِ یارِ دگر**

گەر یار ڕۆیشت و حەقی هاودەمی دێرینی لەبەرچاو نەبوو، حاشالله گەر من بڕۆم بـەدوی یارێکی دیکەدا.

صحبت درین: هاودەمی و پێکەوە بوونی دێرینە و کۆن، پێکـەوەبوونی دێـرین لەمـەقامی واحدیەتدایە، ئەوکاتەی ڕۆحەکان کەلیمە بوون و هـەموویان پێکـەوەبوون و یـاریش هـەر لـەو مەنزڵگایەدا بوو- هەندێك لەزانایان بە بەهەشتی دادەنێن.

نشاخت: نەناسی، لەبەرچاونەبوو، ریعایەتی نەکرد،گوێی پێ نەدا.

حاش لله: حاشالله، پاك و بێگەردی بۆ خوا، بۆ تەئکید کردنە لەقسەیەك.

روم / بروم: بڕۆم.     زپی: بەدوای.

یارکەهیچ پێویستییەکی بەعەشقی ئێمە نییە و ئێمەین پێویستیمان بەوهەیە، بۆیـە دەڵـێ گەریار هەرچەندە لەمەقامی واحیدیەتدا پێکەوە بـووین و دراوسـێ بـووین و ڕۆیـشت و خـۆی لەئێمە حەشاردا و پەردەی لەنێوان چاوی ئێمە و ڕووی جوانی خۆیـدا دانـا و گـوێی نـەدا بـەو دراوسێیەتی و پێکەوەبوونە دێرینەمان، حاشا لله من هەرگیز ناڕۆم بەدوای یـارێکی دیکـەدا و هەمیشە هەر عاشقی یاری حەق دەبم.

**٥- گر مساعد شودم دایرەی چرخِ کبود**

**هم به دست آورمش باز به پرگارِ دگر**



ئەگەر بازنەی ئاسمانی شین هاوکاریم بکات، دیسان بە پڕگالێکی دیکە بە دەستی دەهێنمەوە.

مساعد شودم: یارمەتیم بدات، هاوکاریم بکات.

دایرە چرخ کبود: ئاسمانی شین، درکەیە لە دەسەڵاتی ئاسمان و مەشیئەتی ئیلاهییە.

بەدست اورمش: بەدەستی دەهێنم.

پرگار: پڕگاڵ، درکەیە لە مەکر و حیلە و فڕوفێڵ — لێرەشدا — هەربەم واتایە هاتووە.

واتە: گەر ویستی خودا و مەشیئەتی ئیلاهی هاوکـاریم بکـات، جـارێکی دیکـە و بەهـەر فڕوفێڵێك بێت یار بەدەست دەهێنمەوە.

ئەکرێ هاوکاری ئاسمان لێرەدا تەمەندرێژی بێت وەك لە بەیتی یەکەمدا بە ئاشکرا دەربڕیوە.

**٦- راز سربستەی مابین که به دستان گفتند**

**هر زمان با دف و نی بر سرِ بازار دگر**

سەیری رازی سەرداپۆشراوی ئێمە کە، کە لەهـەر سـەردەمێکدا بـەدەف و نەیـەوە لەهـەر بازاڕێکدا بەسروود دەیڵێن.

سربستە: سەرداپۆشراو، سەربەمۆر، شاراوە.     دستان: سروود، گۆرانی، ئاواز.

برسر بازار: لەبازاڕدا، مەبەست لە قەرەباڵغی و جەنجاڵی بازاڕە.

سەیری ئەم رازە شاراوە و سەربەستراوەی ئێمەی عاشقان بکە، بەحیسابی خۆی شـاراوەیە و نابێ بڵاو بێتەوە کەچی لە هەر سەردەمێکدا و لە ناو هەر قەرەباڵغی و بازاڕێکـدا بـە ئـاوازی دەف و مەیەوە دەیڵێن و کورد گوتەنی دەهۆڵی بۆ دەکوتن.

واتە: هەرچەندە رازی عەشق بشاریتەوە ئاشکرادەبێت.

**٧- عافیت می طلبد خاطرم ار بگـذارند**

**غمزەی شوخش و ان طرّەی طرّارِ دگر**

حەزم بە لای سەلامەتی و بەکەنارییە لە کێشەیە، گەر غەمزەی بێ پەروا و پرچی ڕێگـر و جەردەیەکی دیکەی یار بهێڵن.

عافیت: سەلامەتی، بەکەناری لەگرفت، عافیەت (مەبەست لە دوورکەوتنەوەیە لەعەشق)

میطلبد: داوادەکات.     بگـذارند: بهێڵن.

شوخ: جەسور، بێ حەیا، شۆخ.     طرار: ڕێگر و جەردە.

خواجە دەڵێ: لەراستیدا مەیلم بەلای کەنارگرتنەوەیە و دەمەوێ واز لـە عەشـق بهێـنم بەڵام پێناچێ واز بێنم چونکە غەمزە و نازی جەسور و پرچی ڕێگر و جەردەی یار ناهێڵن و دڵم دەبەن.

گەر غەمزە و پرچی ئەو یارە بهێڵن حەزم لەوەیە واز لەعاشقی بهێنم و ئیسراحەت بکەم، چونکە عەشق هەمووی دەرد و مەینەتە.

**٨- هردم از درد بنالم که فلك هر ساعت**

**کُنَدَم قصدِ دلِ ریش به آزارِ دگر**

هەردەم لەتاو دەرد دەناڵم چونکە فەلەك هەر سەعاتە نیازی وایە کە بە ئازارێکی دیکە دڵی بریندارم ئازار بدات.

دل ریش: دڵی بریندار.   کند قصد: نیازی وایە، دەیەوێ.

هەردەم لەتاو دەرد دەناڵێنم چونکە فەلەك بەردەوام نیازی وایە کە دڵی بریندارم ئازار بدات و سەعاتێ وچانم نادات بحەوێمەوە.

**٩- باز گویم نه درین واقعه حافظ تنهاست**

**غرقه گشتند درین بادیه بسیار دگر**

دیسانەوە دەڵێم لەم ڕووداوەدا حافظ تەنیا نییە بەڵکو زۆری تر لەم بیابانەدا نغرۆ بوون.

بازگویم: دیسانەوە دەڵێم.   واقعە: ڕووداو.

غەرقە گشتند: نغرۆبوون، غەرق بوون.   بادیە: بیابان.

دەبێ ئەم ڕووداوەی کە زۆرێکی فڕێداوەتە نێو لمی بیابان و نغرۆی ئەو لمەی کردوون ڕووداوەکانی فەلەك و گەردوون یاخود حەق بێت کە ئێمەی فڕێداوەتە نێو بیابانی وشکی دونیای نغرۆی خەم و خەفەتەکانی ئێرەی کردووین.

خواجە لێرەدا لەلایەکەوە دڵی خۆی دەداتەوە کەتەنیا ئەو نییە فڕێدراوەتە نێو بیابان و نغرۆی لم بووە بەڵکو زۆری تر وایە و لەلایەکی دیکەوە ئەو بڕوایە ئەخاتەڕوو کەئەم ڕووداوە تەنیا بەسەر (حافظ) دا نەهاتووە بەڵکو هەموومان نغرۆی لمی بیابانین و بەخۆمان نازانین.

لەڕاستیدا (واقع) تەفسیر و ڕاڤەی زۆر هەڵدەگرێت، ئەکرێ (واقع) دوورکەوتنەوەی خواجەبێت لەمەیخانە / مەقامی واحدیەت و هاوسێیەتی حەق بەرلەهاتنە دونیا.

یاخود(واقع) بەیتی پێشووبێت کە بێ ڕەحمی فەلەك و گەردوونە دەرحەق بە دڵبریندارن یا ئەکرێ (واقع) هەریەك لەڕووداوەکانی بەیتەکانی پێشوو بێت، بەندە پێی وایە کە (واقع) دوورکەوتنەوەی خواجەیە لە مەیخانە.



## غەزەلی دووسەد و پەنجایەم

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەقسور**

**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلان)**

**١- ای خرم از فروغ رخت لالەزار عمر**

**بازآ کە ریخت بی گل رویت بهار عمر**

ئەی ئەو کەسەی کە گوڵزاری تەمەن بە ڕووناکی تیشکی ڕووتەوە شادە، وەرەوە کە بەهاری تەمەن بێ گوڵی ڕووت هەڵوەری.

فروغ: ڕووناکی تیشك.   لالەزار: گوڵزار.   بازا: وەرەوە.

ریخت: ڕژا، هەڵوەری.

خواجە ڕووناکی و تیشکی ڕووی یار بەمایەی شادی ژیان و گوڵزاری تەمەن و لاوی خۆی دەزانێ و ئێستا یار ڕۆیشتووە و خواجە داوای گەڕانەوەی لیدەکات و پێی دەڵێ:

ئەی ئەو کسەی تیشکی ڕووخسارت مایەی شادی ژیان و گوڵزاری تەمەنی من بوو، وەرەوە چونکە بەبێ گوڵی ڕووی تۆ بەهاری عومری من هەڵدەوەرێ، چونکە بەهار بێ گوڵ بەسەردەچێت و بەهار نییە.

**٢- از دیده گر سرشك چو باران چکد رواست**

**کاندر غمت چو برق بشد روزگار عمر**

گەر سروشك وەك باران لەچاوم بڕژێ جێی خۆیەتی، چونکە لە غەمتدا ڕۆژگاری تەمەن وەك بروسکە تێپەڕی.

سرشك: سروشك، ئەشك، ڕۆنەك، فرمێسك.

چکد: بتکێ، بڕژێ.

روا: ڕەوایە، جێی خۆیەتی، بەجێیە.

اندر: لە.

برق: بروسکە، بروسك.

بشد: ڕۆیشت، تێپەڕی.

ئێستا ئیدی جێی خۆیەتی گەر من فرمێسکی چاوم وەك باران ببارێنم و زۆر بگریێم چونکە لەغەمی دووری تۆدا (ئەی یار) ڕۆژانی تەمەنم وەك بروسکەیەك تێپەڕی و دوایی هات.

**۳- این یك دو دم که وعده‌ی دیدار ممکن است**

**دریاب کارما که نه پیداست کار عمر**

ئەم یەك دوو ساتە کە پەیمانی دیدار مومکینە، ئاوڕێ لەکاری ئێمە بدەرەوە چونکە کاری تەمەن دیار و ئاشکارنییە.

دم: هەناسە، دەم، ماوەیەکی کورت. ممکن است: مومکینە، ئەکرێ، لەبارە.

دریاب: بدۆزەرەوە — پەیدای کە (لێرەدا) بەواتای ئاوڕدانەوە، فریاکەوتن.

نەپیداست: دیار و ئاشکرانییە

ئاشکرا نەبوونی کاروباری تەمەن، نەزانینی ماوەی تەمەنە کەکەس نازانێ بەکوێ دەگات و کەی کۆتایی دێت، خواجە لەپیریدا بە یار دەڵێت: ئێستا کە من لە پیریدام و پەیمانی دیدار و ژوان بۆماوەی یەك دوو هەناسەش لەبار و مومکینە ئاوڕێکم لێ بدەرەوە و پەیمانێکی ژوانمان بدەرێ چونکە کەس نازانێ تا جارێکی دیکە دەمێنین یاخود دەمرین و کەس نازانێ تەمەن تاچەند درێژ دەبێتەوە، عارفی ابن الوقت جیایە لە مورشیدی بدالوقت، خواجە عبدالله انصاری سەبارەت بە بەفرسەت زانینی ئێستا دەڵێ:

((دی رفت و باز نیاید، فردا را اعتماد نشاید، حال را غنیمت دان که دیر نپاید)). واتە: دوێنێ ڕۆیشت نایەتەوە، سبەینێش پشتی پێ نابەسترێ، ئێستا بە غەنیمەت و دەستکەوت بزانە چونکە درەنگ ناکات، دەڕوات، زۆر ناوەستێ.

**٤- تا کی می صبوح و شکر خواب بامداد**

**هشیار گرد هان که گذشت اختیار عمر**

تاکەی شەڕابی بەیانی و خەوینی شیرینی بەیانیان، هوشیاربەوە ها! چونکە کاتە چاکەکانی تەمەن تێپەڕی.

می صبح: مەینۆشی بەیانییان. شکر خواب: خەوی شیرین.

بامداد: بەیانی.

هشیار گرد: هوشیاربەوە. هان: ها، هێی بۆ هوشیار کردنەوە.

گذشت: تێپەڕی.

اختیار: هەڵبژاردن، کاتە چاکەکان بۆ بڕیاردان — مەبەست بە لاوییە- ئەو کاتانەی کە مرۆڤ ئازادە.

لە هەڵبژاردنی ژیاندا- هەرچۆن بێت مەبەست لە سەرەتای تەمەن ولاوییە.



خواجە لەم پیرییەدا دڵی خۆی ئاگادار دەکاتەوە، کە ئەی دڵ، هێی، هوشیار ببەرەوە و تاکەی خەریکی خەوی شیرینی بەیانی — تەمبەڵی و غەفڵەت و بێ ئاگایی — بی صبوحی- خۆتی، سەردەمی لاوی کاتی چاکی هەڵبژاردنە بەسەرچووە - تێپەڕیوە.

**۵- دی درگذار بود و نظر سوی ما نکرد**

**بیچارە دل کە هیچ ندید از گذار عمر**

دوێنێ دەرۆیشت لای لەئێمە نەکردەوە، بێچارە دڵ کە لەتێپەڕینی تەمەن هیچی نەدی- دەسگیر نەبوو.

دی: دوێنێ. درگذار بود: دەڕۆیشت. سوی ما: بەلای ئێمەدا.

گذار عمر: تێپەڕینی تەمەن.

(تەمەن-عمر)ی دووەم ایهامی تێدایە و مەبەست لە (یار) یاخودی تەمەنە، خواجە دەڵێ: دوێنێ یار کە تێدەپەری هیچ ئاوڕی لەئێمە نەدایەوە، بێچارە دڵ کە لەتێپەڕینی تەمەن (یار) هیچی دەسگیر نەبوو.

**۶- اندیشه از محیط فنا نیست هر که را**

**بر نقطه‌ی دهان تو باشد مدار عمر**

هەر کەس بازنەی تەمەنی بەدەوری خاڵی دەمی تۆدا کێشرابێت ترسی لەزەریای فەنا نییە.

اندیشه: بیر.

محیط فنا: زەریای فەنا و تیاچوون، دەریای فەوتان و نەمان، دەورگرتن و دەورەدان.

مدار: بازنە.

خاڵی دەمی یاری بەخاڵی نێو بازنە- کەبەپرگاڵ دەکێشرێ — داناوە و بازنەی تەمەنیشی بە سەرەکەی دیکەی پرگاڵەکە، ئەو دەڵێ: هەرکەس بازنەی تەمەنی خۆی بەدەوری خاڵی دەمی تۆدا کێشابێت تەمەنی لەپێناو دەمی تۆدا سەرف کردبێت ترسی لەتیاچوون و لەورەگرتنی بەفەنا نییە، یاخود بیر لەوە ناکاتەوە کە بەفەنا و نەمان دەورەگیراوە.

دەم- لەفەرهەنگی عیرفانیدا (نهێنی و ڕاز و ئیشاراتی ئیلاهییە) کە وەك حەزرەتی مەسیح و موحەمەد و خاسانی خوا دەیزانن، واتە هەرکەس ئەو ڕازانە بزانێت باکی لەمەرگ نییە.

**۷- در هر طرف ز خیل حوادث کمنگهی است**

**زان رو عنان گسسته دواند سوار عمر**

لەهەموو لایەکەوە سوپای ڕووەداوەکانی ژیان لە بۆ سەدان بۆیە سواری تەمەن بەبێ ئەوەی جڵەوەی بەدەستەوە بێت- بەپەشۆکاوی — ڕادەکات.

در هر طرف: لەهەموو لایەکەوە.        خیل: ئۆردو.

حوادث: رووداو، رووداوەکانی رۆژگار.

گمینگە: بۆسە، کەمین.        زان رو: لەدرووەوە، بۆیە.

عنان: هەوسار، رەشۆ.    گسستە: پچڕاو.        عنان گسستە: هەوسار پچڕاو، بێ هەوسار، درکەیە لە پەشۆکاوی، دڵەڕاوکێ، وەك سوارێك ئەسپەکەی هەوساری نییە و سەر بەهەموو لایەکدا دەکات.

دواند: دەڕوانێ، لێ دەخوڕێ، راپێدەکات.

تەمەنی بەسوارێك داوەتە قەڵەم، دەڵێ: لەبەرئەوەی رۆژگار بە ئۆردوی رووداوە زۆر و زەوەندەکانی لەهەموو لایەکەوە کەمینی بۆ تەمەنی ئێمە داناوە بۆ سواری تەمەنیشمان بە پەشۆکاوی و دڵەڕاوکێوە ئەسپەکەی دەڕانێت و خۆشی نازانێ بۆ کوێ دەڕوات و سەر بەهەموو فەتارەتێکدا دەدات.

**٨- بی عمر زندەام من وزین بس عجب مدار**

**روز فراق را که نهد در شمار عمر؟**

بێ ژیان زیندووم و لەمەش زۆر سەرت سوڕنەمێنێ، کێ رۆژانی دابڕان بە تەمەن دەداتە قەڵەم.

زندەام: زیندووم.        نهد: دەیخاتە، دایدەنێ.

مەبەست لە (عمر) کەلێرەدا لەبری ژیان هاتووە (یار)ە، ئەو دەڵێ ئێستا بەبێ یار زیندووم و بەڵام ناژین و ئەمە بەژیان حسێب ناکرێت و زۆر سەرت سوڕ نەمێنێ لەمە، چونکە کێ رۆژانی دابڕان و دووری لەیار دەخاتە نێو ژیانەوە و بەتەمەن دەیداتە قەڵەم؟

**٩-حافظ سخن بگوی که بر صفحەی جهان**

**این نقش ماند از قلمت یادگار عمر**

حافظ قسەبکە، چونکە ئەم نووسینەی قەڵەمەکەت وەك یادگارییەك بەسەر لاپەڕەی رۆژگارەوە دەمێنێتەوە.

سخن بگو: قسە بکە (شیعر بڵێ).        ماند: دەمێنێتەوە.

یادگار: یادگاری.

خواجە دڵنیایە کە تەنیا وشەیە دەمێنێتەوە کە وشەکانی خواجەش شیعرن، بۆیە بەخۆی دەڵێ: قسە بکە و شیعر بنووسە چونکە ئەم قسانەی تۆ کە بەرهەمی تەمەن و قەڵەمەکەتن پاش خۆت وەك یادگاری بەسەر لاپەڕەی رۆژگارەوە دەمێنێتەوە و نامرن.



## غەزەلی دووسەد و پەنجا و یەکەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەقسور**

**(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان)**

**١- یوسف گمگشته باز آید به کنعان غم مخور**

**کلبەی احزان شود روزی گلستان غم مخور**

یوسفی ونبوو دێتەوە بۆ کەنعان، خەم مەخۆ کولبەی ئەحزانیش رۆژێ ئەبێتە گوڵستان، خەم مەخۆ.

گمگشته: ونبوو (سیفەتی بەرکاری- ئاوەڵناوی کراو-ی چاوگی ونبوونە).

بازآید: دێتەوە.        کنعان: شاری حەزرەتی یوسف، کە شارێکە لە فەلەستین.

غم مخور: خەم مەخۆ، بێ خەمبە.        کلبەاحزان: ماتەم سەرا، کۆلیتی خەفەتەکان، ئەو خانوچکەیەی کە حەزرەتی یەعقوب دوور لە خەڵك تیا دەژیا پاش ونبوونی حەزرەتی یوسف.

گلستان: گوڵستان، باخی پڕگوڵ و گوڵزار.

بێگومان لە ئاستی سەرەوەدا بەیتەکە ئاماژەی ئاشکرایە بۆ چیرۆکی حەزرەتی یوسف و حەزرەتی یەعقوب، پاش ئەوەی کە حەزرەتی یەعقوب خۆشەویستییەکی لەڕادەبەدەری بۆ حەزرەتی یوسف هەیە زڕبراکانی حەسوودی پێدەبەن و بڕیاری لەناوبردنی — دوورخستنەوەی ئەدەن.

چیرۆکەکە باوە و پێویست بەگێڕانەوەی هەمووی ناکات، لەبەرچاوی باوکی دوور دەکەوێتەوە و باوکیشی خەفەتێکی زۆری بۆ دەخوات تەنانەت لەخەفەتدا چاوی کوێر دەبێت ((وابیضت عیناه من الحزن)) سورەتی یوسف ئایەتی ٨٤.

خواجە ئەم حاڵەتی دوورکەوتنەوە و ونبوونی حەزرەتی یوسف بۆ مانای نەمانی جیلوەی مەعشوق و مەستور بوونی لەبەرچاوی عەشقدا تەوزیف دەکات و کەنعان و کولبەی ئەحزانیش بەدڵ و خەڵوەتگەی عاشقان دەژمێرێت و لەسەر بنەمای ئایەتی ((فأن مع العسر یسراً، إنَ معَ العسرِ یسراً)) الانشراح ٦/٥. واتە: ((لەگەڵ ناڕەحەتیدا ئاسانی و خۆشی هەیە)) بەیتەکە دادەڕێژێت.

واتە: ئەی عاشقی نێو ماتەمسەرا رۆژێك مەعشوقی مەستورت جیلوەی جەمالی خۆی — کە بە یوسف دەری بڕیوە- لەسەر دڵت دەکاتەوە و دڵت دەبێتە گوڵستان و باغی پڕلەگوڵ و گوڵاڵەی وەسڵ و قورب.

لاهوری دەڵێ: دەستەیەك لەگەورەكانی تەریقەت، دووری و دابڕان لە وەسڵ و قورب بەچاكتر دەزانن چونكە لەدووری و دابڕاندا ئومێدی پێكگەیشتن هەیە، بەڵام لە وەسڵ و قوربدا ترسی لەدەستچوون هەیە.{ لاهوری، ج٣، ل١٧٦٧} . لەڕاستیدا غەزەلەكە دڵدانەوەی ئەو عاشقانەیە كە لەحاڵی دووری و دابڕاندان و هیوابەخشینە پێیان.

**٢- این دل غمدیده حالش به شود دل بد مکن**

**وین سر شوریده باز آید به سامان غم مخور**

ئەم دڵە خەمبارە چاك دەبێتەوە نائومێد مەبە، ئەم سەرە پەرێشانەش ئارام دەگرێتەوە، خەم مەخۆ.

غمدیده: خەسار، مەینەت بار. بەشود: چاك دەبێتەوە.

دل به مكن: نائومێد مەبە، نارەحەت مەبە، بیری خراپ بەدڵتدا نەیەت.

شوریده: پەرێشان، پەشێوحاڵ. سامان: ئارامی، سەبر.

لەدرێژەی هەمان واتای بەیتی پێشوو دایە و دەڵێ: نائومێد مەبە ئەم دڵەی كەئێستا لەتاو دووری و دابڕان خەمبارە رۆژێ دێت كەحاڵی چاكدەبێتەوە و خەمباری نامێنێ، هەروەها ئەم سەرەش كە ئەمڕۆ پەشێوحاڵ و نائارامە رۆژێ ئارام دەگرێت،، خەم مەخۆ.

لەبەرئەوەی كە ئەم غەزەلە زۆر بەرز و سادەشە و ئومێدێكی زۆر تێدا بەدی دەكرێت، وشەكانی زۆر گۆڕاون، لەم بەیتەدا:

لەنوسخەكانی (خانلری، قزوینی، لاهوری، خرمشاهی،..) دا لەبری ((این دل غمدیده حالش)) (ای دل غمدیده حالش) هاتووە واتە گوێگر دڵە و قسەكان ئاراستەی دڵ كراوە.

بەڵام لەشەش نوسخەدا هەشت نوسخەی دێرین — ((این دل غمدیده حالش)) هاتووە، ئێمەش بەپەیڕەوی لە د.عیوضی و د.هروی، ئەم ساغكردنەوەیەمان پەسەند كرد.

**٣- دور گردون گر دو روزی بر مراد ما نبود**

**دایماً یكسان نباشد كار دوران غم مخور**

گەر دوو رۆژێك دەوری گەردوون بەویستی ئێمەنەبوو، هەمیشە كاری دەوران یەكسان نابێت، خەم مەخۆ.

دوروزی: دوو رۆژێك، ماوەیەك.

برمراد: بەپێی ئاوات و ئارەزوو و ویست.

دایما: دایم، هەمیشە.

یكسان نباشد: یەكسان نابێ.



گەر ماوەیەك چەرخش و دەورانی زەمانە بەپێی ئاوات و ئارەزووی ئێمەنەبوو خەفەت مەخۆ، چونكە گەردوون زەمانە گۆڕانی بەسەردا دێت و هەمیشە بەشێوەیەك نامێنێتەوە و رۆژێ دێ بەدڵی ئێمەش بسوڕێت.

لەم بەیتەدا: لە نوسخە جیاوازەكاندا لەبری (نبود) (نرفت) یا (نشد) یا(نگشت) هاتووە و لەبری (نباشد) (نماند) و لەبری (كار)، (حال) هاتووە.

**٤- گر بهار عمر باشد باز بر تخت چمن**

**چتر گل در سرکشی ای مرغ خوشخوان غم مخور**

ئەی بولبولی خۆشخوێن (دەنگخۆش) گەر بەهاری تەمەن باقی بێت، دیسان لەسەر تەختی گوڵزار دادەنیشی و چەتری گوڵ بەسەرتەوە هەڵدەدەی، غەم مەخۆ.

باز: دیسانەوە. درسركشی: ئەدەی بەسەرتدا، بەسەرسەرتەوە هەڵدەدەی.

مرغ: باڵندە. خوشخوان: دەنگخۆش، خۆشخوێن.

باڵندەی دەنگخۆش بولبولە و لێرەدا دركەیە لە (دڵ)، ئەو دیسانەوە لەبەردەوامی دڵدانەوەكەیدا دەڵێ: گەر تەمەن باقی بێت، جارێكی دیكە بەهار بێتەوە ئەی بولبول —دڵ- بەدیداری گوڵ شاد دەبێتەوە و وەك پادشا لەسەر تەختی گوڵزار دادەنیشێ و گوڵیش دەكەیتە سێبەری سەرسەرت.

**٥- ای دل ار سیل فنا بنیاد هستی برکند**

**چون ترا نوح است کشتیبان ز طوفان غم مخور**

ئەی دڵ گەر لافاوی تیاچوون بونیادی بوون هەڵكەنێت، چونكە تۆ كەشتیوانەكەت نوحە خەمی تۆفانت نەبێ.

بركند: هەڵكەنێ. كشتیبان: كەشتیوان.

ئەی دڵ، مادام كەشتیوانەكەت حەزرەتی نوحە-د.خ- ئیدی هیچ خەمت لە لافاوی تیاچوون نەبێ باوجود و بوون لەرەگ و ریشەوە هەڵكەنێ و تۆفان هەڵكات، تۆ رزگارت دەبێ. سودی نووسیویەتی: ئەگەر لافاوی فیراق تەواوی جیهان وێران كات و لەناوببات، مادام یار تا حەق مەیلی بەلای تۆوەیە خەم مەخۆ. {سودی، ج٢، ل١٥٣٠}

**٦- هان مشو نومید چون واقف نه ای از سر غیب**

**باشد اندر پرده بازیهای پنهان غم مخور**

هێی، نائومێد مەبە چونكە ئاگات لە نهێنییەكانی غەیب نییە، لەنێو پەردەدا یاری پەنهان هەیە، خەم مەخۆ.

های: هێی، ئاگاداربە، وشیاربە.

مشو نومید: نائومێد مەبە.

واقف نه ای: ئاگادارنیت، نایزانی.

بازی: یاری، رووداو کار، وەك لە سورەتی الطلاق ئایەتی (١) دا هاتووە: ((لاتدري لعل الله یورث بعد ذلك امرا)) واتە: چوزانی رەنگە دوای ئەوە خوا ئەمرێك بهێنێتە جێ و رووبدات.

هێی ئەی دڵ ئاگاداربە و نائومێد مەبە، چونکە ژیان تەنیا ئەم شتانە نییە کە ئێمە دەیانزانین و دەیانبینین و تۆش نهێنییەکانی غەیب نازانیت و لە پشت پەردەوە شتی زۆر هەیە کە روو ئەدەن و خۆشحاڵی دەهێنن، تۆ چوزانی، رەنگە خوا شتێك و ئەمرێك دەرکات کە شتەکان بگۆڕێت.

گۆران گوتەنی: بەچی مەعلوم کەچی لەو تەختی ناوچاوانە نووسراوە.

بەڵام حافظ بەهیوایەکی دیکەوە قسەدەکات کەپێی وایە چاکتر لەو تەختی ناوچاوانە نووسراوە.

**٧- در بیابان گر ز شوق کعبه خواهی زد قدم**

**سرزنشها گر کند خار مغیلان غم مخور**

کە لەبیاباندا لە تاسەی گەیشتن بەکەعبەوە هەنگاو دەنێی گەر دڕکی موغیلان ئازارت بدات خەم مەخۆ.

خواهی زد قدم: هەنگاو دەنێی (لەداهاتوودا).

سرزنش: سەرزەنشت، ئازار.

خار: دڕك.

مغیلان: درەختێکی کورتی دڕکاوییە کەلە رێگەی کەعبەدا هەیە.

(کەعبە) لەفەرهەنگی عیرفانیدا ((وجه الله و جمال الله و مقام وصل))ە، بیابانیش بیابانی عەشق و تەریقەتە لەدونیادا و دڕکی موغیلانیش مودەعی و سەرزەنشتکەرانن، سەرزەنشت ئازار و سەرزەنشتە.

واتە: ئەی دڵ کاتێ کە لەبیاباندایت و لەئارەزووی دیتنی کەعبە و دیداری کەعبەدا خەریکی هەنگاونانیت، گەر دڕکی موغیلان بچێت بە گیانتدا و ئازارت بدات، یا رەقیبان سەرزەنشتت بکەن خەم مەخۆ، چونکە کۆتایی دێت و گەیشتن بەکەعبەش لە ئەمانە زیاتر ئەهێنێ.

لە زۆربەی نوسخە نوێیەکاندا بەبری (زشوق) (بەعشوق) هاتووە.



**٨- گر چه منزل بس خطرناك است و مقصد بس بعید**

**هیچ راهی نیست كان را نیست پایان غم مخور**

گەرچی هەوارگە زۆر خەتەرناکە و شوێنی مەقسەد زۆر دوورە، هیچ رێگەیەك نییە کەکۆتایی نەبێ خەم مەخۆ.

منزل: هەوارگەی نێو سەفەر کە رێبواران هەواری تێدا دەخەن.

خطرناك: خەتەرناك، بێ ئەمن و ئاسایش. مقصد: شوێنی مەقسەد.

نیست پایان: کۆتایی نەبێ، بێ کۆتا بێ.

راستە مەنزڵی عەشق خەتەرناکە و رێگەکەش دوور و درێژە و شوێنی مەقسەد زۆر دوورە بەڵام خەفەت مەخۆ وەك هەر رێگەیەکی دیکە دوایی دێت چونکە هیچ رێگەیەك نییە کۆتایی نەبێت.

**٩- حال ما در فرقت جانان و ابرام رقیب**

**جمله می داند خدای حال گردان غم مخور**

خودای (محول الاحوال — کاربەدەستی بگۆڕی حاڵی بێ حاڵان بۆ چاکتر) لەتەواوی حاڵی ئێمە لەفیرقەتی یار و جەختی رەقیب لە سەر ئازاردانمان ئاگادارە، خەم مەخۆ.

فرقت: فیرقەت، دووری.

ابرام: اصرارکردن و پێداگرتن لەسەر ئازاردان، مات و مەلوول کردن.

جمله: هەموو، تەواوی. میداند: دەزانێت، ئاگادارە.

حال گردان: محول الاحوال، مقلب القلوب، یەکێکە لەسیفاتەکانی خودا کەحاڵی مەزڵوومان و لێقەوماوان..... چاکتر دەکات و دەگۆڕێت.

ئەی دڵ خەفەت مەخۆ لەدەست ئەوەی کە ئەمڕۆ دووری لەیار و رەقیبانیش بەردەوام ئازارت دەدەن. چونکە ئەو خودایەی کەحاڵی مەزڵوومان و لێقەوماوان دەزانێت و حاڵیان دەگۆڕێ بۆ چاکتر ئاگای لەهەموو ئەم شتانەی تۆیە و رەحمت پێدەکات.

**١٠- حافظا در کنج فقر و خلوت شبهای تار**

**تا بود وردت دعا و درس قرآن غم مخور**

ئەی حافظ لە کونجی فەقر و خەڵوەتی شەوانی تاریکیدا، تا ویردت نزا و دەرسی قورئان بێت خەم مەخۆ.

کنج: کونج، گۆشە.

فقر: فەقیری، پیویست بوون بەشتێك، هەژاری، یەكێكە لەمەقامەكانی عیرفان / تەریقـەت مەقامی فەقر پاش مەقامی زهد دێت. بێگومان فەقر بریتییـە لـە نـەمانی هۆكـار (اسـباب) ئەمەش تا رێبوار بەمەقامی زوهددا نەڕوات دڵی لـەدونیا خـاڵی نابێتـەوە و گـەر بەفـەقریش بگات و دونیایی و مەجازییە و فەقری دڵە، دوو جۆرە فـەقر/فـەقیر جیاكراوەتـەوە، فـەقرێكی نێگەتیڤی، ئەو فەقرە ماددییەی كەدڵی بەدونیاوە بەستراوە و ماددەش نییە، ئەم فەقرەیـە كـە پێغەمبەر ـ د.خ ـ دەفەرمووێ:

((اللهم اعوذبك من الكفر والفقر)) یـاخود((كـاد الفقـر ان یكـون كفـرا)) بـەڵام جـۆری دووەمی فەقر كە فەقری پۆزەتیڤییە و — لەعیرفانیـشدا ئـەم واتـای دووەم مەبەسـتە- ئـەو فەقرەیە كە دڵ لە دونیا و پێداویستییە ماددییەكان پاك دەكاتەوە و هاوپێناسە دەبێت لەگەڵ (غەنی —دەوڵەمەندی)دا بێگومان لێرەدا هەردوو زاراوەكە عیرفانین- و حەزرەتی موحەمـەد ـ د.خ ـ دەفەرمووێ:

((الفقر فخری)) هەژاری مایەی شانازی منە.

جۆری یەكەمی فەقر —نێگەتیڤی- فەقیری دڵە و حیكمەت و ئەخلاق و سەبر و ڕەزامەنـدی و تەسلیم بوون و تەوەكول لەدڵدا دەسڕێتەوە بـەڵام جـۆری دووەمـی فـەقر- پـۆزەتیڤی- مـرۆڤ لەدونیادا دەماڵێت و لەشتە بەرزەكانی نزیك دەكاتەوە.

هەروەها (ئیقبالی لاهوری) یش سەبارەت بەو دوو جۆرە (فەقر)ە دەڵێ

**بگـذر از فقری كە عریانی دهد**

**واطلب فقری كە سلطانی دهد**

واز لە فەقرێك بهێنە كە ڕەجاڵی بدات و داوای فەقرێك بكە كە بتكاتە سوڵتان.

{بەنقل ازحدیث بندگی و دلبردگی، د.عبدالكریم سروش، ص ١٦٥ }

بێگومان فەقر لەم بەیتەدا هەمان فەقری عیرفانییە، كەدەرهێنانی حەزی دونیایە لەدڵـدا و رووی دڵ وەرگێڕانە لەمەتاعی دونیا و دونیا ویستی و یەكسان بوونی دارونەداری دونیاییە.

خلوت: تەنیای، خەڵوەت. تار: تاریك، نوتەك.

ورد: ویرد، قسەیەكە كەبەردەوام دووبارە بكرێتەوە.

حافظ زۆر جار باس لەگەورەیی و دوعا و بەرەكەتی دەرسی قورئان دەكات و لێرەشدا دەڵێ: خواجە تائەوكاتەی لەخەڵوەتی دوور لەخەڵك و لەمەقامی فـەقردا بـەردەوام خـەریكی دوعـا و دەرسی قورئان بیت و بووبنە وێردی سەر زوبانت خەم مەخۆ و ترست نەبێت، چونكە ئەو دوانـە



لەو مەقامە موبارەكانەدا مایەی هاتنەدی ئاواتەكانتن، وەك ئەبو جەعفەر دەڵێ: ((وللە لایلـح عبد مؤمن علی اللە في حاجة الا قضایا لە)). {حدیث بندگی، ص ٢٠١}

یاخود گوتراوە: ((اذا دعوت فظن ان حاجتك بالباب)) {اصـول كـافی بـە نقـل از سـروش، ص٢٦٣}

هەر لەبەر ئەمەیە كە خواجە خەم ناخوات و دڵ هان ئەدات خەم نەخوات چـونكە چـەكی / هۆكاری دوعای شەوان و دەرسی قورئانی پێیە.

لەنوسخەی فریدون میرزای تیموریدا ئەم غەزەلە (١٥) بەیتە و لەپێش بەیتی تەخەلوسـەوە پێنج بەیتی دیكە هاتووە.

# غەزەلی دووسەد و پەنجا و دووەم

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفونی مەقسور**

**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلان)**

**١- دیگر ز شاخِ سرو سهی بلبل صبور**

**گلبانگ زد که چشم بد از روی گل بدور**

دووباره بولبولی سابیر لەلقی سەرووی بەژن ڕێکەوە چریکاندی: چاوی پیس ڕووی لەگوڵ بەدووربێت.

دیگر: دووبارە. شاخ: لق. سروسهی: دار سەرووی بەژنڕێك.

صبور: سابیر،خۆڕاگر، بولبول لەبەرئەوەی زستانان خۆی ڕادەگرێت و چاوەڕێی بەهار دەکات کەگوڵ بێتەوە، شاعیر بە سابیر و خۆڕاگر وەسفی کردووە.

گلبانگ: دەنگ خۆشی، ئاوازی خۆش، چریکە.

واتە: کاتی بولبولی ئارامگر و بەسەبر لەبەهاردا ڕووی گوڵی بینی و بەجوانترین شێوە جیلوەی کرد لەسەر لقی دار سەروویەکی بەژنڕێکەوە بەئاوازی خۆش چریکاندی، چاوی پیس لەم ڕووە جوانەی گوڵ بەدوور بێت.

**٢- ای گل به شکر آن که تویی پادشاه حسن**

**با بلبلان بی دل شیدا مکن غرور**

ئەی گوڵ بەشوکرانەی ئەوەی کە تۆی پادشای جوانی، لەگەڵ بولبولانی بێدڵی شەیدادا مەغرور مەبە.

مکن غرور: مەغرورمەبە، تەکەبورت نەبێ، فیزو خۆبەگەورەزانینت نەبێ.

لێرەدا گوڵ یار و بولبولانی بێ دڵ –عاشق / دڵڕفێنراو-ی شەیدا و بێقەراریش عاشقانن. خواجە بەیار دەڵێ ئەی یار /گوڵ هەر بەشوکرانەی ئەوەی کەخوا ئەو نیعمەتەی پێداوی و کردوویتی بە پاشای جوانی لەگەڵ عاشقانی دڵڕفێندراوی بێ قەرار و شەیدادا مەغرور مەبە و تەکەبورت نەبێت.

**٣- از دست غیبت تو شکایت نمی کنم**

**تا نیست غیبتی نبود لذّتِ حضور**

شکات لەدەست دیارنەبوون (غەریب بوون) ی تۆناکەم، چونکە تا (غیبت) و دووری نەبێت لەزەتی پێکەوەبوون هەست پێناکرێ.



ازدست: لەدەست، لە.

غیبت: دیارنەبوون، لەنێودانەبوون، دوورکەوتنەوە و غەیب بوون.

بێگومان هەرشتێك بەدژەکەی دەناسرێتەوە، خواجەش لێرەدا سوود لەم لۆژیکە وەردەگرێ بۆ پاساودانەوە و دڵی خۆ ڕازی کردن لەنەبوون و دووری یار، ئەو دەڵێ شکات لە دووری و لەوەی کە لەلام نیت ناکەم و لێی وەڕس نیم، چونکە تائەم دووریە نەبێت هەست بە لەزەتی پێکەوەبوون و ئامادەیی ناکەین.

جگە لەم واتا ڕووکەشە (غیبت و حضور) ڕوو زاراوەی عیرفانین، غەیبەت ڕوو وەرگێڕانە لە جگە لەحەق و سێ پلەی هەیە:

١- غەیبەتی موزید لە ماسوی الله – جگە لەخوا- و ڕووکردنەحەق.

٢- غەیبەت لە دابونەریت و بنەماکانی زانست و بەهۆی زۆری حاڵەوە، واتە دڕاندنی پەردەی زانست و گەیشتن بە (وجدانی حال) چونکە زانست گەورەترین پەردەیە لە بەردەم غەیبەتدا.

٣- غەیبەتی مورید لەحاڵەکانی خۆشی و لەخۆشی لەم پلەیەدا تەواوی دابونەریت و تەنانەت و خود و... هتدی مورید لەحەقدا دەتوێتەوە.(سجادی)

بەڵام حزور بریتییە لە ئامادەیی و حازربوون لە حەقدا، غەیبەت قۆناغی بەر لەحزورە. واتە غەیبەت دوورکەوتنەوەیە لەغەیری خوا و حضور ئامادەگییە لەحەقدا، هەرکاتێ بگوترێ فلان لەحضور دایە واتە بەدڵی خۆی لەبەردەم خودای خۆیدا حازرە.

گەر لەسەر ئەم بونیادە بەیتەکە لێکدرێتەوە بەم شێوەیە:

لەدەست غەیب بوونی تۆ شکات ناکەم، تا مرۆڤ قۆناغی غەیبەت /دووری لە (ماسوی الله) تەی نەکات هەست بەتام و چێژی حزور ناکات، واتە تا ئەوکاتەی دڵ لەغەیری خوا پاکنەبێتەوە ناتوانێ چێژلە حزوری لەبەردەم خوادا وەرگرێت.

بێجگە لەمەش هەندێك لەعارفەکان پێیان وایە مانەوە لە (غەیبەت)دا و نەگەیشتن لە (حضور).

لەزەت بەخش ترە چونکە لە (حضور) دا دڵەراوکێ و ترسی لەدەستدان هەیە بەڵام لە(غەیبەت) دا هەمیشە ئومێدی (حضور) نزیکبوونەوە هەیە.

هەروەك لە (هفت اورنگ) ی (جامی) دا هاتووە:

**محنت قرب ز بعد افزونست**

**جگر از هیبت قربم خونست**

**هست در قرب هم بیم زوال**

**نیست در بعد جز امید وصال**

**آتش بیم دل و جان سوزد**

**شمع امید دوان افروزد**

جامی پێی وایە کە مەینەتی و خەفەتی نزیکی لەدووری زیاترە، چونکە لەنزیکیدا بەردەوام ترسی لەدەستدان هەیە و کەچی لەدووریدا تەنیا ئومێدی بەیەکگەیشتن هەیە، بۆیە ئاگری ترسی لەدەستدان دڵ وگیان ئەسووتێنێ بەڵام مۆمی ئومێد گیان ڕووناك دەكاتەوە.

بەهەرحاڵ خواجەش لەگەڵ (غەیبەت) دایە و پێیوایە بەبوونی غەیبەت- (حزور) لەزەت بەخشترەبێ بۆیە گلەیی لەغەیب بوونی یار ناکات.

**٤- گر دیگران به عیش و طرب خُرَّمَند و شاد**

**مارا غم نگار بود مایەی سرور**

گەر خەڵکانی تر بەعەیش و تەرەب شاد و خۆشحاڵن، غەمی یار بووەتە مایەی شادی ئێمە.

دیگران: خەڵکانی تر، ئەوانی دیکە.    خرمند: خۆشحاڵن، شادن.

سرور: شادی، خۆشحاڵی.

گەر کەسانی دیکە بەهۆکارەکانی خۆشحاڵی (کەلێرەدا ئەکرێ سەماع و حاڵی دەروێشان بێت) شاد و خۆشحاڵن، ئێمە تەنیا بە عەشقی یار خۆشحاڵین و تەنیا ئەو خەمە ئەبێتە مایەی شادی و سرورمان.

ئەکرێ لێرەدا ئەو مانایە هەڵێنجرێ کە خواجە زیکر و عەشقی بێدەنگی سۆفییانە (وەك تەریقەتی نەقشی) لەحاڵ و سەماعی دەروێشانە وەك قادری، بەچاکتر ئەداتە قەڵەم، گەر ئەوان بەو عەیش و تەرەبەوە لەقورب و حزور دان و مایەی سەروەرییانە ئەم غەیبەت و غەمی دوورییەش مایەی شانازی ئێمەیە.

**٥- زاهد اگر به حور و قصور است امیدوار**

**مارا شرابخانه قصور است و یار حور**

ئەگەر زاهید بەحۆری قەسر و قسور ئومێدەوارە، شەرابخانە قەسر و قسوری ئێمە و یاریش حۆریمانە.

حور: حۆری.    قصور: قسور، جەمعی قەسرە، باڵەخانەکان.

ئەگەر زاهید بەو ئومێدەوارە کەلەبەهەشتدا باڵەخانەی بەرز و حۆری جوانی پێدەدەن، لای ئێمە مەیخانەی عەشق قەسر و قسورە و یاری حەقیش حۆریمانە.



واتە: لای ئێمە ئامانج باڵەخانە و حۆرییەکانی بەهەشت نییە، بەڵکو ئامانجمان یاری حەق و عەشقی یاری حەقە ـ جل جلالەـ.

**٦- مِیْ خور به بانگِ چنگ مخور غصّەورکسی**

**گوید ترا که باده بخور گو هُوَالغَفور**

بەدەنگی چەنگ (ساز)ەوە شەراب بنۆشە و غەم مەخۆ، وەگەر کەسێکیش پێی گوتی بادە مەنۆشە بڵێ هو الغفور.

ور: وەگەر.    گوید ترا: پێت بڵێ.    گو: بڵێ.

الغفور: بەخشندە، غەفار و غەفور.

بەدەنگی مۆسیقاوە مەی بنۆشە و هەرگیز خەفەت مەخۆ، واتە هەمیشە بەئاوازەوە خەریکی عەشقی حەقیقی بە و خەم مەخۆ و هەرکەسیش پێی گوتی واز لەم مەینۆشی/ عەشقە بهێنە خوا گوناهان دەبەخشێت کە فەرموویەتی ((ان الله یغفر الذنوب جمیعاً انه هو الغفور الرحیم)) سورەتی الزمر ئایەتی ٥٣.

**٧- حافظ شکایت از غم هجران چه می کنی**

**در هجر وصل باشد و در ظلمت است نور**

حافظ شکاتی چی لەدەست غەمی دووری دەکەیت، لە دووریدا پێکگەیشتن و لە تاریکیدا نور هەیە.

شکایت چه می کنی: شکاتی چی ئەکەی، بۆچی شکات ئەکەی.

ظلمت: تاریکی

ئەم بەیتە دووبارە کردنەوەی بەیتەکانی پێشوو بەتایبەتی بەیتی سێیەمە، خۆی ئاگادار دەکاتەوە، کە حافظ بۆچی شکات لە غەمی هیجران و دووری یار دەکات، نازانی کە وەسڵ و دیدار لە دووریدایە هەروەك چۆن ڕووناکی لەنێو تاریکیدایە و ڕۆژ لەنیو شەوەوە هەڵدێ.

## غەزەلی دووسەد و پەنجا و سێیەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی مەقسور**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلان)**

**١- نصیحتی کنمت بشنو و بهانه مگیر**

**هر آنچه ناصح مشفق بگویدت بپذیر**

نەسیحەتێکت دەکەم گوێ بگرە و بیانومەگرە، ئەو شتەی کە ئامۆژگاریکەری میهرەبان پێت بڵێت قەبوڵی کە.

نصیحتی کنمت: ئامۆژگارییەکت دەکەم، نەسیحەتێکت دەکەم. بهانه مگیر: بیانومەگرە.

آنچه: ئەوشتەی، ئەوئامۆژگارییەی. ناصح: ئامۆژگاریکەر، ناسیح.

مشفق: میهرەبان. بگویدت: پێت بڵێت. بپذیر: وەرگرە، قەبووڵکە.

خواجە بەکەسی دووەمی تاك /گوێگرەکەی دەڵێت، ئامۆژگارییەکت دەکەم گوێگرە و بیانومەهێنەرەوە کەگوێ نەگری و هەڵبێی — ئامۆژگارییەکەش ئەمەیە کە ئامۆژگاریکەری میهرەبان- مورشید- هەرچی پێ وتی یەکسەر بەگوێ بکە و وەریگرە.

**٢- ز وصل روی جوانان تمتعی بردار**

**که در کمینگه عمر ست مکر عالم پیر**

سوودێك لە وەسڵی رووی جوانان وەرگرە، چونکە فێڵی دونیایی پیر لە بۆسەدایە تەمەن و ژیانت.

جوانان: لاوان، جوانان.

تمتعی بردار: بەهرەیەك وەرگرە، سوودێك وەرگرە، چێژێك وەرگرە.

عالم پیر: پیرەدونیا، دونیای پیری مەکرباز.

ئەمە ئەو نەسیحەتانەیە کە ئامۆژگاریکەری میهرەبان دەیانکات: لەژیاندا سوود لەڕووی جوانان و عەشقی جوانان وەرگرە چونکە پیرە دونیای مەکرباز لە بۆسەدایە بۆ گیانی شیرینت و ڕەنگە نەهێڵێ سبەینێ ببینیت.

**٣- نعیم هر دو جهان پیش عاشقان بەجوی**

**که این متاع قلیل سیت و آن عطایِ حقیر**

بەخششەکانی هەردوو دونیا لای عاشقان بەجۆیەك، چونکە ئەم (متاع قلیل)ە و ئەویش بەخششێکی بێ نرخ.



نعیم: نیعمەت، بەخشش. بەجوی: بەجۆیەك، واتە هێندەی دەنکە جۆیەك بەهای هەیە. متاع قلیل: شتی کەم، کاڵای کەم بەها (مەبەست لە دونیا) لەقورئانی پیرۆزدا چەندین جار دونیا بەکاڵای کەم بەها (متاع قلیل) وەسفکراوە وەك: لەئایەتی (٧٧/نساء) دا هاتووە ((...قل متع الدنیا قلیل...))
حقیر: بێ نرخ، بێ بەها.

لەڕاستیدا لەدیاریکردنی (این و ان) دا جیاوازی لەنێوان نوسخەکان و ڕاڤەکاراندا هەیە.

لەهەندێ نوسخەدا لەبری (عطای کثیر) (عطای حقیر) و(بهاي کثیر)هاتووە، جێگۆڕکێش بەشوێنی (این وان) کراوە.

جێگۆڕکێ کردن بە این و ان هیچ کێشەیەك دروستناکات، بەڵام (حقیر و کثیر)ە کە جیاوازی دروستدەکات.

لەزۆربەی نوسخە دێرینەکاندا (حقیر) هاتووە و (د.هروی) کەئەم جۆرە ساغکردنەوەیەی پێ ڕاستە پێی وایە مەبەست لە(این متاع قلیل) (جۆیەك)ەیە ومەبەست لە (ان عطای حقیر)یش نیعمەتەکانی هەردوو جیهانە {ج٣، ل١٠٦٥ }

سودی کە جێگۆڕکێ بەشوێنی (این و آن) کردووە پێیوایە کە نیعمەتی هەردوو جیهان (متاع قلیل)ە و عەشقی یاریش (بهای کثیر)ە. چونکە لەسودیدا مەسرەعی دووەم بەم شێوەیە:

**که آن متاع قلیل است و این بهای کثیر** { ج٣، ل١٥٢٢}

د.خطیب رهبر و د.معینیانیش ـ هەروەك سودی ـ پێیان وایە (این متاع قلیل) نیعمەتەکانی دونیا و ئاخیرەتن و (ان عطای کثیر)یش عەشقی ئیلاهییە. {خطیب رهبر، ل٣٤٧}.

لە خطیب رهبر و د.معینیان دا- کەنوسخەی ئەسڵی ئەوان خلخالی/ قزوینی یە — بەم شێوەیە: این متاع قلیل است و ان بهای کثیر.

لاهوری بە شێوەیەکی دیکە شەرحی (این و آن)ی کردووە.

لەڕاستیدا لەلاهوریدا هەردووکیان (این) نووسراوە بەم شێوەیە:

**که این متاع قلیل و این بهای کثیر**

لاهوری پێی وایە کە (کە)ی میسراعی دووەم بەواتای بەڵکو دێت لە شەرحی میسراعی دووەمدا نووسیویەتی: بەڵکو ئەم کاڵایە کەمە و ئەم بەهایە- دوو دەنکەجۆ- زۆرە. {ج٣،ل١٧٥٨}

واتە: نیعمەتەکانی هەردوو جیهان هێندەکەمە کە ئەگەر بەدوو جو بۆ یا دەنکە جۆیەکیش بیکڕیت هەر زەرەر دەکەیت، بۆیە عاشقان ئەم نیعمەتانەی هەردوو جیهان بەدەنکە جۆیەك / یا دوو دەنکە جۆ نایکڕن.

لێرەدا بەندە پەیڕەوی لە نوسخەدێرینەکان کردووە لەم ساغکردنەوەشدا، وەك ـ د.هەروی ـ ئاماژەی پێدراوە واتاکەی بەیتەکە بەم شێوەیەیە:

عاشقان نیعمەت و بەخششەکانی هەردوو جیهان بەدەنکە جۆیەك ناکڕن، کەئەم دەنکە جۆیە کالآیەکی کەمە، بەلآم ئەو بەخششەی هەردوو جیهان (لەچاو خودی مەعشوقی حەقدا) نیعمەت و بەخشیشێکی کەم و بێ بەهایە. لەڕاستیدا عارفەکان لەچاو خودی حەقدا نیعمەتی دونیا و ئاخیرەت بەهیچ دەزانن و چاویان لێی نییە، یانی نابێ چاویان لێی بێ وەك سەعدی شیرازی، دەڵێ:

**خلاف طریقت بود که اولیا**

**تمنا کند از خدا جز خدا**

**اگر ساز دوست چنین برافتاد اولی**

**تو دربند خویش نه دربنددوست**

***************

**٤- معاشری خوش و رودی بساز می خواهم**

**که درد خویش بگویم بەنالەی بم و زیر**

هاودەمێکی خۆش و سازێکی ئامادەکراوم دەوێ تا دەردی خۆم بەناڵەی ناسك و گڕ بڵێم.

معاشری: هاودەمێکی. خوش: خۆش، خۆشڕەفتار، خۆشی مەشرەب، لەڕاستیدا لەزمانی کوردیشدا شێوەزاری جاف (خۆش) دەگوترێت بۆ نمونە (فلان کەس خۆشە) واتە ڕەفتارجوانە و خەڵکی لەگەڵیدا هەست بەبێزاری و بێ تاقەتی ناکات کەلەبەیتەکەشدا هەمان ئەم واتایەی هەیە.

رود: جۆرە سازێکی ژێداری وەك ساز و عود و کەمانچەیە.

بساز: ئامادەکراو.

بم و زیر: گرۆناسك، گرۆتیژ کە سیفەتی دەنگی مرۆڤن و زاراوەی مۆسیقین، هەرچەندە ئێستا لەزانستی (فۆنۆلۆژی) سوودیان لێ وەردەگیرێت و سیمای دەنگ و قسەن و بە فۆنیمی ریز (***suprasigmental***) ناسراون.



ئێستاکە دەردی عەشقم هەیە، هاودەمێکی خۆش مەشرەب و سازێکی ئامادەکرا و کۆکم دەوێت تا بەناڵەی ناسك و گڕی گۆرانی / سروود دەردی خۆم بەیان کەم. لەڕاستیدا ئەم بەیتە لەسەماعی مەحرەمانەی دەروێشان ئەدوێ چونکە بنەماکانی سەماعی تێدایە و خواجە مەحرەمێکیشی دەوێت تا لەو سەماعەدا رازەکانی خۆی کەعەشقی یارە بدرکێنێ.

**٥- چو قسمت ازلی بی حضور ما کردند**

**گر اندکی نه به وفق رضا است خرده مگیر**

مادام – چون- بەبێ ئامادەیی ئێمە لەئەزەلدا قیسمەت و چارەنوسیان دابەشکرد، گەر کەمێکیش بەپێی رەزامەندی ئێمە نییە رەخنە مەگرە.

قسمت: دابەشکردن، قیسمەت و چارەنووسی دابەشکردن بی حضور: بێ ئامادەیی.

بەوفق: بەپێی، بەئارەزووی، بەدڵی. رضا: رەزامەندی.

خردەمگیر: رەخنەمەگرە، تانەمەدە.

بێگومان ئەوکاتەی کە خوا لەئەزەلدا چارەنووسی لە نێو چاوانی ئێمە نووسی و قیسمەتمان لەژیاندا -چ دونیا و چ ئاخیرەت- دیاریکرا خۆمان لەوێ نەبووین ئیدی گەر هەندێکیش بەدڵی خۆمان نەبوو، بەپێی رەزامەندی خۆمان دیاری نەکرابوو، رەخنەمەگرە و تانەمەدە.

ئەم بەیتە لەلایەکەوە ئاماژەیە بەمەشرەبی جەبرییانەی خواجە کە بڕوای وایە قیسمەت و نسیبمان هەرلە ئەزەلەوە لەنێوچاوانی نووسراوە لەلایەکی دیکەشەوە ئاماژەی بە مەقام رەزا- رەزامەندی— چونکە رێبوار لەم تامەدا بەهەموو شتێکی مەحبوب و مەعشوق رازییە، لێرەدا خواجەش دەڵێ رازی بە و مەکەوە تانەدان.

**٦- بە عزم توبە نهادم قدح ز کف صدبار**

**ولی کرشمەی ساقی نمی کند تقصیر**

بەنیازی تۆبە سەدجار پێکم لەدەست دانا، بەلآم نازی ساقی تەقسیر ناکات.

بەعزم: بەنیازی، بە نییەتی. نهادم قدح زکف: پێکم لەدەست دانا، پێکم فڕێدا.

بار: جار. تقصیر: تەقسیر.

نمیکند تقسیر: وچان نادات.

بەنیەتی ئەوەی کەتۆبە بکەم لەعەشق / مەینۆشی وازبێنم سەد جارپێکی شەرابم لەدەست فڕێدا، بەلآم کریشمە و نازی ساقی / یاری حەق وچانی ئەوەنادات کە وازبێنم و دیسان دەگەڕێمەوە سەر مەینۆشی واتە: ئەوەی کەناهێڵێ واز لەمەینۆشی بهێنم و تۆبە بکەم نازی ساقی / جیلوەی جەمالی یاری حەقە.

**٧- چو لاله در قدحم ریز ساقیا می و مشك**

**كه نقش خال نگارم نمی رود ز ضمیر**

ئەی ساقی وەك لالە- كە لە پێكی خۆیدا شەرابی سوور و میسكی رەشی هەیە- مەی و میسك بكە پێكەكەوە، چونكە وێنەی خاڵی یارم لەدڵ دەرناچێت.

درقدم ریز: بكەپێكەكەوە. ضمیر: دڵ.

خواجە لەم بەیتەدا سێ جار و بەسێ شێوەی جیاواز و سەرنجڕاكێش رەنگی سوور و رەشی تێكەڵاو كردووە.

یەكەمیان پەڕی گوڵاڵەیە كەلەشێوەی پێكدایە و هەمووی سوورە و خاڵێكی رەش لە ناوەڕاستیدایە، دووەمیان تێكەڵاوكردنی شەرابی سوور و میسكی رەشە- كەجاران بۆ بۆنخۆشی و تامخۆشی میسك دەكرایە شەرابەوە- سێیەمیان خاڵی رەشی یار و دڵی خوێنینی سووری خواجەیە.

بۆیە دەڵێ: ئەی ساقی مادام وێنەی خاڵی رەشی یارم لەدڵمدا ناسڕێتەوە، وەك لالە كە پێكەكەی خاڵێكی رەشی تێدایە، پێكەكەی منیش پڕ لە شەرابی میسكبار بكە بابیخۆمەوە.

واتە: مادام هەرچی ئەكەم خاڵی یارم لەدڵ دەرناچێ شەرابی میسكبارم بۆ تێكە بابیخۆمەوە و مەست بم.

لەنوسخەی (پنجاب) (خلخالی) دا لەپاش ئەم بەیتە بەیتی.

**نگفتمت كە حذركن ز زلف او ای دل**

**كە می كشند درین حلقە باد در زنجیر**

ئەی دڵ پێم نەگوتی حەزەر لەپرچی ئەو بكە، چونكە لەم ئەڵقە(ی پرچە) دا تەنانەت باش زنجیر دەكەن.

بەڵام لەبەرئەوەی لەتەواوی نوسخە دێرینەكان و نوسخە نوێیە باوەڕپێكراوەكانی وەك عیوضی، قزوینی /غنی، خرمشاهی...هتددا نەهاتووە و لەبەیتی هەشتەمیشدا(زنجیر) بووەتە بەقافیە، ئێمە لێرەدا نەمان هێناوە، هەرچەندە لەڕووی وردی و ماناوە لەبەیتی خواجە دەچێت.

**٨- دل رمیدەی ما را كە پیش می گیر د**

**خبر دهید بە مجنون خستە از زنجیر**

كێ بەردەمی دڵی هەڵاتووی ئێمە دەگرێت (یا رێنمونی دەكات)، خەبەر بدەن بەمەجنونی ماندوو لەزنجیر.

رمیدە: هەڵاتوو، راكردوو. كە: كێ.



پیش میگیرد: پێشی لێ دەگرێ یا بەردەمی دەگرێ و رێنمونی دەكات

خستەاز زنجیر: ماندووی زنجیر، بریندارى دەستى زنجیر.

خواجە خۆی بەمەجنونی زنجیری زوڵفی یار لەگەردەن و جەستە و پێ دەزانێت و دەڵێ:

من كەوەك مەجنون زنجیر كراوم و بریندارى نێو زنجیری زوڵفی یارم، هەنووكە دڵم هەڵاتووە و رۆیشتووە، كێ ئەتوانێ بەدەمی بگرێ و دەستگرۆیی بكات، خەبەرم بدەنێ (منی مەجنون ئاسای خەستە و كەنەفت لەزنجیر).

یاخود وەك (د.خرمشاهی) لە حافظ نامەدا هێناویەتی: دڵی دێوانەم جڵەوی پساندووە و لە من هەڵاتووە.

ئێستا كێ ئەتوانێ جڵەوداری بێت لەپێشیەوەبڕوات ؟ هیچ كەس، بۆیە هەواڵبدەن بە مەجنون كە لەزنجیر ماندوو (رزیو بریندار) كەسەری منە و زنجیرەكەی بۆ جڵەوگرتنی دڵم بەمن بدات. {خرمشاهی، ج٢، ل٨٣٤ }

د.هروی نووسیویەتی چونكە مانایەكی مەعقوڵ بۆ پەیدا نەكرد ناچار شێوەی سودی (جستە از زنجیر: هەڵاتوو لە زنجیر)م هەڵبژارد. {هروی، ج٢، ل١٠٧٠}

میسراعی دووەم لە (سودی) دا بەم شێوەیە:

**خبر دهید ز مجنون جستە از زنجیر**

واتە: لەبارەی مەجنونی هەڵاتوو لەزنجیرەوە هەواڵم بدەنێ یاخود هەواڵی مەجنونی هەڵاتوو لەزنجیرم بدەنێ.

**٩- بیار ساغر یاقوت و دُر فیض خوشاب**

**حسود گو كرم آصفی ببین و بمیر**

پێكی یاقوتی و گەوهەری فەیزی ئاودار بهێنە و بە حەسوود بڵێ كەرەمی ئاسەفی ببینە و بمرە.

خوشاب: ئاودار، تێراو.

در خوشاب: مرواری ئاودار، مروارییەك كە دڵۆپەی ئاو لەناویدابێت بلەرزێ /بجووڵێ. {هروی، ج٢، ل١٠٧٠}.

حسود گو: بڵێ بە حەسوود. آصف: ئاسەفی بەرخیا، وەزیری حەزرەتی سولەیمان.

بمیر: بمرە.

ئەی ساقی تۆ شەرابی یاقوتینی ئاودار لەپێكی یاقوتیندا بهێنە و لەوكاتەشدا كەئەیدەیت بەدەستمانەوە بەحەسوود بڵێ سەیری بەخشش و كەرەمی ئاسەفی (جوامێری وەزیری) بكە و لەداخانا بمرە.

لەڕاستیدا ئەم بەیتە- تەواوی غەزەلەکەش — بەچەندین جۆر ساغکراوەتەوە.

لەو نوسخانەی کە لە (خلخالی) وەرگیراون میسراعی یەکەم بەم شێوەیە:

**بیار ساغر در خوشاب ای ساقی**

لەنوسخەکانی دیکەشدا بەم شێوەیە:

**بیار ساغر یاقوت فیض در خوشاب** ـ سودی

**بیار ساغر یاقوت خام در خوشاب** ـ لاهوری

**١٠- می دوو ساڵە و محبوب چاردە سالە**

**همین بس است مرا صحبت صغیر وکبیر**

مەیی دوو ساڵە و مەحبوبی چواردەساڵە، ئەم دوانەم بەسە لەهاوەدەمی بچووك و گەورە.

چاردە/چهاردە: چواردە.

لەکۆندا پێیان وابووە کە شەڕاب بەدوو ساڵ بەتەواوی خۆش دەبێت، بۆیە شەڕابی دوو ساڵە چاکترین شەڕاب بووە.

خواجە لێرەدا دەڵێ: من گەر شەڕابی پیری دووساڵە و یاری منداڵی چواردەساڵانم هەبێ هەرئەم دوانەم لەهاوەدەمی گەورە- شەڕابی پیر-و بچووکی یاری چواردەساڵان-بەسە و پێویستم بەکەسی دیکە نییە.

لەڕاستیدا هەندێك لەراڤەکاران(چاردە)ەیان بە(چوار x دە) لێکداوەتەوە کە ئەکاتە (چل) و ئەم چلەشیان بەتەمەنی پێغەمبەری حەزرەتی موحەمەد ـ د.خ ـ یان تەمەنی کەماڵی مورشید لێکداوەتەوە و مەی دوو ساڵەشیان بەقورئانی پیرۆز لێکداوە کە بەدووجار دابەزیوە، جارێك بۆئاسمانی یەکەم بەتەواوی و پاشان بەپێی پێویست و پچڕپچڕ بۆ سەرگیانی حەزرەتی موستەفا ـ د.خ ـ {بڕوانە لاهوری ج٣، ل١٧٦٠} هەروەها د.هروی خرمشاهیش ئاماژەیان بەبوونی ئەم جۆرە لێکدانەوەیە داوە.

بەڵام نەبەیتەکە ئەم تەئویلە هەڵدەگرێت و نەئەم جۆرە تەئویلەش لەگەڵ نەسەقی گشتی بیری نێو غەزەلەکانی حافظدا یەکدەگرێتەوە.

بەهەرحاڵ، پێچان و کردنەوەی ناڕێك —لف و نشری نامرتب- لەبەیتەکەدا هەیە و (صغیر) بۆ (محبوبی چواردە ساڵ) و(کبیر) بۆ (مەیی دووساڵە) دەگەڕێتەوە وەك هەمیشە خواجە تەنیا یاری منداڵ و شەڕابی عەشقی پیرە ساڵ دەکاتە هاودەم وهاوڕێی.



**١١- بر آن سرم که ننوشم می و گنه نکم**

**اگر موافق تدبیر من رود تقدیر**

نیازم وایە کەمەی نەنۆشم و گوناە نەکەم ئەگەر قەدەر هاوئاراستەی ئەم بیرەی من بێتەوە.

برآن سرم: ئەونیازەم هەیە، نیازم وایە.

گەر قەدەر و چارەنووس هاوئارستەی ئەم تەگبیرەی من بێتەوە و لەگەڵیدا ڕێکەوێ — کەرێك ناکەوێ — نیازم وایە ئیدی واز لە مەینۆشی و گوناهکردن بهێنم.

**١٢- حدیث توبه درین بزمگه مگو حافظ**

**که ساقیان کمان ابرویت زنند به تیر**

حافظ لەم یەدا باسی تۆبە مەکە، چونکە ساقییانی برۆکەوانی تیرت تێ ئەگرن.

بزمگە: شوێنی بەزم و شادی، بەزمگە.

خواجە بەخۆی دەڵێ: لەم کۆڕی بەزم و سەفای عەشقەدا باسی تۆبەکردن لەشەراب و مەی و عەشق نەکەی، چونکە گەرباسی کەی ساقیانی برۆکەوانی بەکەوانی برۆیان تیری غەمزە و نازت تێ ئەگرن و سەرلەنوێ تۆبەکەت دەشکێتەوە و سوودی نییە.

## غەزەلی دووسەد و چل و پێنجەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسڵەمی موسبەغ**
**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**١- روی بنمای و مرا گو که ز جان دل برگیر**
**پیش شمع آتش پروانه به جان گو درگیر**

رووت دەرخە و بەمن بڵێ کەدەست لەگیان بشۆ، لێگەڕێ با لەبەردەم رووتدا ئاگری پەروانە بەربێتە گیانم.

مراگو: بەمن بڵێ، پێم بڵێ. دل برگیر: دەستی لێ بشۆ.

پیش: لەبەردەم.

آتش پروانه: ئاگری پەروانە، سووتانی وەك سووتانی پەروانە لەبەردەم مۆمدا، مەبەست لە سووتانی عاشقانەیە.

درگر: بیگرێت، بەربێتە، کەلێرەدا مەبەست لەئاگرتێ بەربوون یا ئاگر گرتنە.

خواجە بەیار دەڵێ: جیلوە بکە و رووی خۆت دەرخە تاگیانم بەخت بکەم و دەستی لێ بشۆم، هەر لەگەڵ دەرکەوتنی رووی وەکو مۆمتدا ئاگری پەروانە (پەروانە ئاسا کەلەبەدەم رووی مەعشوق / مۆمدا دەسووتێ و ئاگری دەگرێ) بەو دەمەگیانم و خۆم بکەمە قوربانی مۆمی رووت. میسرەعی دووەم شەرحی دەست شوشتنە لە گیان.

**٢- در لب تشنەی ما بین و مدار آب دریغ**
**به سر کشتەی خویش آی و ز خاکش برگیر**

سەیری لێوی تینوی ئێمە بکە و درێغی لەئاو (پێدانمان) مەکە، وەرەسەر کوژراوی خۆت و لەخاك بەرزی کەرەوە.

تشنە: تینو. در: لێرەدا بەواتای (لە) دێت، بۆنموونە: لەلێوی تینوی ئێمە بڕوانە.

مداردریغ: درێغی مەکە، قەدەغە مەکە. کشتە: کوژراو.

آی: وەرە. برگیر: هەڵی گرە، بەرزی کەرەوە.

ئەی یار ئێمە کە تینووی دیداری تۆین و لێومان وشك بووە و کوژراوی عەشقی تۆین و کەوتووینەتە سەرخاك، سەیری لێوی وشك هەڵاتومان بکە و درێغی لەئاوپێدانمان مەکە و وەرە سەر جەستەی کوژراومان و لەزەویمان بەرزکەرەوە.



**٣- ترک درویش مگیر ار نبود سیم و زرش**
**در غمت سیم شمار اشك و رخم را زرگیر**

واز لە دەروێش مەهێنە گەر زێڕ و زیوی نەبوو، ئەو فرمێسکەی لەغەمتدا دەیڕژێم بەزیو و رووی زەرد هەڵگەراویشم بەئاڵتون حسێب بکە.

ترك مگر: تەرکی مەکە، وازی لێ مەهێنەز

سیم و زر: زیو و ئاڵتون.

شمار: بژمێرە، بیدەقەڵەم. زرگیر: بەزێری دانێ، بەزێر بیدەقەڵەم.

ئەی یار لەبەرئەوەی عاشقان کەم دەستن و زێڕ و زیویان نییە، وازیان لێ مەهێنە، چونکە منی دەروێش و عاشق لەتاوغەمی دووریت زۆر گریاوم و فرمێسکم رژاندووە و رەنگە زەرد هەڵگەڕاوە ئەو فرمێسك و رەنگ زەردییەم بەزیو و زێڕ بدەقەڵەم وازم لی˚مەهێنە.

**٤-چنگ بنوازد بساز ار نبود عود منال**
**آتشم عشق و دلم عود و تنم مجمر گیر**

چەنگ بژەنە و ئاوازێ لێدە، گەر (بخور) نەبوو گوێ مەدەرێ و مەناڵێنە عەشقم ئاگر و دڵم مەجبور و جەستەم بەمەقەڵی حسێب بکە.

بنواز: لێ دە، بژەنە. بساز: سازلێدە، مۆسیقا بژەنە، هەر جۆرە مۆسیقا ژەندن و ئاواز لێدانێکە {هروی، ج٣، ل١٠٧٣}.

عود: بخورد، ماددەیەکی بۆنخۆشە کە دەخرێتە ئاگرەوە بۆنی خۆش بڵاودەبێتەوە.

منال: مەناڵێنە، خەفەت مەخۆ/ گوێ مەدەرێ (لەهەندێ نوسخەدا قزوینی، (سودی) دا چەنگ هاتووە).

تن: جەستە.

مجمر: مەقەڵی، ئاگردان.

ئەم بەیتە وەك بەیتی پێشوو ئامادەیی خواجە پیشانئەدات بۆ جیلوەی یاری حەق، دیسان دەڵێ: گەر خەڵوەتگەی من بۆ جیلوەی رووی تۆ دەست نادات ئاوازێکی جیلوە لێدە و چەنگی جیلوەی بژەنە خەمی خەڵوەتێکی شاهانەت نەبێ چونکە عەشقم ئاگرە و جەستەم مەقەڵی و ئاگردان و دڵیشم ئەخەمەنێو ئەم ئاگرە و تالەبری بخورد بسووتێ و کۆڕەکە بۆنخۆش بکات.

یاخود ئەکرێ ئەم بەیتە جۆرە ئامادەییە، خۆئامادەکردن بێت بۆ سەماع وەك لەبەیتی پێنجەمدا باسی دەکات.

**۵- در سماع آی و ز سر خرقه برانداز و برقص**
**ورنه با گوشه رو و خرقەی ما درسرگیر**

بکەوە سەماع و خیرقەکەت لەبەر داکەنــە و ســەما بکــە، وەگــەرنا بــڕۆ گۆشــەیەکەوە و خیرقەکەی ئێمە بدە بەسەر خۆتدا.

درسماع آی: بکەوە سەماع، وەرەسەمای دەروێشانە.        برازنداز: داکەنە.

باگوشەرو: بڕۆ گۆشەیەکەوە، بڕۆ کەنارەوە.        درسر گیر: بدە بەسەرتدا.

خواجە بەکەسی سێیەمی تاك کە (سۆفی)یە و وەك لەبەیتی دوایدا دیار دەکەوێت و دەڵێـت: بکەوە سماعی دەروێشانە ـ پێشتر بە درێژی لەسەماع دواوین- و لەکاتی سـەمای دەروێـشانەدا خیرقەکەت لەبەرداکەنە- بێگومان خیرقە وەك جلی مەلایانە یا مەکسی و دشداشـە لەسـەرەوە دائەکەنرێت نەك وەك کراسی پیاوانەی ئـەمڕۆژگارە، گـەر ئـەهلی ئـەم سـەماعەش نیـت بـڕۆ کەنارەوە و خیرقە لەبەرداکەنراوەکی ئێمە بدە بەسەرتدا و  رووت داپۆشە.

د.هروی پێی وایەکە(برقصە سەمابکە) دووبارەیە و بەجۆرێك نەنگە، چونکە (درسماع آی) یشی بـە سـەمابکە شـەرح کـردووە و بۆیـە (بـرقص)ی کـردووە بـە(بـەرقص — لـە کـاتی سەماکردندا، بە سەماکردنەوە).

هەرچەندە ئەم شێوەیە پێشینەی هەیە و{لاهوریش ج۳، ل۱۷۱۳} بەهەمان شێوەیە، بەڵام بەڵگەکەی جەنابی د.هروی لاوازە چونکە جیاوازی زۆر لەنێوان سەماع و سـەماکردندا هەیـە و (سماع آی) بەواتای سەمابکە نییە وەك جەنابیان لێکیان داوەتەوە {هروی، ج۳، ل۱۰۷٤}.

**۶- صوف برکش ز سر و بادەی صافی درکش**
**سیم درباز و بە زر سیمبری در برگیر**

جلی خوری لەبەرداکەنە و شەرابی بێ خەوش هەڵدە، پارەسەرفکە و بەزێڕ یـارێکی جـوان لەباوەش بگرە.

صوف: خوری، خیرقەی تایبەتی سۆفی لەخوری دروستکراوە، کەلەبەرئەوەی پشتیان لەدونیا کردبوو جلی خورییان لەبەردەکرد و هەربۆیەش یەکێك لەڕایەکان ئەوەیە کەسۆفی لەمەوە هاتووە واتە کەسێ کەجلی خوری لەبەردەکات.

برکش زسر: لەسەرداماڵە، لەبەرداکەنە.        درکش: هەڵدە، بنۆشە.

درباز: خەرجکە، سەرفکە، بەختکە.

سیمبر: زیوینی، مەبەست لە یاری ناسك و جوانی جەستە زیوین و کافورینە.

دربرگیر: لەباوەش بگرە.



لێرەدا بەئاشکرا خواجە بەسۆفی خیرقەی خوری لەبەر دەڵێ: ئەم خیرقەیەت فڕێـدە و واز لـە سۆفیلکەیی بهێنە و بادەی عـەشقی حەقیقی هەڵدە و وەرە نێو عـەشقی حەقیقی حەقـەوە و واز لە پارەکۆکردنەوە بهێنە و خەرجیکە و هەوڵبدە عـەشقی یاری حەق بەدەستبهێنی.

**۷- دوست گو یارشو و هر دو جهان دشمن باش**
**بخت گو پشت مکن، روی زمین لشکر گیر**

بەدۆست بڵێ یار و هاودەم بی، ئیدی باهەردوو دونیا دوژمن بێت، بەبەخت بڵـێ پـشتمان تێمەکە، ئیدی باتەواوی رووی زەوی سوپا و لەشکر بگیرێت.

یارشو: یار و هاودەم بە.        دشمن باش: دوژمن بن.

پشت مکن: پشتمان تێمەکە، رومان لێ وەرمەگێڕە.

ئەڵێ: لێگەڕێ بادۆست و یاری حەق هاودەم و هاورازی ئێمەبێت، ئیـدی هـەردوو دونیـاش دوژمنمان بێت گوێمان لێ نییە، هەروەها بابەختیش هاوڕێمان بێ و روومـان لـێ وەرنـەگێڕێ، ئیدی باسوپا و لەشکر دونیا بگرێ، باکمان نییە.

لەڕاسـتیدا هێنـدە جیـاوازی لەسـاغکردنەوەی ئـەم بەیتـەدا بـەدی دەکـرێ کەجێگـەی سەرسوڕمانە بۆ نموونە: میسراعی یەکەم ئەم شێوانەی هەیە:

دوست گر یارشود هردوجهان دشمن باش (لاهوری)
دوست گر یارشو و هرکەجهان دشمن باش (ق ـ س)
دوست گو یارشو هرکە جهان دشمن باش (عیوضی ـ آ ـ ی ـ م ـ س ـ ن)
دوست گویارشود هر دوجهان دشمن باش (سودی)

هەروەها میسراعی دووەمیش بەم شێوانەی دیکە هاتووە:

بخت گو پشت شود..............  سودی
بخت گو پشت کن و............ه ـ م ـ ن ـ
بخت گو روی کن و............. س،س
بخت گو پشت کن وروی جهان شکر گیر  ـ آ ـ

**۸- میل رفتن مکن ای دوست دمی با ما باش**
**بر لب جوی طرب جوی و بەکف ساغر گیر**

مەیلی رۆیشتن مەکە ئەی دۆست، دەمێ لەگەڵ ئێمەدابـە، لەکـەناری جۆگـەدا خـەریکی شادی بە و پێك بەدەستەوەبگرە.

میل مکن: نیازت نەبێ.        باماباش: لەگەڵ ئێمەدا بە.

جوی: جۆگە.        طرب جوی: خریکی شادی و تەرەب بە.

بێگومان سەرەتا خواجە داوای جیلوەی لەیار دەکرد هەنووکەش کەیاری جیلوەی کردووە خواجە داوای مانەوەی ئەو حاڵەتە دەکات و بەیار دەڵێ، وابەم زوویییە بیر لەڕۆیشتن نەکەیتەوە و ساتێك لامان بمێنەرەوە و لەکەنار جۆگە و یاردا دانیشە و خەریکی شادی و خۆشی بە و پێکی مەی هەڵدە.

**٩- رفته گیر از برم وز آتش و آب دل و چشم**

**گونه‌ام زرد و لبم خشک و کنارم تر گیر**

کەرۆیشتی بەم شێوە ئاگر و ئاوی دڵ و چاوم، گۆنام زەرد و لێوم وشك و داوێنم بەفرمێسکی چاو تەڕبوو بهێنە بەرچاوت.

گیر: وێنەبکە، تەسەورکە.   ازبرم: لەلام.   گونە: گۆنا.   کنار: چاك، داوێن، باوەش.

لە (ئاگر و ئاوی دڵ و چاو) دا لف و نشری مرتب هەیە واتە: ئاگری دڵ و ئاوی چاوم.

ئەی کەدەڕۆی ئیدی ئاگری دڵم کڵپە دەسێنێ و ئاوی چاوم سەردەکات و گۆنام زەرد و لێوم وشك هەڵدەگەڕێ لەتاوفرمێسکی زۆر چاکم تەڕ دەبێ، ئاوا بەم وێنانە تەسەورم بکە.

**١٠- حافظ آراسته کن بزم و بگو واعظ را**

**که ببین مجلسم و ترکِ سر منبر گیر**

حافظ بەزم برازێنەوە و بەواعیز بڵێ: سەیری کۆڕ و مەجلیسم کە و واز لە سەر میمبەر بهێنە.

آراستەکن: برازینەوە.     بگو واعظ را:   سەر میمبەر تەرك کە.

خواجە بەخۆی دەڵێ: کەبەشیعری خۆش کۆڕی بەزمی عارفان /عاشقان برازێنەرەوە و ئەوکاتە بەواعیز بڵێ سەیری ئەم مەجلیسە گەرمەی من بکە و واز لە سەر میمبەری خۆت بهێنە.



## غەزەلی دووسەد و پەنجا و پێنجەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسڵەمی موسبەغ**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان)**

**١- در آکه در دل خسته توان درآید باز**

**بیا که در تن مرده روان درآید باز**

وەرە ژوورەوە (خۆت بکە بەژووردا) تا هێز و توانا بێتەوە بەبەردڵی خەستەمدا، وەرە تا گیان بێتەوە بەبەر جەستەی مردوومدا.

درا: وەرە ژوورەوە، خۆت بکە بەژووردا.   توان: هێز و توانا.   درآید: بێتەوە، بگەڕێتەوە.

باز: دووبارە، لەزمانی کوردیدا لەبری (باز) پاشگری (ەوە) واتای دووبارەبوونەوە دەگەیەنێت، وەك: هاتن هاتنەوە .

بێگومان مەرج نییە هەمیشە (باز-ەوە) مانای دووبارەبوونەوە بگەیەنن وەك: بازکردن و کردنەوە-.

روان: گیان، رۆح.

خواجە یار بە مایەی هێز و توانای دڵی هیلاك و بریندار و گیانی جەستەی مردوو دەزانێت بۆیە بەیار دەڵێ خۆت بکە بەژووردا و وەرە تادڵی هیلاك و بریندارم هێز و توانای بەدەست بهێنێتەوە و گیانیش بێتەوە بەبەر جستەی مردوومدا.

لێرەدا جێگەی ئاماژەپێدانە کەئەم غەزەلە لەزۆربەی زۆری نوسخەدێرینەکاندا نەهاتووە لە (خلخانی)دا هاتووە و بەدوای ئەویشدا قزوینی/غنی و خرمشاهی و هروی و خطیب رهبر و معینیان هێناویانە و لەسودی و لاهوریشدا هاتووە، بەڵام لەخانلری، نیساری و عیوضی..هتددا نەهاتووە.

**٢- بیا که فرقت تو چشم من چنان دربست**

**که فتح باب وصالت مگر گشاید باز**

وەرە، کەدابڕان و دووری لەتۆ واچاوی منی داخست، کەمەگەر کرانەوەی دەرگای ژوان و وەسڵت دووبارە بیکاتەوە.

فرقت: دابران، جودایی.   چنان: وا.   درست: داخست،کوێرکرد (چاو).

گشاید باز: دووبارە بیکاتەوە.

دووری و دابڕانم لە تۆ /یـار واچـاوانی کـوێرکردم کەتـەنیا بـەژوان و دیـداری یـار روونـاك دەبێتەوە دەسا ئەی یار وەرە.

**٣- غمی که چون سپه زنگ ملك دل بگرفت**

**ز خیل شادی روم رخت زداید باز**

غەمێ کەوەك سوپای ژەنگ رەش ولاتی دڵـی گرتـووە، بەلەشـکری شـادی رۆمـی رووت دیسان لەناو دەچێ.

سپه: سوپا.    زنگ: ژەنگ، رەش.

سوپای زنگ: سوپای رەشەکانە کەلێرەدا غەمی بەو سوپارەشە چواندووە.

ملك: ولات، موڵك.    خیل: سوپا، لەشکر.

روم: رۆم، لێرەدا مەبەست لە سپێتی رۆمەکانە و بەگشتی شادی بەسپی داوەتە قەڵەم.

زداید: لەناو دەبات، لەناو دەچێت.

خواجە لێرەدا غەم بەسوپای رەشی و نوتەکی و رووی یاریش بەسـوپای سـپێتی و روونـاکی ئەداتە قەڵەم و ئەڵێ: لە دووری تۆ غەمێ وەك سوپای تاریکی و رەشی ولاتی دڵی داگیرکردووم بەبینینی رووی سپی و روونـاکی تۆ تێکدەشکێ و لەناودەچێت.

**٤- بەپیش آینەی دل هر آنچه می دارم**

**بجز خیال جمالت نمی نماید باز**

هەرچی لە بەردەم ئاوێنەی دڵدا دادەگرم، جگە لە خەیاڵی جوانیت هیچی دیکە دەرناکەوێت.

بەپیش: لەبەردەم.    میدارم: رادەگرم.    نمینماید: دەرناکەوێت.

ئەی یار/ مەحبوبی حەق دڵم لەهەموو شتێ رووی وەرگێڕاوە و تـەنیا خـەیاڵی لای جـوانی تۆیە و هەرچی شتێکی لەبەردەمدا دادەنێم جگە لەخەیاڵی جوانیت هیچی دیکە پیشان نادات.

**٥- بدان مثل که شب آبستن آمدست بەروز**

**ستاره می شمرم تا که شب چه زاید باز**

بەپشت بەستن بەو پەندەی کەشە و بەرۆژەوە سکی پڕە، ئەسـتێرە دەژمێـرم تـابزانم دیـسان شەو چی دەبێت.

مثل: پەند، ئیدیەم.    بدان: بەو.    آبستن: سك پڕ، حامله.

ستاره: ئەستێرە.    میشمرم: دەژمێرم.

چه زاید: چی دەبێـت.



پەندێك هەیە دەڵێت ((شەو بە رۆژەوە سـکی پـڕە)) ئـەم پەنـدەش لـەوباوەڕەوە سەرچـاوە دەگرێت کەشەو سەرچاوە و دایکی رۆژە، خواجە دەڵێ: بەم پەندەوە و هـەموو شـەوێ تابـەیانی چاوەڕێ دەکەم و ئەستێرە ئەژمێرم تابزانم بەیانی چی دەبێت و چ شتێك روودەدات.

لەنوسخەکانی خلخالی و ساغکردنەوەکانیدا میسراعی یەکەم بەم شێوەیە:

(روز از تو) و هەروەها سودی (دور ازتو)ە.

ئەم شێوەیەی ئێستا نوسخەی (قدسی)یە کە د.هـەروی پـشتی پێبەسـتووەو د.معینیـانیش شێوەی یەکەمی پێڕاسترە. {معینیان، ل٤٣١ }

**٦- بیاکه بلبل مطبوع خاطر حافظ**

**بەبوی گلبن وصل تو می سر اید باز**

وەرەکە بولبولی سەرنج راکێشی حافظ، بە ئومێدی گوڵی وەصڵی تۆوە دیسانەوە دەخوێنێ.

مطبوع خاطر: سەرنجڕاکێش، شتێ یادەنگێ یاهەرچییەك کە لەگەڵ زەوقی سەلیمی مرۆڤدا یەکبێتەوە و دڵ پێی خۆش بێت.

گلبن: دارگوڵ، بنی گوڵ.    می سراید: دەخوێنێ.

خواجە وەسڵی یار بەدارگوڵێك ئەداتە قەڵەم و دەڵـێ: ئـەی یـار وەرە چـونکە حـافظ وەك بولبولێکی سەرنجڕاکێش بەئومێدی دارگوڵی وەسڵی تۆوە خەریکی خوێندن وچریکاندنە.

## غەزەلی دووسەد و پەنجا و شەشەم:

**بەحری خەفیفی شەشی مەخبونی ئەسڵەمی موسبەغ**

**(فاعلاتن مفاعلن فع لان)**

**١- حال خونین دلان که گوید باز**

**وز فلك خون خم که جوید باز**

کێ باسی حاڵی خوێنینی دڵان دەکات و کێ خوێنی کوپەڵەی شەڕاب لەفەلەك دەسەنێتەوە.

خونین: خوێنین.    خون خم: خوێنی خۆم (کوپەڵەی شەڕاب) حەقی خۆم.

جوید: دەسەنێتەوە، بەدوایدا دەچێ، لێی دەپێچێتەوە.

دیارە حاڵی عاشقان و ئەهلی دڵ لە نالەباریدایە و خومەکان بەناحەق شکێنراون و خوێنی حەرامیان ڕژێنراوە، خواجە دەڵێ: ئێستا کەدڵان پڕ لەخوێن و خەفەتبارن و کوپەڵەی شەڕابەکان شکێنراون کێ هەیە باسی حاڵی خوێنینی دڵان بکات و حەقی خومەکانیش بسەنێتەوە.

**٢- شرمش از چشم پرستان باد**

**نرگس مست اگر بروید باز**

گەر دیسان نێرگزی مەست ڕوا دەبێ لەچاوی مەی پەرستان شەرم بکات.

بروید: بڕوێت، سەوز بێت.

چاوانی مەی پەرستان هێندە مەست و جوانن کەگەر نێرگزی مەست -کە بەمەستی و جوانی وەسفکراوە- سەوز دەبێ دەبێ لەبەرامبەر ئەو چاوە جوان و مەستانەی مەی نۆشاندا شەرمەزار بێت و خەجاڵەتی بکێشێ.

**٣- جز فلاطون خم نشین شراب**

**سر حکمت به ما که گوید باز**

جگە لەئەفلاتوون کوپەڵەنشینی شەڕاب.کێ نهێنی حیکمەت بەئێمە بڵێتەوە.

فلاطون: ئەفلاتوون، فەیلەسووفی ناوداری یۆنان و جیهان.

خم نشین: نیشتەجێی کوپەڵە/ خوم.

ئەفلاتوونی کوپەڵەنشین، شەڕابە خواجە بۆ فێرکردنی نهێنییەکانی حیکمەت شەڕاب و مەی بە ئەفلاتوون دەزانێت و دەڵێ: جگە لەشەڕابی نیو خوم/کوپەڵە کەلەحیکمەت و فەلسەفەدا بۆ ئێمەی عاشقان هاوشێوەی ئەفلاتوونە کێ ئەتوانێ نهێنییەکانی حیکمەتمان پێ بڵێت.



واتە: هەر شەڕابە کەئەتوانێ نهێنییەکانمان پێ بڵێت.

**٤- هرکه چون لاله کاسه گردان بود**

**زین جفا رخ به خون بشوید باز**

هەرکەس وەك گوڵاڵە کاسەگێڕ بوو، لەم ستەمە ڕووخساری بەخوێن بشوات (لەشەرما سوور هەڵگەڕێ).

کاسە: کاسە، جام.    گردان: گێڕان.    کاسەگردان: کاسەگێڕ.    کاسەگێڕی دوو (یا ڕەنگە سێ) مانای هەیە، یەکەم: بەواتای سواڵکەری و دەرۆزەکردن دێت کە کاسەیەك بەدەستەوە دەگرێ و ماڵ بەماڵ / شوێن بەشوێن دەیگێڕێ یا دووەم: بەواتای فێڵبازی و فرۆفێڵ و خەڵك فریودان دێت — کەلێرەدا ((کاسه بر سر چوب گرداندن- کاسه بەسەر دارەوە گێڕان)) یاخود سێ یەم: ئەم واتایە تەنیاڕای سودییە ك ل١٥٥٨ — مەبەست لە گێڕانی کاسەی شەڕابە و مەبەست لە مەینۆشییە- لەڕاستیدا ئەم واتایە گەر ڕاستیش بێت گرفت بۆ بەیتەکە دروستدەکات و هیچ یەك لەفارسەکانیش ئاماژەیان پێ نەداوە.

بشوید: بشوات.

لالەکاسەی گوڵەکەی کەوەك کاسەیەك وایە بەسەریەوەیەتی، خواجەش دەڵێ: هەرکەس وەك گوڵاڵە کاسەیەکی گرت بەدەستەوە و ماڵ بە ماڵ خەریکی سواڵکردن بوو یاخود خەریکی فریودانی خەڵکی بوو، واچاکترە شەرمەزاربێت و لەتاو ئەم ستەم و جەفایە ڕووخساری سوور هەڵگەڕێ هەتا وەك ئەوە وابێ کەبەخوێن شوشتوویەتی.

سودی لەواتای ئەم بەیتەدا نووسیویەتی: هەرکەس وەك لالە کاسەگێڕبووە، واتە مەینۆش بووە، لەتاو ستەمی موسیبەتی خوێنی خوم-بەیتی یەکەم- ڕووی خۆی بەخوێن بشوات واتە زۆر نارەحەت و غەمبار بێت. {سودی، ج٣، ل١٥٥٨}

گرفتی واتایی لەوەدایە کە ئایا ماتەمزەدە ڕووی خۆی بەخوێن سوور دەکات ؟!

**٥- بس که در پرده چنگ گفت سخن**

**ببرش موی تا نموید باز**

چەنگ لەپەردەدا قسەی زۆری کرد (ئاوازی زۆری لێدا) موی ببڕە تا ئیدی زاری نەکات.

ببرش موی: موی ببڕە.    نموید: گریە و زاری نەکات.

لەپەردەدا قسەکردنی چەنگ بەڕەمز و ئیشارەت قسەکردنیەتی یابەئاواز و مۆسیقاوە قسەکردنیەتی (خواجە ئەم قسەکردنەی چەنگ بە گریە و زاری دەزانێت و تاڵەکانیشی بەپرچی

دەداتە قەڵەم بۆیە دەڵێ: چەنگ زۆری وت و بەڕەمز و ئیشارەت نهێنی زۆری دونیای عەشقی درکاند، کەوایە پرچی/ تاڵەکانی ببڕن باڵەگریە و زاری بکەوێت و بێدەنگ بێت.

**٦- نگشاید دلم چو غنجە اگر**

**ساغر لالەگون نبوید باز**

دڵم وەك خونچە ناپشکوێ گەر بۆنی پێکی گوڵاڵە ئاسا نەکات.

نگشاید: ناکرێتەوە، ناپشکوێ. لالەگون: گوڵاڵەئاسا.

واتە: دڵم گەر وەك خونچە بێت تابۆنی پێکی گوڵاڵەئاسای شەراب نەکات ناپشکوێت و هەروا دەمێنێتەوە و هەر توند دەبێت.

هەروەك واتای بەیتی سێیەمیش لێرەدا پێکی شەڕاب بەمایەی کرانەوەی دڵی دەزانێت.

**٧- گرد بیت الحرام خم حافظ**

**گر نمیرد بە سر بپوید باز**

گەر حافظ نەمرێت بەدەوری بەیتوالحرامی خومدا لەسەر سەر تەواف دەکات.

گرد: بەدەوری. بیت الحرام: کەعبە، بەیتوالحرام.

نمیرد: نەمرێت.

بەسر: بەسەر، لەسەرسەر. بپوید: تەواف دەکات.

(بەیتو الحەرامی خم) کەعبەی عەشقی حەقە و حافظ دەڵێ: گەرعومر باقی بێت، بەدڵ وگیان بەدەوری کەعبەی عەشقدا تەوافی دەکەم و هەرئەو بەکەعبەی راستی (عەشقی ئیلاهی) دەزانێ.



## غەزەلی دووسەد و پەنجا و حەوتەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسڵەمی موسبەغ**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان)**

**١- بیا و کشتی ما درشط شراب انداز**

**غریو و ولولە در جان شیخ و شاب انداز**

وەرە کەشتی ئێمە بخەر وباری شەرابەوە و قریوە و هاوار بخە گیانی پیر و جوانەوە.

شط: رووباری گەورە، جۆگەی گەورە. انداز: بخەرە.

غریو: قریوە، دەنگە دەنگ و هاوار. ولولە: هاوار و دەنگ و ناڵە.

شیخ: پیر. شاب: لاو، گەنج، جوان.

خواجە بەساقی دەڵێ وەرە و کەشتی ئێمە پێکی ئێمـە کـە وەك کەشـتی وایـە بخـەرە نێـو رووباری شەڕابەوە بەم کارەش پیر وجوان، گەنج بخە هاوار و سەرسوڕمانەوە.

**٢- مر ابە کشتی بادە درافکن ای ساقی**

**کە گفتەاند نکویی کن و در آب انداز**

ئەی ساقی مـن بخەرە کەشتی بادە/ شەڕابەوە، چونکە گوتوویانە چاکە بکە و بیدە بەدەم ئاوەوە.

درافکن: بخە/بخەرە. گفتە اند: گوتوویانە.

(نکویی کن در اب /دجلە انداز) پەندێکی فارسـییە و لەکوردیـدا لەبەرامبـەر ئـەم پەنـدە (چاکە بکە و بیدە بەدەم ئاوەوە) هەیە، سودی لەشەرحەکەی خۆیدا نوسیویەتی لەتورکیدا ئـەم پەندە بەم شێوەیە: (چاکەبکە و بیخەرە ئاوەوە، گەرماسی نەزانێت خودا دەزانێت...){ سودی، ج٣، ل١٥٦٠}.

لەم بەیتەدا خواجە داوا لەساقی دەکات لەبری ئەوەی پـەرداخ شـەڕابی بـۆ بهـێنێ خۆشی بخاتە نێو کەشتی شەڕابەوە و سەرمەستی بکات و ئەم چاکەیەی لەگەڵ بکـات هـەروەك پێشینان گوتوویانە، چاکەبکە و بیدە بەدەم ئاوەوە.

**٣- زکوی میکدە برگشتەام ز راە خطا**

**مراد گر ز کرم بارە صواب انداز**

بەهەڵە لەکووچەی مەیخانە گەڕاومەتەوە، لـەپیاوەتی خۆتـەوە جـارێکی دیکـە بمخـەرەوە سەرڕێگەی راست.

برگشتەام: گەڕاومەتەوە. زراە خطا: بە هەڵە.

زکرم: لەپیاوەتی خۆتەوە.          رەصواب: رێگای راست.

من بەهەڵە لە کووچەی مەیخانەی عەشق گەڕاومەتەوە، ئەی ساقی لەپیاوەتی خۆتەوە جارێکی دیکە بمخەرەوە سەررێگەی راست و بمبەرەوە کووچەی مەیخانەی عەشق.

**٤- بیار زان می گلرنگ مشکبو جامی**

**شرار رشک و حسد در دل گلاب انداز**

لەو شەڕابە سوورە میسکبارە پێکێکم بۆ بێنە و ئاگری حەسوودی بخەرە دڵی گوڵاوەوە.

گلرنگ: گوڵ رەنگ، رەنگ سوور وەك گوڵ.          مشکبو: میسکبار.

شرار: ئاگر.

رشك وحسد: حەسوودی.          گلاب: گوڵاو.

گوڵاو بۆنخۆشە و شانازی بەخۆیەوە دەکات لێرەدا خواجە لەشەڕابی سووری بۆن و تامی میسکدار بەراوردی دەکا و گوڵاو بەبێ بەها دەزانێ، بۆیە دەڵێ، ساقی لەو مەی سوورە بۆنی میسکدارە پێکێکم بۆ بێنە و ئاگری حەسوودی بەربدەرە دڵی گوڵاوەوە کە وەك شەڕاب بە بەها نییە.

**٥- اگر چە مست و خرابم تو نیز لطفی کن**

**نظر برین دل سرگشتە و خراب انداز**

ئەگەرچی من مەست و بێهۆشم تۆش لوتفێ بکە سەیرێکی ئەم دڵە سەرگەردانە مەدهۆشە بکە.

سرگشتە: سەرگەردان.

گەرچی من مەست و بێهۆشی شەڕابم و لەحاڵەتی مەستی دام، تۆش ئەی یاری حەق لوتفێ بکە و سەیرێکی ئەم دڵە سەرگەردانە مەدهۆشەم بکە تا مەستتر و بێ هۆشتر بێت و لە عەشقتدا بتوێتەوە.

واتە: ئەی یارمن لەحاڵەتی سکر/مەستی دام و فەنا دەبم ئاگات لەم دڵە سەرگەردانە مەستەم بێت

لەم حاڵەتی مەستییەمدا، دوچاری شەرتە حیات و قسەی حەلەق و مەلەق نەبم.

**٦- بە نیم شب اگرت آفتاب می باید**

**ز روی دختر گلچهر رز نقاب انداز**

ئەگەر بەنیوەشەودا هەتاوت دەوێت، پەردە لەڕووی کچی رووەك گوڵ سووری ترێ لادە.

بەنیم شب: بەنیوەشەو، لەنیوەشەودا.          دختر رز: کچی ترێ (مەبەست لەشەرابە).



گلچهر: گوڵ چهرە، رووخسار وەك گوڵ سوور.          نقاب انداز: پەردەلادە.

پەردەلادان لەسەر رووی سووری مەی (کچی ترێ) لادانی سەری کوپەڵەکانی شەڕابە، خواجەدەڵێ: گەر دەتەوێ بەنیوەشەودا هەتاو ببینی و دونیا رووناك بێتەوە سەری کوپەڵەی شەرابی سوور (دختر گلچهر) لادە.

**٧- مهل کە روز وفاتم بە خاك بسپارند**

**مرا بە میکدە بر در خم شراب انداز**

رۆژی وەفاتم، مەهێڵە بەخاکم بسپێرن، بمبە بۆمەیخانە و بمخەکوپەڵەی شەڕابەوە.

مهل: مەهێڵە.          بەخاك بسپارند: بەخاك بسپێرن.          بر: بە.

رۆژێ کە وەفات دەکەم مەهێڵە بمنێژن و بمبە بۆ مەیخانە و بمخەرە نێو خومی شەڕابەوە واتە لەبری گۆڕ بمخەنە نێو شەڕابەوە، باگۆڕم خومی شەڕاب بێت. (بمخە نێوعەشق و موحیبەتی ئیلاهییەوە).

**٨- ز جور چرخ چو حافظ بە جان رسید دلت**

**بەسوی دیو محن ناوك شهاب انداز**

حافظ کە لەناوستەمی رۆژگار تەواو گەیشتە گیانت و ناڕەحەت بوویت، تیری ئاگرین بۆ دێوی مەینەتییەکان بهاوێژە.

چو: کە، کاتێ کە.

بەجان رسید: گەیشتە گیانت، پڕبوویت و سەبر و ئارامت لێ بڕا.

(لێرەدا دڵی وەك گیانلەبەرێك داوەتە قەڵەم و گەیشتنە گیان و سەبر و ئارام لێبڕانی دڵە).

بەسوی: بەرەو محن: مەینەتییەکان.          ناوك: تیر.

شهاب: ئاگرین.

انداز: بهاوێژە.

تیری ئاگرین گرتنە دێو و شەیتانەکان، دەربڕینی قورئانییە و کاتێ جنۆکەکان /دێوەکان دەرۆیشتنە ئاسمانەکان گوێ لەڕازی نێو ئاسمانەکان بگرن، (شهاب ثاقب)یان تێدەگیرا لەقورئانی پیرۆز سورەتی صافات ئایەتی (٧-١١) باسی ئەم حاڵەتە کراوە هەروەها لەسورەتی (الحجر) ئایەتی (١٧-١٨) شدا باسکراوە و (شهاب مبین)یان تێ گیراوە.

خواجە لێرەدا مەینەتییەکان بەدێو ئەداتە قەڵەم و دەڵێ: ئەی حافظ کە دڵت لەتاو ستەمی زەمانە بڕستی لێ بڕا و گەیشتە گیانی تیری ئاگرین بگرە دێوی مەینەتییەکان بەڵکو دوورکەونەوە، کەلێرەدا ئەکرێ تیری ئاگراوی ئاه و ناڵەی کزەداربێت.

## غەزەلی دووسەد و پەنجا و هەشتەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسڵەمی موسبەغ**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**١- خیزو درکاسەی زر آب طربناک انداز**

**پیشتر زان کە شود کاسەی سر خاک انداز**

هەستە و ئاوی شادیهێنەرمان بۆ بکە کاسەی زێڕەوە پێش ئەوەی کەکاسەی سەرمان بێتە خاکەناز.

خیز: هەستە. ربناك: شادیهێنەر (ئاوی شادیهێنەر) شەرابە.

انداز: بخەرە، بکە.

پیشتر زان: بەرلەوەی، پێش ئەوەی.

کاسە سر: کەللەی سەر،کاسەی سر خاك انداز: خاکەناز، خۆڵ ڕژێن، پڕبێ لەخۆڵ و خاك.

خواجە بەساقی ئەڵێ: هەستە و بەرلەوەی بمرین و کەللەی سەرمان پڕبێ لەخاك وخۆڵ و بێتە خاکەناز شەرابی شادیهێنەرمان بۆبکەرە پێکی زێرینەوە بانۆشی بکەین.

لەفەرهەنگی عیرفانیدا ساقی مورشیدە و لێرەدا خواجە داوای لێدەکات بیانخاتە نێو حاڵی عەشقەوە چونکە ئەم تەمەنە دەستکەوتە و کێ دەزانێ کەی دەمرین و دەبینە خاك و خۆڵ.

کاسەی سەربوونە خاکەناز لای هەموو رەخنەگرەکان پەسەند نەکراوە، بۆیە بەپڕبوون لەخاك و خۆڵ لێکیان داوەتەوە، بەڵام د.هروی بۆ پشتگیری ئەم بۆچوونە (خاکەناز) ئەم بەڵگەیەی خوارەوە دەهێنێتەوە: ((لەباسی هەندێ لەسۆفییەکاندا نوسیویانە، لەبەرئەوەی کە گۆشەگیر دەبوون و سوودیان لەئامێر و کەل و پەل وەرنەدەگرت و نەیان بوو، سوودیان لەئێسکی مردوو وەردەگرت، وەك خاکەناز {هروی، ج٢، ل١٠٨٩}

بەگشتی خواجە لێرەدا — لە سیاقی گشتی غەزەلەکەشدا- باس لەکورتی و زووتەواوبوون و بەدەستکەوت زانینی دونیا دەکات بۆ مەینۆشی و عەشق.

**٢- عاقبت منزل ما وادی خاموشان است**

**حالیا غلغلە درگنبد افلاک انداز**

سەرەنجام، مەنزڵی ئێمە بیابانی خامۆشانە، ئێستا جۆش و خرۆش بخەرە نێوگومبەتەی گەردوونەوە.



عاقبت: سەرەنجام، دواجار، عاقیبەت. وادی خاموشان: بیابانی خامۆشان و کوژراوەکان درکەیە لەگۆڕستان. حالیا: ئێستا.

غلغلە: قوڵپە قوڵپ، قوڵەقوڵ، مەبەست لەجۆش وخرۆشە.

قوڵپەقوڵپ: جگە لەواتای جۆش وخرۆش واتای تێکردنی شەرابە چونکە لەوکاتەشدا قوڵپەقوڵپ دەکات.

خواجە روو لە هەموومان دەکات و دەڵێ: مادام سەرەنجامی هەموومان هەرگۆڕستانە با کات بەدەستکەوت بزانین گومبەتەی گەردوون پڕکەین لە قوڵپەقوڵپی شەراب و جۆش و خرۆشی عەشق و بەشادی بگوزەرێنین.

**٣- بە سر سبز تو ای سرو کە چون خاک شوم**

**ناز از سر بنە و سایە براین خاک انداز**

ئەی دار سەرو (یار) تۆ سەری سەوزت کە بووە خاك، ناز و غرور لەسەر دەرکە و سێبەربە سەرئەم خاکەوە بکە.

بە سر سبز تو: توسەری سەوزی خۆت (تۆ). سەرسەوزی بەواتای شادی و ژیان دێت. جگەلەوەش دارسەر و هەمیشە سەرسەوزە.

خاك شوم: ببم بە خاك، بمرم و جەستەم ببێتە خاك. ناز: ناز و غرور.

ازسربنە: لەسەر دەرکە، وازی لێ بێنە. سایە انداز: سێبەر بکە.

ئەی یار وەك دارسەرو بەژن بەرز و هەمیشە سەرسەوزی توسەری سەوزی خۆت کەمردم و جەستەم بووە خۆڵ و خاك واز لەم ناز و غرورەی ئێستات بهێنە و(کەهەمیشە لێمان دووری) سێبەر بەسەر جەستەی بەخاك بومدا بکە.

خواجە لێرەدا یار بەسەری خۆی سوێنددەدات، کەپاش مەرگی بێتە دیدەنی و سێبەر بەسەر گۆڕەکەیدا بکات و لەلیقای خۆی بێبەشی نەکات.

**٤- چشم آلودە نظر از رخ جانان دوراست**

**بر رخ او نظر از آینەی پاک انداز**

چاوی ناپاك لەسەیری رووی جەمالی جانان دوورە (بێ بەشە) لەئاوێنەی پاکەوە سەیری رووی ئەو بکە.

آلودە نظر: چاوی ناپاك، چاوێك کە گوناهبار و خراپ سەیر کەرە.

دور است: بێ بەشە.

آینەی پاك: ئاوێنەی پاك، مەبەست لەچاوی پاك و بێ خەوش وگوناهە.

رووکردنە رووخساری یاری حەق و سەیرکردنی جەمالی ئەو پێویستی بەچاوی پاك و دڵی پاك هەیە، لەم بنەمایەوە خواجە دەڵێ: چاوی ناپاك ودڵی رەش و تەمگرتووی گوناه بێ بەشە لەسەیرکردنی جەمالی یاری حەقەوە بۆیە گەردەتەوێ جوانی حەق ببینی لەئاوێنەی پاکەوە سەیری حەق بکە، واتە دڵ و چاوت لەژەنگ و ژاری گوناه و فەساد پاککەرەوە.

**٥- دل ما را که ز مار سرزلف توبخست**

**از لب خود به شفاخانەی تریاک انداز**

دڵی ئێمە کەبەدەست ماری سەری زوڵفی تۆوە بریندار بووە (گەزراوە)، بەتریاك لە شیفاخانەی لێوی خۆتەوە تیماری کە.

بخست: برینداربووە، گەزراوە، ئازاردراوە. شفاخانە: شوێنی شیفاوەرگرتن و چاکبوونەوە، نەخۆشخانە. تریاك / تریاتی: دژەژەهر، چەند ماددەیەکی تێکەڵاوکراوە کەدژی ژەهری ماران گەستە بەکارهێنراوە وشەیەکی یۆنانییە و لەفارسیدا بووەتە تریاك و لەعەرەبیدا (ترياق/درياق)/ە.

ئێستا ئەم وشەیە بۆ واتای (تلیاك / تریاك-ئەفیون) بەکار دەهێنرێت.

پرچی یار مارێکە دڵی ئێمەی گەستووە، دە ئەی یار ئەو دڵە بریندارەمان بەتریاکی لێوت کە (ماچ/ قسەلەگەڵ کردن)ە. شیفا بدە و بیخەرە نێو شیفاخانەی لێوتەوە.

**٦- ملك این مزرعه دانی که ثبانی نکند**

**آتشی از جگر جام در املاك انداز**

ئەزانی کە موڵك (موڵکداری) ئەم کێڵگەیە بەردەوام نابێ، کەوایە لەجگەری پێکەوە ئاگرێ بەربدەرە موڵك و ئەملاکەوە.

ملك: موڵك یا ملك بەواتای موڵك، ماڵ یاخود خاوەنداری و موڵکداری دێت.

مزرعە: کێڵگە مەبەست لەم کێڵگەیە دونیایە.

دانی: ئەزانی.

ثبانی نکند: بەردەوام نابێ، نامێنێتەوە.

لەجگەری پێکەوە ئاگر بەردانە موڵك و ماڵ: واتە مەی بنۆشە و گوێ بەسەروەت و ماڵی دونیا مەدە ئەمەش وەك ئەوە وایە ئاگرت تێ بەردابێت.

ئەی رێبواری عەشقی حەق، ئەزانی دونیا و موڵکی دونیا بۆکەس نامێنێ و نەماوە، کەوایە دڵی پێ خۆش مەکە و مەشغوڵی عەشقی یاری حەق بە و ئاگربەردەرە موڵك و ماڵی دونیایی و لە دڵتی دەرکە.



**٧- غسل در اشك زولم کاهل طریقت گویند**

**پاك شواول و پس دیده برآن پاك انداز**

لەفرمێسکدا خۆم شوشت، چونکە ئەهلی تەریقەت دەڵێن، سەرەتا پاك بەوە و پاشان سەیری ئەو پاکە بکە.

غسل زدم: غوسڵم کرد، خۆم شوشت، خۆم پاککردەوە. گویند: دەڵێن.

پاك شو: پاکبەرەوە.

دیدەانداز: سەیریکە.

لەبەرئەوەی کە پیران و ئەهلی تەریقەت دەڵێن: بەرلەوی سەیری مەعشوقی پاك و یاری حەق بکەیت یابچیتە حزوری ئەو پاکەوە خۆت پاککەرەوە منیش لەفرمێسکدا غوسڵم کرد و بەفرمێسك و گریان خۆم پاککردەوە.

ابن عربی سەبارەت بە گریان دەڵێ: ((البکاء عرق القلب خجلا من الذنب)) گریان ئارەقی دڵە لەشەرمەزاریدا لەتاو گوناه خواجە مەبەستی لەم گریانی شەرمەزارییەیە.

ئەم بەیتە لە (عیوضی) دا نەهاتووە و واتاکەشی لەواتای بەیتی (٤) نزیکە، بەڵام لەبەرئەوەی نوسخەکانی دیکە ئەم بەیتەیان هێنابوو، بەناچاری نووسیمانەوە.

**٨- یارب آن زاهد خودبین که بجز عیب ندید**

**دود آهیش در آینه و ادراك انداز**

خوایە ئەو زاهیدە خۆپەسەندەی کەجگە لەعەیب هیچ نابینێ، دووکەڵی ئاهێك بخە ئاوێنەی ئیدراکییەوە.

خودبین: خۆپەسەند. بجز: بێجگە، جگە. ادراك: دەرککردن، هەستکردن.

ئەو زاهیدە خۆپەسەندەی کەتەنیا عەیب دەبینێ و هەمیشە خەریکی رەخنەگرتنە لەعارفان و هەرعەیبەکانیان دەبینێ، خوایە دووکەڵی ئاهێکی عارفان بخەنێو ئیدراك و هەستی تا ئاوێنەی هەستی لێڵ کات و ئیدی هەست بەهیچ نەکات تا رەخنە بگرێت.

(خودبین) بەواتای خۆبین دێت خۆبین وجگە لە عەیب هیچ نەبین، ئەو دەرەنجامە بەدەستەوە دەدات کەخۆی زاهید هەمووی عەیب و عارە.

**٩- چون گل از نکهت جامە قبا کن حافظ**

**وین قبا در رە آن قامت چالاك انداز**

حافظ، لەخۆشی بۆنی ئەوەوە خیرقەکەت وەك گوڵ بدڕێنە، ئەم خیرقەیەش لەرێی ئەو بەژنە شیاوەدا دانێ.

جامه قباکن: خیرقه بدڕێنه.        چالاك: شیاو، شایسته.

خواجه لێرەدا بەخۆی دەڵێ ئەی حافز: کەبۆنی یارت کرد و هەستت بەهاتنی کرد، هەروەك چۆن گوڵ پەڕەکانی ئەدڕێنێت و ئەپشکوێت تۆش خیرقەکەت بدڕێنه و پارچەپارچەی کە (ئەم نەریتەش عارفەکان لەخۆشی دا دەیان کرد) و لەبری گوڵ ئەم خیرقه شیتاڵ شیتاڵەش لەبەرپێی ئەو یاره قامەت رێك و شیاوەدا بلاوکەرەوە بابەسەریدا بڕوات، وەك چۆن گوڵ فرێدەدەنه بەرپێی خۆشەویستێك.



## غەزەلی دووسەد و پەنجا و نۆیەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسلەمی موسبەغ**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان)**

**١- هزار شکر که دیدم به کام خویشت باز**

**ز روی صدق و صفا گشته با دلم دمساز**

هەزار شوکر کەدیسان بەو شێوەیەی حەزم دەکرد تۆم بینی، لەڕووی راستی و سەفا (پاکی)یەوە لەگەڵ دڵمدا هاودەمی.

بەکام خویش: بەئاواتی خۆم، بەوشێوەی حەزم دەکرد.

دمساز: هاودەم، رێکساز و هاوڕاز.

ئەی یار ئاواتم بوو کەتۆ ببینم کە بەڕاستی و بەپاکی هاودەم و هاوڕازی دڵم بیت هەزار سوپاس بۆ خوا کە بەو ئاواتە گەیشتم و چۆن ئارەزووم بو ئاوا تۆم بینی.

**٢- روندگانِ طریقت رهِ بلا ورزند**

**رفیق عشق چه غم دارد از شیب و فراز**

رێبوارانی تەریقەت رێگەی بەلا دەبڕن رەفیقی عەشق چ باکی هەیە لە نشێو و هەوراز.

روندگان: رێبواران، ئەوانەی بەرێوەن.

ره بلا و رزند: رێگەی بەلا دەبڕن، بەرێگەیەکدا دەڕۆن کەپڕە لەدەردیسەری و بەلا.

رێبوارانی تەریقەت، ئەوانەی کەرێگەی عیرفان و عەشقی حەقیقییان گرتۆتەبەر رێگەیان هەڵبژاردووە کەپڕە لە دەردەسەری و بەلا، بەڵام ئەوان کە رەفیقانی عەشقن و عاشقن چ باکیان لەنارەحەتی و لاواز و نشێوی رێگەی عەشق هەیە و کەی لێی دەترسن.

**٣- غم حبیب نهان بهْ ز بجست و جوی رقیب**

**که نیست سینەی اربابِ کینه محرم راز**

واچاکترە غەمی عەشقی دۆست لەهەوڵی زانینی رەقیب پەنهان بێت و نەیزانێ چونکە سنگی ئەربابی رق و کینە مەحرەمی رازی نییە.

نهان به: واچاکترە پەنهان بێت.

جست وجوی: هەوڵی زانین، گەڕان و بەدواداچوون.

ارباب کینه: گرووپی رق و کینە، مەبەست لە رەقیبە، کەسنگی پڕلەکینە.

وەك هەمیشە خواجە پێیوایە پێویستە و واچاكترە غەمی عەشقی یاری حەق و نهێنییەكانی ئەو عەشقە لەسنووری زانین و هەوڵی رەقیب و نامەحرەمانی عەشق بەدووربێت و نەیزانن،چونكە ناپیارێزن و بڵاوی دەكەنەوە لەم بەیتەدا خواجە رەقیبان بەشیاوی بۆنە مەحرەمی رازی غەمی عەشقی دۆست نازانێت چونكە ئەوانە سنگیان پڕەلەكینە و لە گرووپی رق وكینەوەرانن، بۆیە دەڵێ: واچاكترە نهێنییە عیرفانییەكان (غەمی دۆست) لە رەقیبان پەنهان بێت چونكە سینەی گرووپی كینە و رق مەحرەمی عەشقی حەق نییە.

**٤- چە فتنە بودكە مشّاطە ی قضا انگیخت**

**كە كرد نرگس مستش سیە بە سرمەی ناز**

چ فیتنەیەك بوو كەئارایشگەری قەزا بەرپایكرد، كەچاوی مەستی بەكلی ناز رەشكرد.

فتنە انگیخت: فیتنەی بەرپاركرد، فیتنەی هەڵگیرساند.    مشاطە: ئارایشگەر.

مشاطە قضا: ئارایشگەری قەدەر.    سیە: سورمە، كل.

چاوانی مەستی یار خۆی بۆ خۆی مەست و دڵڕفێن بوو، بەڵام كەئارایشگەری چارەنووس بەسورمەی ناز رەشی فیتنەیەكی بەرپاكرد و فیتنەی خستە نێوی عاشقان خواجە لێرەدا لەگەورەیی ئەو ئاشوبە ئەدوێ.

**٥- بدین سپاس كە مجلس منوّر است بە دوست**

**گرت چو شمع جفایی رسد بسوز و بساز**

بەم شوكرانەیەی كەمەجلیس بە دۆست رووناكبووەتەوە، گەر وەك مۆم ستەمێكت پێ گەیشت بسووتێ و بسازێ.

برین سپاس: بەشوكرانەی ئەمەی كە، لەبری سوپاسی ئەمەی كە، بەم شوكرانەیەی كە.

منور: رووناك    ساز: بسازێ.

مادام كۆڕ و مەجلیس بەیار رووناكبۆتەوە ئیدی ئەمە سوپاس و شوكرانەی دەوێ، بەم سوپاس و شوكرانەیەش گەر وەك مۆم- لەمەجلیسدا دەسووتێ- لەم مەجلیسەی دونیادا ستەمێكت پێگەیشت تەحەمولی بكە و بسازێ.

مادام دۆست لەژیانی عەشقتدایە خەمی سووتانی دونیا مەخۆ و سوپاسگوزاربە.

**٦- بە نیم بوسە دعایی بخر ز اهلِ دلی**

**كە كید دشمنت از جان و جسم دارد باز**

بەنیو ماچ دوعایەك لەئەهلی دڵێك بكڕە، چونكە فێڵی دوژمنەكانت لەگیان و جەستەت دوور دەخەنەوە.



نیم بوسە: نیوەماچ.    بخر: بكەڕە.    كید: فێڵ، حیلە.

دارد باز: دووردەخاتەوە.

خواجە خۆی بەئەهلی دڵ / عاشقانی عارف دەزانێت و دەڵێ ئەی یار ئەوانە دوعایان گیرایە و فڕوفێڵی دوژمنت لەرۆح و جەستەت دووردەخەنەوە بۆیە بەنیوە ماچێك دوعایەكیان لێ بكڕە.

**٧- فكند زمزمەی عشق در حجاز و عراق**

**نوایِ بانگِ غزلهای حافظ از شیراز**

ئاواز و نەغمەی غەزەلەكانی حافظ لەشیرازەوە لە حیجاز و عیراق بڵاو كردە.

فكند: بڵاوكردەوە.    زمزمە: ورتەورت، ئاواز.

غەزەلەكانی حافظ لەشیرازەوە ئاوازی عەشقی لە مەككە و عیراق (اصفهان و دەوروبەری) دا بڵاوكردەوە، واتە: حافظ بە عەشقی نێو غەزەلەكانی ناوبانگی دەركرد.

## غەزەلی دووسەد و شەستەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسلەمی موسبەغ**
**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان)**

**١- منم که دیده به دیدار دوست کردم باز**
**چه شکر گویمت ای کارسازِ بنده نواز**

منم کەچاوانم بە رووی دۆستدا هەڵهێناوە چ سوپاسێکت بکەم ئـەی کاررێکخـەری بەنـدە دڵنەوای کەر.

کارساز: کاررێکخەر، کارسازێنەر ـ مدبر الامر ـ یەکێکە لەسیفاتەکانی حەق.

بندە نواز: بەندە دڵنەوایی کەر ـ میهرەبانی لەگەڵ بەندەدا.

خواجە لەم بەیتەدا بەدیداری دۆست گەیشتووە، ئەم دیدارەش گەیشتن بەڕووی جوانی یـاری حەق و جیلوەی جەمالی ئەو ـ سەرسامی کردووە وەك بڵێی باوەڕ بەخۆی ناکـات، بەپرسـیار و سەرسوڕمانەوە دەڵێ مـنم کەچـاوم بـەڕووی دۆسـتدا هـەڵهێناوە و بەدیـداری جـەمالی حـەق گەیشتووم؟ ئەی خودای کارساز و بەندەنەواز لەسەر ئەم نیعمەتە گەورەیە چ سوپاسێکت بکەم؟

**٢- نیازمند بلا گو رخ از غبار مشوی**
**که کیمیای مُراد است خاكِ کویِ نیاز**

بەوعارفە کەپێویستی بەبەڵا (نارەحەتیـەکانی عەشـق) هەیـە بڵـێ روخسـاری تۆزاویـت مەشۆ، چونکە خاك و تۆزی کووچەی پێویستی کیمیای موراد و ئارەزووە.

نیازمند: ئەوکەسەی کەپێویستی بەشتێکە، موحتاج. گو: بڵێ.

مشوی: مەشۆ، پاك مەکەرەوە. کیمیا: ئیکسیر.

ئەوکەسەی کەپێویستی بە بەڵا و نەهاتییە، عارفی / عاشـقی حەقـە کـە وازی لەخۆشـی و لەزەتی دونیا هێناوە و لەنێو نارەحەتییـەکانی عەشـقدا بـەدوی مەعـشوقدا دەچـێت، خواجـە لێرەدا بنەمایەکی گرنگ بۆ عارف/ عاشقەکان بەیان دەکات و پێیـان دەڵێـت: گـەرد و تـۆزی کووچە و کۆڵانی یار لە روخسارتان لامەبەن و مەیشۆن، چونکە ئەو خاکە کیمیا و ئیکـسیرە و بەموراد و ئاواتی خۆتانتان دەگەیەنێت.

**٣- به یك دو قطره که ایثار کردی ای دیده**
**بسا که بر رخ دولت کنی کرشمه و ناز**



ئەی دیدە (چاو) بەیەك دوو دڵۆپ کەکردتە قوربانی بەسەر رووی بەختدا نازی زۆر دەکەیت.

دولت: بەخت، ئیقباڵ.

ئەی دیدە و چاوانم ئەزانی فرمێسك رژاندن و غەریبی کردن لەدەرگای یاردا کاریگـەری زۆر گەورەی هەیە و بەیەك دوو دڵۆپ فرمێسك کە لەپێناو یاردا رژاندت و کردنتە قوربانی بـەختی چاکت دەبێت و بەئاوات دەگەیت بەسەر رووی بەختەوە ناز وکرێشمەی زۆر دەکەی.

بەکورتی گریان وفرمێسك رژاندن ریگـەی گەیـشتنە بەخۆشـبەختی و بەختـەوەری، گریـان لەبەر خوا لای حەق زۆر خۆشەویستە و حەزرەتی موحەمـەد-د.خ- فەرموویـەتی کـە دووچـاو لەدوارۆژدا ناسووتێن یەکێکیان چاوێکە لەبەرخوا و لەترسـی خـوا بگریـەت و ئـەوی دیکـەیان چاوێکە کە لەبەرخوا ئێشك دەگرێت.

**٤- طهارت ار نه بخون جگر کند عاشق**
**به قول مفتی عشقش دُرست نیست نماز**

گەر عاشق بەخوێنی جگەر دەستنوێژ هەڵنەگرێ بەفتوای موفتی عەشق نوێژی دروست نییە.

طهارت: خۆپاککردنەوە، دەستنوێژ (لێرەدا لەم واتایە هاتووە).

درست نیست: دروست نییە، قەبووڵ نییە.

(خوێنی جگەر) نارەحەتیکێـشان و رەنـج و مەینـەت ببینـە، دەسـتنوێژ گـرتن بـەخوێنی جگەریش خۆئامادەکردنە بەمەینەتی و بەڵا و نارەحەتی، دیسانەوە خۆئامادەکردنە بە مجادەلـە و ریازەت و خۆبرسی کردن و چلەکێشی.

دەستنوێژ گرتن و خۆپاککردنـەوە فـەرز نـین بـەڵام لەپێداویـستییەکانی نوێـژن و بـەبێ دەستنوێژ نوێژکردن دروست نییە، نوێژی عەشقی حەق/ یاریش دەستنوێژێکی تایبەتی هەیـە کەبەخوێنی جگـەر دەگیرێـت و مـوفتی عەشـق فتـوای داوە کەنوێـژی عەشـق بـەبێ ئـەم دەستنوێژە دروست نییە و بەتاڵە.

دەستنوێژ گرتن بەخوێن بۆ نوێژی عەشق یادخەرەوەی گوتەی ((فی العشق رکعتین لا یـصح وضوءهما الا بالدم)) ی مەنسوری حەللاجە –قدس سرە- واتە: لەعەشقدا دوو رکعـات نوێـژی عەشق هەیە کە دەستنوێژیان تەنیا بەخوێن دەگیرێت.{ لاهوری، ج٣، ل١٨٢٥}

لێرەدا مەبەست لە موفتی عەشق حەللاجە، واتە بەقسەی موفتی عەشق ـ حـەللاج ـ گـەر عاشق بەخوێنی جگەر دەستنوێژ نەگرێت نوێژی دروست نییە.

**٥- غرض کرشمەی حسن است ورنه حاجت نیست**
**جمال دولت محمود را به زلف ایاز**

مەبەست نازی جوانییە، ئەگەرنا جوانی ئیقبالّی سولّتان مەحەمەد پێویستی بەزولّفی ئەیاز نییە.

غرض: مەبەست، مەبەست لە (محمود و ایاز).

سولّتان مەحەمەدی غەزنەوی ئەیازی غولاّم و خزمەتکاریەتی، لەچیرۆکە میللییەکاندا هاتووە کە سولّتان مەحموود ئەم غولاّمەی زۆر خۆشویستووە و تارادەی عاشقی بووە.

واتە: مەبەست لەعەشقی سولّتان مەحموود بۆ ئەیاز ناز و جیلوەی جوانییە، گەرنا جوانی و بەختی سولّتان مەحموود پێویستی بەزولّفی ئەیاز نییە بۆئەوەی بیڕازێنێتەوە.

لاهوری لەشەرحە عیرفانییەکەیدا ئەم بەیتەی بەعەشقی حەق بۆ عاشقان لێکداوەتەوە. {لاهوری، ج٣، ل١٨٢٤ }

**٦- ز مشکلات طریقت عنان متاب ای دل**

**که مردِ راه نیندیشد از نشیب و فراز**

ئەی دڵ روو لە گرفتەکانی تەریقەت وەرمەگێڕە، چونکە پیاوی ڕێگە بیر لە نشێو و هەوراز ناکاتەوە.

عنان: هەوسار- ڕەشۆ.

عنان متاب: روو وەرمەگێڕە، پشت هەڵمەکە (واتە: هەوساری ئەسپەکەت مەگرە و رووت لەو گرفتانە وەرمەگێڕی).

مرد راه: پیاوی ڕێگە، ڕێگەزان، ڕێبوار.     نیندیشد: بیرناکاتەوە، ناترسێت.

(مردراه) عارف و ڕێبواری ڕێگەی حەق و ڕێگەزانەکانن، خواجە ئامۆژگاری یا سڕی دڵی خۆی ئەخاتەوە کە ئەی دڵ ڕێگەی عەشق و تەریقەت گرفتی زۆر تێدایە وەك هەر ڕێگەیەك کە هەوراز و نشێوی تێدایە، تۆ کە ملی ڕێگەی عەشق و تەریقەتت گرتووە، بەردەوام و سەرڕاست بە و لە بەردەم گرفتەکاندا روو وەرمەگێڕە و لەڕێ لامەدە- گرفتەکان خاوت نەکەنەوە و نەت لەنگێنن ـ چونکە بەکەسێك دەگوترێ ڕێبوار و پیاوی ڕێگە ئیدی هەوراز و نشێوی ڕێگە نایترسێنێ.

**٧- درین مقام مجازی بجز پیاله مگیر**

**درین سراچەی بازیچە غیر عشق مباز**

لەم مەقامە مەجازییەدا جگە لەپیاڵە بەدەستەوە گرتن هیچی دیکە مەکە و لەم خانۆچکەی بازیچەیەدا جگە لەعەشق هیچ کارێکی دیکە مەکە.

سراچە: خانۆچکە، ماڵۆچکە.   بازیچە: یاری منداڵان.   مباز: مەکە، مەشغوڵ مەبە.



خواجە دونیای بە (مقام مجازی) ناحەقیقی و خانۆچکەی لەهولەعب و یاری منداڵانە داوەتە قەڵەم.

ئەی دڵ /عارف/ عاشق لەم دونیایەدا کە مەقامی مەجازییە و حەقیقی نییە و خانۆچکەی یاری منداڵان و لەهولەعب، جگە لە پیاڵەی شەڕاب/عەشق و عاشقی مەشغوڵی هیچی دیکە مەبە.

**٨- من از نسیم سخنچین چە طرف بربندم**

**چو سرو راست درین باغ نیست محرم راز**

کاتێ کە سەروبەری بەژنرێك لەم باخەدا مەحرەمی راز نییە من لە سروەی دووزمان چ قازانجێك دەکەم.

سخن چین: دوو زمان، قسە هێنەر و قسەبەر.

چە طرف بربندم: چ قازانجێك دەکەم، چ سوودێك دەبەم.

ئەم باخە درکەیە لە دونیا و، بێگومان سروە دوو زمانی دەکات و نهێنییەکانی نێو باخ بەبۆنی خۆش و رازەکانی حەقیقەت و ئەسرارە ئیلاهییەکان دەباتە دەرەوە و بڵاویان دەکاتەوە، بەڵام خواجە دەڵێ من چ قازانجێك لەم دەمشڕییەی سروە دەکەم کاتێ کەهیچ مەحرەمێکی ئەسرار و نهێنیزان لەم باخەدا نییە، ئەم باخە کە دارسەرووی بەژنرێکی تێدایە و ئەویش مەحرەمی ئەسرار نییە و هیچ نهێنی نازانێ.

واتە: کاتێ کە باخی دونیا خاسانی خوا و نهێنی زانی تێدا نەبێ بانهێنی بڵاوبێتەوە چ سوودێکی هەیە، ئەو نهێنی و رازی حەقیقی نین.

**٩- اگرچە حسن تو از عشق غیر مستغنی است**

**من آن نیم کە ازین عشقبازی آیم باز**

گەرچی جوانی تۆ پێویستی عەشقی غەیر (ئەوانی دی، کەس) نییە، بەڵام من ئەوکەسە نیم کە واز لەم عەشقبازییە بەبهێنم.

آن نیم: ئەوکەسە نیم.     آیم باز: وازبێنم، پەشیمان ببمەوە.

ئەی خودا ئەی مەعشوقی حەق ئەی جوان و جەمیل ((ان الله جمیل و یحب الجمال)) گەرچی جوانی تۆ (قائم بزاتە)یە و پێویستی بە عەشقی کەس نییە و لەخۆیدا جوانی ڕەهایە، بەڵام من ئەو کەسە نیم کە واز لەعەشق بێنم کە ئەشزانم پێویستی پێی نییە.

ئەم بەیتە جوانکردنی عەشقە و لێرەدا عەشق لەپێناو عەشقدایە، نەوەك لەپێویستی مەعشوقەوە سەرچاوە بگرێت.

**١٠-چه گویمت که زسوز درون چه می بینم**

**ز اشک پرس حکایت که من نیم غمّاز**

چیت پێ بڵێم، کە لەتاو سووتانی دەروون چ دەکێشم، باسی وەزعم لە ئەشك بپرسە چـونکە من قسەگێڕەرەوە نیم.

سوز درون: سووتانی دڵ، سووتانی ناخ.

چه می بینم: چ دەکێشم، چیم بەسەردێ، چیمە بەدەستیەوە.

پرس: بپرسە.          حکایت: حاڵ و وەزعم.

نیم غماز: قسە گێڕەرە و قسە بڵاکەرەوە نیم.

ئەی یار: چیت پێ بڵێم و باسی چیت بۆبکەم من قـسە ناگێڕمـەوە تاباسـی حـاڵی خۆمـت بۆبکەم کەچ دەردێك لەتاو ئاگری دڵم (لە دووریت) دەکێشم، لەفرمێسکی چاوم بپرسە باباسـی حاڵی سووتانی دڵمت بۆبکات.

**١١- غزل سرایی ناهید صرافه‌ای نبرد**

**درآن مقام که حافظ برآورد آواز**

لەوشوێنەدا کە حافظ دەنگی هەڵهێنا (شیعر بڵێ) ئیدی گۆرانی گوتنی ناهیـد ـ زوهـرە ـ رەونەقی نییە.

غزل: جۆرە ئاوازێکە، غەزەل صرفەای نبرد: سوودێکی نییە، رەونەق و جیلوەیەکی نییە.

مقام: شوێن .

ناهیـد: ئەسـتێرەی زوهـرە / ناهیـد کـە گۆرانیبێـژی گـەردوون ناسـراوە و ئەسـتێرەی هونەرمەندان و شاعیرانە.

واتە: شعیری حافظ هێندە بڵند و بەهێزە، لەو شوێنەدا کە حافظ دەستدەکات بە شـیوگوتن ئیدی غەزەلخوێنی ناهید / زوهرە هیچ رەونەق و جیلوەیەکی نابێ.

لەنوسخە جیاوازەکاندا ئەم غەزەلە و غەزەلی پێشوو بەشێوەیەك تێکەڵاوبوون بەسـەریەکدا کەجیاکردنەوەیان لێکدی زۆر گرانە و ئەکرێ بڵێین لە توانای کەسدا نییە ـ مەگەر نوسـخەیەکی دێرینی تۆکم و تەواو ئاشـکرا بێـت ـ بۆیـە بەنـدە تـەنیا رای (د.عیوضـی)م وەرگـرت و خـۆم لەهەرجۆرە هەڵبژاردنێك پاراست.



## غەزەلی دووسەد و شەست و یەکەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفونی مەقسور**

**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلان)**

**١- ای سروناز حسن که خوش می روی به ناز**

**عشّاق را به نازِ تو هر لحظـه صد نیاز**

ئەی سەرووی نازی جوان کە جوان بەناز دەڕۆی عاشقان هەر ساتە سەد پێویـستیان بـەنازی تۆ هەیە.

سروناز: جۆرێکە لە دارسـەروو کـە بـۆ رازاندنـەوەی جوانکارییـە و لـە باخـچەی ماڵانـدا دەیڕوێنن شێوەیەکی زۆر جوانی هەیە.

{فرهنگ زبان فارسـی ـ بهابـادی / آلاشتی،سـید علـی رضـوی بهابـادی /حـسین حـسن پورآلاشتی، چاپ سوم، سال ١٣٧٨، انتشارات بهاباد ـ یزد}

**٢- فرخنده باد طلعتِ خوبت که در ازل**

**بُبریده‌اند بر قدِ سروت قبای ناز**

تەڵعەتی جوان و چاکت شاد و پیرۆز بێت کە لە ئەزەلـدا کراسـی نازیـان بەبـەربالآی چـون سەروتدا بڕیوە.

فرخنده: پیرۆز، شاد و موبارەك.

طلعت: تەلعەت، روخسار، سیما.

بریده‌اند: بڕیویانە.          قبا: کراس.

کراس بەبالآی کەسێکدا بڕین پەندێکە بەواتای شیاوبوونی ئەوکەسە بۆشتێك یاخود لێهاتن و بەخشینی دروستی ئەوشتە.

ئەی یاری روخسار پیرۆز نازدار و بەناز، پیرۆز و شاد بێت روخساری موبارەك و جوانت کـە هەر لەئەزەلەوە کراسی نازیان بەبالآی چون دارسەروتدا بڕیوە و ناز هەر لەخۆت دێت.

**٣- آن را که بوی عنبر زلف تو آرزوست**

**چون عود گو بر آتش سوزان بسوز و ساز**

بەو کەسەی کە ئارەزووی بۆنی عەنبەری پرچی تۆ دەکـات بڵـێ: وەك بخـور بەسـەر ئـاگری سووتێنەرەوە بسووتێ و بسازێ.

ساز/بساز/: بسازێ، خۆراگربە و نارەزایی دەرمەبڕە.

لێرەدا خواجە مەدحی عاشقبوون دەخاتەڕوو کە سووتان و خۆڕاگرییە لە ئاگری عەشقی یاردا. دەڵێ: ئەی یار بەوکەسەی کەئارەزوو و ئاواتی ئەوەیە بەوەسڵی تۆ بگات و بۆنی پرچی عەنبەرینی تۆ بکات بڵێ: وەك بخوری سەر ئاگری سووتێنەر بسووتێ و بسازێ (خۆڕاگربە و نارەزایی دەرمەبڕە).

بۆنکردنی پرچی بۆنخۆشی مەعشوقی حەق جیلوەی جەمالی و سیفاتی ئەوە و سووتانی نێو ئاگریش نەهامەتی و نارەحەتییەکانی سەرەڕێی عەشقن.

**٤- پروانه را ز شمع بوَد سوز دل ولی**

**بی شمع عارض تو دلم را بُود گداز**

سووتانی دڵی پەروانە لە مۆمەوەیە بەڵام توانەوەی دڵی من لە دووری مۆمی رووخساری تۆوەیە.

عارض: روخسار        گداز: توانەوە.

بەراوردێك لەنێوان سوتانی پەروانەو سوتانی دڵی خۆی دەکات و دەڵێ: پەروانە کە لە مۆم نزیك دەکەوێتەوە دەسووتێ و سووتانی دڵی لەنزیکی مۆمەوەیە، بەڵام توانەوە و سووتانی دڵی من لەتاو دوورییە لە رووخسارت.

**٥- از طعنه ی رقیب نگردد عیار من**

**چون زر اگر بَرَند مرا در دهانِ گاز**

لەتانەی رەقیب عەیاری من کەم ناکات گەر وەك زێڕیش بیخەنە بەردەمی گازەوە.

عیار: عەیارە، عەیار.        نگردد عیار: عەیارم ناگەڕێتەوە، کەم ناکات و ناگۆڕێت.

برند: ببەن، بخەنە.        گاز: گاز.

من کە عاشقم و رەندم بەتانەی رەقیب کەم ناکەم و رێز و عەیارم کەم نابێتەوە و ناگۆڕێت تەنانەت گەر لەت لەتیشم کەن و پارچە پارچەش بم هەروەك چۆن کە ئاڵتون / زێڕ ئەخەنە بەردەم گاز و دەیبڕن هەرئاڵتونە و عەیارەکەی کەم ناکات.

**٦- دل کز طوافِ کعبەی کویت وقوف یافت**

**از شوق آن حریم ندارد سر حجاز**

دڵ کە لە تواف کەعبەی کۆڵانی تۆ تێگەیشت، لە تاسە و شەوقی ئەو حەرەمەدا ئیدی نیازی چوونە حیجازی نییە.

طواف: تەواف، سوڕانەوە بە دەوری شتێکدا (کەعبەدا) کە یەکێکە لە روکنەکانی حەج.



کعبە: کەعبە، کابە، قیبلەی موسوڵمانان کەلەکاتی حەجدا حاجییان بەدەوریدا دەسووڕێنەوە (تەوافی دەکەن).    وقوف یافت: تێگەیشت، زانی.

حریم: حەرەم، شوێن.

ندارد سر: نیازی نییە.

حیجاز: حیجاز، وڵاتی حیجاز کە مەککە و کەعبەی تێدایە.

ئەی یار کەدڵم لە تەوافی شوێنی دانیشتنی تۆ (کۆڵانی تۆ) تێگەیشت و هەستی بەوەکرد لەخۆشی حەرەمی تۆوە ئیدی نیازی چوونە حەجی نییە و هەر تەوافی دەوری تۆ دەکات.

چونکە کووچە و کۆڵانی مەعشوق (وجه الله) کەعبەی عارفانە.

لەڕاستیدا عارفەکان کە عەشق و خۆشەویستی حەق دەچێتە دڵیانەوە ئیدی هەموو شتێکیان لادەسڕێتەوە و تەنیا حەق دەبینن و هەست بەو دەکەن، تەنانەت لە ابوبکر شبلییەوە گێراوەتەوە کە دەفەرمووێ ((سمیت المحبة محبة لأنها تمحو من القلب ماسوی المحبوب)) واتە: بۆیە خۆشەویستی بە (محبە) ناونراوە چونکە جگە لە خۆشەویست هەموو شتێك لەدڵدا دەسڕێتەوە. {لاهوری، ج٢، ل٨٧١}

**٧- هردم به خون دیده چه حاصل وضو چو نیست**

**بی طاق ابروی تو نماز مرا جواز**

بەردەوام بەخوێنی دیدە دەستنوێژ بگرم چ سوودێکی هەیە، چونکە بێ تاقی بڕۆی تۆ مۆڵەتی نوێژکردنم نییە.

هردم: هەردەم، بەردەوام.        وضو: دەستنوێژ.

طاق: تاق، کەوانە.

چه حاصل: چ سوودێکی هەیە، چ بەرهەمێکی هەیە.

جواز: مۆڵەت، ئیجازە.

ئەی من کە بەبێ ئەوەی تاقی بڕۆی تۆ لەبەرامبەرم بێت نوێژم دروست نییە ئیدی بابەردەوام بەفرمێسکی خوێنین دەستنوێژ بگرم، چ سوود و بەرهەمێکی هەیە.

لەبەرامبەردا بوونی تاقی برۆی یار حزور ئامادەگی لەکاتی نوێژدا واتە: من گەر لەبری ئاو دەستنوێژ بە خوێنیش بگرم کە حزوری دڵم نییە و تاقی برۆی یار لەدڵمدا حزوری نەبێ نوێژم دروست نییە.

لەڕاستیدا ئەمە مەرجی نوێژی عاشقانەیە.

**٨- صوفی که بی تو توبه ز میْ کرده بود دوش**

**بشکست عهد چون درِ میخانه دید باز**

سۆفی کە بێ تۆ (نەبونی تۆدات) تۆبەی لەمەی کردبوو شەوی رابردوو کەدەرگای مەیخانەی بەکراوەیی بینی پەیمانەکەی شکاند.

بی تو: لەبێ تۆیدا، لەنەبوونی تۆدا.

باز: کراوە، بەکراوەیی.

ئەی یار ئەو سۆفییەی کەلەبێ تۆیدا ـ لەبەر نەچەشتنی چێژی عەشقی تۆـ وازی لەعەشق / مەی هێنابوو کەدوێنی شەو دەرگای مەیخانە/مەقامی محبەتی بەکراوەیی بینی پەیمانەکەی شکاند و دەستی کردەوە بە مەینۆشی /عەشقی تۆ.

لێرەدا (دوش) بەئاوەڵکاری کاتی میسراعی دووەم لێکدراوەتەوە، ئەکرێ ئاوەڵکاری کاتی کاری میسراعی یەکەمیش بێت و ماناکە بەم شێوەیە دەبێت:

سۆفی کە دوێنی شەو لەبێ تۆیدا تۆبەی لە مەینۆشی کردبوو کە دەرگای مەیخانەی بەکراوەیی بینی پەیمانەکەی شکاند.

واتە: لەلێکدانەوەی یەکەمدا دیار نییە کەی سۆفی تۆبەی کردووە بەڵام ئاشکرایە کە شەوی رابردوو لەتۆبەکەی پاشگەز بووەتەوە.

لەلێکدانەوی دووەمدا بەپێچەوانەوە، شەوی رابردوو تۆبەی لە مەینۆشی کردووە و ئەمڕۆ پەیمانەکەی شکاندووە، هەرچەندە بەڕوونی دیار نییە بەڵام لەڕووی لۆژیکییەوە لەپاش شەوی رابردوو هەرئەمڕۆ (کاتی نووسینی شیعرەکە) هەیە.

**٩- چون بادە باز بر سر خُم رفت کف زنان**

**حافظ کە دوش از لب ساقی شنید راز**

حافظ کە شەوی رابردوو لەلێوی پێکەوە رازی بیست وەك بادە بەچەپڵە لێدان چووە بۆ لای خومەکان.

کف زنان: چەپڵەلێدان، کەفکردن (گەر بەمانای یەکەم بەکاربهێنرێت سیفەتی حافظە و گەر بەمانای دووەم لێکبدرێتەوە سیفەتی شەڕابە) بەم شێوەیە:

کف زنان/ چەپڵەلێدان:

دوێنێ شەو پێکی شەڕاب رازێکی موحیبەت و عەشقی بە حافظ گوت، هەر بۆیە وەك شەڕاب (چۆن لەسر کوپەڵەکاندایە) دیسانەوە بەچەپڵەلێدان و سەماوە چووە سەر کوپەڵەکان بۆ ئەوەی شەڕابی زۆر بخواتەوە.



کف زنان/ کەفکردن: کەدوێنێ شەو پێکی شەڕاب رازێکی عەشقی بە حافظ گوت، وەك شەڕاب چۆن بەکەفکردنەوە هەڵدەچێت و دێتە سەرەوەی کوپەڵەکانەوە حافظیش چووە سەر کوپەڵەکان بۆ ئەوەی شەڕابی زۆر بنۆشێ.

جگە لەم دوو لێکدانەوەیە بەبوونی (دوش) لەم بەیتە و بەیتی پێشوودا- مەبەست لەسۆفی خودی حافظە و پەیوەندی لەنێوان لێکدانەوەی یەکەمی بەیتی پێشوو و ئەم بەیتەدا هەیە، بەگشتی واتای هەردوو بەیتەکە بەم شێوەیەیە:

سۆفی /حافظ کە بەبێ تۆ / یار تۆبەی لەعەشق کردبوو کە دەرگای مەیخانەی عەشقی بەکراوەیی بینی تۆبەکەی شکاند و دەستی کردەوە بەمەینۆشی کاتێ کە یەکەم پێکی دەنۆشی پێکەکە رازێکی عەشقی پێگوت و لەچێژ و لەخۆشی / لەتاودا بەسەما و چەپڵەلێدانی عەشقەوە (سماع) چووە سەر کوپەڵەکان و بەتەواوی مەست بوو.

## غەزەلی دووسەد و شەست و دووەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی مەقسور**
**(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلان)**

**١- برنیامد از تمنّای لبت کامم هنوز**
**بر امیدِ جام لعلت دُردی آشامم هنوز**

هێشتا ئاواتی گەیشتن بەلێوتم نەهاتۆتەدی و بەئومێدی جامی یاقوتینتەوە هێشتا خڵتە نۆشم.

برنیامد: نەهاتەدی، دەرنەهات. کام: ئاوات. هنوز: هێشتا.

جام لعل: جامی یاقوتی، جامی سووری شەراب، مەبەست لەلێوی یار و لیقای ئەوە.

دردی/درد: شەرابی بنی کوپەڵە کە خڵتە دارە، شەرابی خڵتەدار.

(آشام) لە (آشامیدن)ە وە هاتووە بەواتای خواردنەوە، نۆشکردن .

دردی آشام: خڵتە نۆشی.

ئەی یار ئاواتم ئەوەیە کەبەلێوی تۆ بگەم و گوێم لە قسەی شیرینی رەحیمیت بێت بەلام هێشتا ئەو ئاواتەم نەهاتۆتەدی و بەئومێدی ئەوەی کە رۆژێك پێکی سووری شەرابی تۆ یا پێکی لێوت کە ساف و بێ خڵتەیە بنۆشنم / ماچکەم یا گوێم لەدەنگت بێ هێشتا هەر خڵتە نۆشم ـ خڵتە نۆشی لەعەشقی حەقدا خۆڕاگرتن و تەحەمول کردنی نەهاتی و ناڕەحەتییەکانی سەر رێگەی عەشقی مەحبوبی حەقە ـ بەگشتی لە عەشقدا هێشتا بە ئاوات نەگەیشتووم بەو ئومێدەی کەرۆژێ بە ئاوات بگەم هێشتا هەر لەسەر ناڕەحەتییەکان خۆڕاگرم.

**٢- روز اوّل رفت دینم در سر زلفین تو**
**تا چه خواهد شد درین سودا سرانجامم هنوز**

رۆژی یەکەم بەسەری زوڵفی تۆ دینم لەدەست دا، تا بزانی هێشتا لەم ئارەزووەدا سەرەنجام چی دەبێ.

زلفین: ئەڵقەرێزی دەرگا، زوڵفی مەعشوق.

چەخواهد شد: چی دەبێت (لەداهاتوودا).

سودا: سەودا و ئارەزوو. سرانجام: سەرەنجام، عاقیبەت.

ئەی یاری حەق رۆژی ئەزەل و سەرەتا لەجوانی زوڵفتدا دین و ئیمانم رۆیشت ئیدی هێشتا نازانم سەرەنجام لەم ئارەزوو و سەودایەی عەشقتدا چۆن دەبێت و چی دەبێت.



**٣- ساقیا یک جرعه ده زان آب آتشگون که من**
**در میان پختگان عشق خامم هنوز**

ئەی ساقی قومێکم لەو ئاوە ئاگرڕەنگە (سوور) بدەرێ، چونکە من لەنێوان کاماڵانی عەشقدا هێشتا ناکامڵ و بێ ئەزموونم.

جرعە: قوم. دە: بدە، بدەرێ. آتش: ئاگر.

آتشگون: وەك ئاگر، ئاگر ئاسا، چون ئاگر.

پختگان: کاماڵان، بەتەجربە و ئەزموندار.

خام: ناپوختە، ناکامڵ و بێ ئەزموون.

مەبەست لە (آب آتشگون = ئاوی ئاگر رەنگ /چون ئاگر) شەرابە کە رەنگی سوورە وەك ئاگر و گەرمی بەخشە. لەنێو ئەزموندار و کاماڵانی عەشقدا خواجە خۆی بەبێ ئەزموون دەزانێت و پێیوایە کە مەی /عەشق مرۆڤ پوختە و کامڵ دەکات.

بۆیە بەساقی دەڵێ: ئەی ساقی قومێکم لەو مەیە سوور و گەرمی بەخشە بدەرێ، تا وەك عارفان کامڵ و ئەزموندار بم چونکە من لەنێو کاماڵانی عەشقدا هێشتا ناکامڵ و خامم.

**٤- از خطا گفتم شبی موی ترا مشک ختن**
**می زند هر لحظه تیغی مو براندامم هنوز**

شەوێك بەهەڵە گوتم (بۆنی) مووی تۆ وەك بۆنی میسکی خوتەنە، کە لەو شەوەوە هێشتا هەرساتە تیغی موو بەجەستەمدا دەچەقێت.

از خطا: بەهەڵە.

ختن: خوتەن، وڵاتی خەتای خوتەن.

واتە: شەوێك بەهەڵە بۆنی پرچی تۆم بە بۆنی میسکی خوتەن چواند، کەچی لەداخ و سەرسوڕماندا هێشتا هەردەم و ساتە تیغی موو بەگیانمدا دەچەقێت و ئازارم ئەدات.

واتە کەئەم لێکچواندنەم کرد لەسەرسوڕماندا بەوە من راست بۆتەوە و وەك تیغ بەجەستەمدا دەچەقێت.

مەبەستی بەیتەکە ئەوەیەکە هەرگیز بۆنی مووی تۆ بەبۆنی میسك بەراورد ناکرێت و ئەم کارە جێگەی سەرسوڕمانە کەی میسکی (حادث) بەبۆنی مووی (قدوم)ی تۆ دەگات.

لەفەرهەنگی عیرفانیدا (موو) مەرتەبەی سیفاتە، واتە ئەی یار شەوێك بەهەڵە سیفاتی تۆم بەسیفاتی دونیایی چواند دوچاری خەجاڵەتی و سەرزەنشتێکی زۆر بووم.

**٥- نام من رفتست روزی بر لب جانان به سهو**

**اهل دل را بوی جان می آید از نامم هنوز**

رۆژێك یار بەهەڵە ناوی منی بەسەر زماندا هاتووە، لای ئەهلی دڵ هێشتا بۆنی گیان لەناوم دێت و بۆنی دەکەن.

رفتست برلب: بەسەر لێودا هاتووە، بەسەرزماندا هاتووە، هێنراوە.

سهو: هەڵە، بەرێکەوت.

واتە: رۆژێك مەعشوق بەهەڵە ناوی منی هاتووە بەدەمدا لەوساوە ئیدی ناوی من بۆنی گیان /یاری گرتووە ئێستاش ئەهلی دڵ هەست بەو بۆنە دەکەن.

**٦- پرتو روی تورا درخلوتم دید آفتاب**

**می رود چون سایه هر دم بر در و بامم هنوز**

هەتاو تیشکی رووی تۆی لەخەڵوەتمدا بینی، بۆیە ئێستاش وەك سێبەر بەردەوام لە دەر و بانمدا دێت و دەڕوات (تابەڵکو جارێکی دیکە تیشکی تۆ ببینێ).

پرتو: تیشك ـ رووناکی.      در و بام: دەر و بان.

لەکوردیشدا کەشتێك یا کەسێك وەك سێبەر بەشت و کەسێکی دیکەوە بنووسێت مانای زۆرمانەوە و نزیك بوونەوەیە.

لە بنچینەدا هەتاو تیشك و رووناکیی هەیە، بەڵام هەتاویش گرفتاری رووناکی یارە، خواجە دەڵێ:

ئەی یار کەتۆ بە رووناکی و تیشکی خۆتەوە لەخەڵوەتخانەکەی مندا جیلوەت کرد و هەتاو ئەو تیشکەتی بینی و لەجوانیدا سەرسام بوو، بۆیە ئیدی لەو کاتەوە هەتاو بووەتە سێبەری دەر و بانەکەم و ناڕوات ـ بەو هیوایەی کەبەڵکو جارێکی دیکە پرتەوی جوانی تۆ دەرکەوێتەوە ـ.

**٧- در ازل دادست مارا ساقی لعل لبت**

**جرعەی جامی کە من مدهوش آن جامم هنوز**

ساقی لێوی یاقوتینت لە ئەزلدا قومی پێکێکی پێداوین کەمن هێشتا مەست و دڵخۆشی ئەو پێکەم.

ساقی لعل لبت: ساقی لێوی یاقوتینت، لێوی یاقوتینت کەوەك ساقییە.

مدهوش: مەدهۆش، مەست.

لێوەی یاقوتینت وەك ساقی لەرۆژی ئەزەلدا ـ الست بربکم ـ قومێکی شەرابی عەشق پێداوین ـ بەبڕوای عارفەکان خوا لە ئەزەلدا عەشقی فێری مرۆڤ کردووە و چل شەوی ئیلاهی



هەویری ئادەمی بەعەشقەوە شێلاوە ـ ئیدی لەوکاتەوە ئێمە مەستی پێکی تۆ بووین و من هێشتاش هەربەوپێکە مەست و مەدهۆشم.

**٨- ای کە گفتی جان بده تا باشدت آرام دل**

**جان بە غمهایش سپردم نیست آرامم هنوز**

ئەی ئەو کەسەی کەگوتت گیانت تەسلیم کە تا یار ببێتە ئارامی دڵت، گیانم سپاردە غەمەکانی کەچی هێشتا ئارامم نییە.

جان بدە: گیان تەسلیم کە، گیان ببەخشە بەخت کە، گیان بکە قوربانی.

سپردم: سپاردم.

(آرام دل) لێرەدا مەعشوقە، خواجە بە (ئەو- رەنگە مورشید بێت) ئەی ئەوکەسەی بەمنت گوت گیان بەخت کە تا یادی ئارامی دڵ ببێتە ئارامی دڵت، گیانم سپاردە غەمەکانی عەشقی یار و کەچی هێشتا ئارامم نییە.

**٩- در قلم آورد حافظ قصەی لعلِ لبت**

**آبِ حیوان می رود هردم ز اقلامم هنوز**

حافظ جارێك چیرۆکی (باسی) لێوی یاقوتینی تۆی بەقەڵەم نووسییەوە، لەوساوە بەردەوام ئاوی حەیات لە قەڵەمەکانم دەڕوات (هەرچی ئەنووسم وەك ئاوی حەیاتە).

در قلم آورد: نووسییەوە، خستیەسەر پەڕە.

آب حیوان: ئاوی حەیات، ئاوی نەمری.

جارێکیان حافظ بە قەڵەمەکەی باسی لێوی یاقوتینی تۆی نووسیوە لەپیرۆزی لێوی یاقوتینتەوە لەو کاتەوە تەواوی قەڵەمەکانی حافظ پیرۆزبوون و لەبری مەرەکەب ئاوی نەمرییان لێ دەچۆڕێت واتە نووسینەکانم وەك ئاوی نەمری وان و نەمرن ئەمەش لەفەڕ و پیرۆزی باسی تۆوەیە.

## غەزەلی دووسەد و شەست و سێهەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسلەمی موسبەغ**

**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان)**

**١- دلم ربودەی لولی وشیست شورانگیز**

**دروغ وعده و قتّال وضع و رنگ آمیز**

دڵم رفێنراوی لوولی ئاسایەکی فیتنەئەنگێزەکە پەیمانی درۆ ئەدات و وەك پیاوکوژانە و فریودەرە.

ربودە: رفێنراو، شەیدا و ئاوارە.

لولی: کولی، قەرەچ، دۆم ـ گۆرانیبێژی کۆڵان گەر، جوان، رەمزی جوان بوون.

لولی وش: لوولی ئاسا، جوانی وەك خوانی لوولی.

شورانگیز: فیتنە هەڵگیرسێنەر. دروغ: درۆ. وعده: پەیمان.

قتال: بکوژ. قتال وضع: وەك قاتڵان.

رنگ آمیز: فریودەر، مەکراو حیلەگەر.

دڵم شەیدای یارێکی زۆر جوانی فیتنە و ئاشوب هەڵگرسێنەرە کە پەیمانە درۆکانی فیتنە دەنێتەوە و لەقاتڵان دەچێت و فریودەرە.

لاهوری ئەگەری ئەوە دادەنێت کە رەنگە مەبەست لە (لولی وش و شورانگیز و دروغ وحدە و قتال و وضع رنگ آمیز) + شاخ نبات- بێت کەکچێکی لوولی بووە و حافظ شەیدای بووە {لاهوری، ج٣، ل١٨٠٣}.

**٢- فدای پیرهن چاك ماهرويان باد**

**هزار جامەی تقوی و خرقەی پرهیز**

هەزار کراسی تەقوا و خۆپارێزی بەفیدای کراسی دڕاوی جوانان بێت.

پرهیز: خۆپارێزی، دوورەپەرێزی و تەقوا.

خواجە لێرەدا هەزاران کراسی تەقوا و خۆپارێزی عابید و سۆفییە ساویلکەکان دەکاتە قوربانی کراسی دڕاوی جوانان.

زۆربەی راڤەکاران (جوانان) بە (لولیان) لێکدەدەنەوە، ئەوسادانەی کە بەکراسی دڕاویانەوە جوانییە سروشتییەکانیان دەردەکەوێ، بەڵام لاهوری لەشەرحەکەیدا ئەم چیرۆکەی گێڕاوەتەوە



کەتیایدا هاتووە: ((لە کتێبە مێژووییەکاندا هاتووە کە شێخ اوحدالدین کرمانی ـ قدس سره ـ لەسەماعدا گەرم دەبوو کراسی موریدانی دەدڕاند و سنگی دەنا بەسنگیانەوە ـ.{ لاهوری، ج٣، ل١٨٠٤}

بەمەش وەك هەمیشە حافظ عابیدان و سۆفیلکەکان دەکاتە قوربانی عارفە/ عاشقە راستەقینەکان.

**٣- فرشته عشق نداند که چیست ای ساقی**

**بخواه جام و گلابی به خاكِ آدم ریز**

ئەی ساقی فریشتە نازانێ عەشق چییە، داوای پێك بکە و گوڵاوێکیش بپرژێنە بە خاکی ئادەمدا.

بخواه: داواکە. گلابی: گوڵاوێك، واتە: هێندەی گوڵاوێك، چەند دڵۆپێك.

لای عارفەکان ئەو ئەمانەتەی کەخوای گەورە تەنیا بەمرۆڤی داوە، (عەشق)ە، بۆیە غەیری مرۆڤ هیچ مەخلوقێکی دیکە توانای هەڵگرتنی باری ئەمانەتی خوایی- عەشقی- نەبوو، مرۆڤ هەڵیگرت بۆیە فریشتە هەرگیز لەواتای عەشق ناگات، ملاجلال الدین محمد دوانی هۆی نەزانینی عەشق لەلایەن فریشتەوە بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە کە عەشق بەرهەمی دووری و دابڕانە لەبەرئەوەی فریشتە وەك مرۆڤ لەحەق دوورنەکەوتەوە لەعەشق تێناگات و تەنیا مرۆڤ لێی تێدەگات. { لاهوری، ج٣، ل١٨٠٤}.

عەشق لای خوا زۆر گەورەیە و بۆیە بەمرۆڤی داوە بەگوتەی خواجە یحیی معاذ خوا فەرموویەتی: ((کەعەشق و خۆشەویستی لەغەیب هاتەدەرەوە و گەیشت بەعەرش گەورەیی دی و گەیشت بەکورسی بڵندی بینی و گەیشتە بەهەشت نیعمەتی بینی و گەیشتە دۆزەخ سزای بینی و گەیشتە فریشتە عیبادەت و خواناسی بینی وگەیشت بە ئادەم مەینەت و نارەحەتیی بینی، لەوێدا وەستا و گوتی: ئێمە لەمانای ڕاز و راستییەکاندا هاوڕێکین)).

هەرچۆن بێت فریشتە لەعەشق بێ ئاگایە ئیدی لەنەشیاویانەوە یالەنزیکیانەوە بێت لەحەق مرۆڤیش هەڵگری عەشق و مەینەتییەکانیەتی، خواجە لەم راستییە عیرفانییە بەساقی دەڵێ: ئەی ساقی فریشتە نازانێ عەشق چییە، داوای پێکێ بکە و چەند دڵۆپێکیش وەك خێر بپرژێنە بەسەر گۆڕەکەی ئادەمدا. کەئەو یەکەم کەس بوو ئەم مەی/ عەشقەی قەبوڵکرد.

میسراعی یەکەمی ئەم بەیتە ئەم دوو شێوەیەی دیکەی هەیە:

(**به شکر آنکه به حسن از فلك ببردی گوی** = بەسوپاسگوزاری ئەوەی کەلەفریشتەت بردەوە و عەشق بووە بەشی تۆ) ـ سودی ـ.

(**فرشته را خبر نیست از عشق قصه مخوان** - فریشتە ئاگای لەعەشق نییە باسی بۆ مەکە) ـ لاهوری ـ.

**٤- غلام آن کلماتم که آتش انگیزد**

**نه آب سرد زند در سخن بر آتش تیز**

غولامی ئەو وشانەم کەئاگر هەڵدەگیرسێنێ، نەئەو وشانەی کەلەکاتی قسەدا ئاوی سارد ئەکات بەسەر ئاگری تیژدا.

آتش انگیزد: ئاگر هەڵدەگیرسێنێ، واتە (ناخ دەهێنێتە جۆش و خرۆش).

آتش تیز: ئاگری تیژ و خۆش.

خواجە خۆی دەکاتە غولامی ئەو وشانەی کە دەروون دەخاتە جۆش و خرۆش و عەشق دەهێنێ کەقسەی عاشقانەو عاشقانە، نەئەو وشانەی کەجۆش و خرۆشی هەڵگیرساوی ناخ دادەمرکێنێتەوە و وەك ئاوی ساردن کە بیکەن بەسر ئاگردا.

واتە: خواجە خۆی دەکاتە غولامی قسەی عەشق نە قسەی غەیری عەشق.

**٥- فقیر و خسته به درگاهت آمدم رحمی**

**که جز ولای توام نیست هیچ دستاویز**

فەقیر و خەستە هاتمە بەردەگات، رەحمێکم پێ بکە، چونکە جگە لەخۆشەویستی و (ولاء)ی تۆ بەهیچ شتێکی دیکە ناتوانم داوابکەم.

ولا/ ولاء: خۆشەویستی، نزیکی، وابەستەیی.

دستاویز: ئەو شتەی کەبەهۆیەوە بتوانی داوابکەیت، بیانو، هۆکار.

ئەی یاری حەق، کەوتوو و ماندوو هاتمە بەردەرگات رەحمێکم پێ بکە من جگە لەخۆشەویستی تۆ هیچ چاکە یاحەقێکم نییە کەبەهۆیەوە داوات لێبکەم و بیکەمە بیانوو.

لە نوسخەکانی (تیموری) دا ئەم روونکردنەوە سوودبەخشانە سەبارەت بە (دستاویز) هاتووە:

لە(نودار قزوینی ص١٣٨) دا هاتووە: پیاوێك داوای(سواڵی) لەبەخشندەیەك کرد، وتی: هۆکار (دستاویز)ی تۆ چییە بۆ ئەم داواکردنەت، سواڵکەرەکەش وتی: ئەوەیە کەساڵێك لەمەوبەر داوام لێکردی و پێت بەخشیم، گوتی: سڵاو ـ ئافەرین ـ بۆکەسێ کە بەخۆمان داوا لەخۆمان دەکات و پاش ئەوە پارەی دایە و رێزی لێ گرت.

هەروەها ئیمام سجاد لە { مفتاح الجنان ص٢١٦} دا فەرموویەتی: ((الهي ليس لي و اليك الا عواطف رأفتك ولالي ذريه اليك مالا عوارف رحمتك)) واتە: ئیلاهی جگە لە میهر و



بەخشندەیی تۆ هیچ دەستپێیەکم نییە و جگە لە رەحمەتی بێ پایانی تۆش هیچ رێگەیەکیشم بەرەوتۆ نییە. {ص٩٠٩}

**٦- مباش غره به بازی خود که در خبر است**

**هزار تعبیه ی حکم پادشاه انگیز**

بەیاری خۆت مەغرور مەبە چونکە لە (خبر)دا هەزار نهێنی جوانی حوکمی خوای پادشا لادەر هەیە.

مباش غره: مەغرور مەبە. بازی: یاری.

خبر: گوتەی نقڵکردووی پیاوچاکان کەناگاتە ئاستی فەرموودەکانی حەزرەتی موحەمەد - د.خ- چونکە سەنەد و بەڵگەیان نییە.

تعبیه: جوانکاری نهێنی. پادشاه انگیز: پادشالادەر، پاشالابەر.

لەنوسخەی (تیموری)دا بەڵگە بۆ ئەم واتایە هێنراوەتەوە، لەسیاست نامە دا هاتووە ((محمد نخشبی چنان مستولی گشت کە وزیرانگیز وزیرنشان شد و پادشاه آن کردی که اوگفتی)) واتە ((محمد نەخشەبی، وادەسەڵاتی گرتەدەست کەوەزیر لادەدا و وەزیری دادەنا و پادشاش ئەوەی دەکرد کەئەو دەیگوت)). { ل٩٠٩}

{دیوان حافظ، نسخەی فریدون میرزای تیموری، باهتمام احمد مجاهد، زمستان ١٣٧٩، چاپ اوّل، انتشارات دانشگاه تهران، تهران} .

لەهەندێك نوسخەدا (خلخالی و شێوەکانی) ئەم بەیتە نەهاتووە، لەو نوسخانەشدا کەهاتووە جیاوازی زۆری هەیە.

میسراعی یەکەم ئەم سێ شێوەیەی هەیە:

مباش غره بەبازوی خود کەدرخبر است ـ سودی ـ.

مباش غره بەبازوی خودکەدر رخ توست ـ لاهوری ـ.

مباش غره بەبازوی خود که در خطر است ـ تیموری ـ.

هەروەها میسراعی دووەمیش بەم شێوەیە هاتووە: ((هزار تعبیه درحکم پادشاه انگیز)).

هەرچۆن بێ ـ جیاوازییەکی ئەوتۆ لەواتاکاندا نییە و بەیتەکە لەمەسەلەیەکی زۆر قوولی جەدەلی مرۆڤ و چارەنوسی مرۆڤ دەدوێت کەمەسەلەی (قدریه و جبریه)یە. کەئایا مرۆڤ خالقی کردەوەکانیەتی و ئازادی رەهای هەیە، یاخود مرۆڤ هیچی بەدەست نییە و تەنیا رۆبۆتێکە.

بۆچوونی یەکەم بۆچوونی (قدریه)کانە کەپێیان وایە مرۆڤ خۆی خالقی تەواوی کردارەکانی خۆیەتی و چارەنووس هیچ پەیوەندییەکی بەم مەسەلەیەوە نییە و خوای گەورە ئازادی رەهای

داوەتە دەست مرۆڤەکان لەبەرامبەر ئەم بۆچوونەشدا بۆچوونی توندڕەوی (جەبری) هەیە کەپێیان وایە تەواوی ورد و درشتی کردارەکان لەلایەن خواوەیە و مرۆڤ تەنیا رۆبۆتێکە کە بە فەرمانی ئەو کاردەکات و خاوەنی کرداری خۆی نییە.

لەراستیدا خواجە ئەم دوو رێبازە بەتوندرە و دەزانێت و یەکەمیان بەئاشکرا رەت دەکاتەوە.

لە (قدریە) مروڤ دەڵێت بەیاری خۆت یا بە بازووی خۆت مەغرور مەبە چونکە لەخەبەردا هەزاران چیرۆکی دەسەڵاتی خودای پادشان دەرهاتووە.

هەروەك چۆن لەفەرموودە و بەسەرهاتەکاندا چیرۆکی زۆری دەستی پەروەردگار گێردراوەتەوە کە راستەوخۆ بەشداری لەدروستکردنی بڕیارە تایبەتییەکاندا دەکات.

واتە: ئەی مرۆڤ بەیاری خۆت مەغرور مەبە و ئاگات لەدەستی پەروەردگار بێت کەحوکمی زۆری نادیار و پەنهانی هەیە و کەس ناتوانێ بەرگرییان بکات.  لەبەیتی دوایشدا درێژەبەم مەسەلەیە دەدات.

**٧- بیا که هاتف میخانه دوش با من گفت**

**که در مقام رضا باش و از قضا مگریز**

وەرە کە هاتفی مەیخانە شەوی رابردوو بە منی گوت کە رەزامەندی دەربڕە و لە قەدەر رامەکە.

هاتف: فریشتەی جیهانی غەیب کە سروش بۆ ئەولیا دەهێنێ.

مگریز: هەڵمەیە، رامەکە.

ئەی مرۆڤ، وەرە و لەبەرامبەر قەدەری ئیلاهیدا هەڵمەیە و بەدڵ رەزامەندی دەربڕە چونکە دوێنێ شەو فریشتەی سروش هێنی مەیخانەی عەشقی حەق ئەم قسانەی بەمن گوت.

واتە: ئەی مرۆڤ بەبازووی خۆتدا مەنازە و مەغرور مەبە و مل بۆ قەدەری ئیلاهی بدە و رامەکە لەبەر قەدەر ـ چونکە ئەسڵەن مرۆڤ ناتوانێ لەبەر قەدەر هەڵبێت ـ.

**٨- پیاله بر کفنم بند تا سحرگه حشر**

**به می ز دل ببرم هول روز رستاخیز**

پێکی شەڕاب بەکفنەکەمەوە ببەستە تا بەیانی رۆژی حەشر بە مەی ترسی رۆژی قیامەت لە دڵم دەرکەم.

برکفنم بند: ببەستە بەکفنەکەمەوە.    سحرگە: بەیانی، سپێدە.

حشر: رۆژی حەشر، رۆژی لێپرسینەوە و حیسابی خودا لەگەڵ بەندەکانیدا.

ز دل ببرم: لەدڵ دەرکەم.    هول: ترس، بیم.

رستاخیز: قیامەت، زیندووبوونەوە.



لە رۆژی تەنیا (عەشق / مەی) یە کە بەهانای مرۆڤەوە دێت، هەروەك خواجە خۆی دەڵێ:

((عشقت رسد بەفریاد.......= عەشق ئەگاتە فریات)) بۆیە حافظ داوادەکات لەرۆژی مەرگیدا پێکی شەڕاب بەکفنەکەیەوە ببەسترێت و بنرێتە گۆڕەوە، تا سپێدەی رۆژی حەشر کە رۆژێکی زۆر ترسناکە لەترسناکی ئەو ڕۆژەدا دایك منداڵی خۆی بەجێ دەهێڵێ سکپڕەکان سکەکانیان دەخەن و خەڵکی لەترسا وەك سەرخۆشیان لێ دێت  وەك حەق لەسورەتی (الحج) دا باسی ئەوڕۆژە ترسناکە دەکات و دەفەرمووێت ((یاایها الناس اتقو ربکم ان زلزلة الساعة شيئ عظيم (١) يوم ترونی، تذهل کل مرضعة عما ارضعت وتضع کل ذات حمل حملها وتري الناس سکري وماهم سکرني ولکن عذاب الله شديد(٢))).

خواجە بەمەی ترسناکی ئەو رۆژی حیساب و زیندووبوونەوەیە لەدڵی دەربکات و لەبیری خۆی بباتەوە.

**٩- میان عاشق و معشوق هیچ حایل نیست**

**تو خود حجاب خودی حافظ از میان برخیز**

لەنێوان (عاشق و مەعشوق) دا هیچ پەردەیەك نییە، تۆ خۆت پەردەی خۆتی حافظ لەونێوانەدا هەستە.

حایل: پەردە، حیجاب.    میان: نێوان، نیوەند.

برخیز: هەستە، لاچۆ.

بوونە پەردەی خودی خۆمان لەنێوان ئێمەی عاشق و مەعشوقی حەقدا مەسەلەیەکی قووڵی عیرفانییە، هەرلەوساوە کە مرۆڤ لەرۆحی خودایی دروستبوو کرا بە بەرجەستەی خاکیدا ئیدی هاتە نێو دونیای ماددی و ماڵۆچکەی بوونی ماددییەوە، هەرلەبەر ئەوەشە کە تاخۆمان (بەجەستەمانەوە) هەبین پەردەی نێوان ئێمە وەسڵی مەعشوقین و هەر لەگەڵ لاچوونی خۆمان (بەمەرگ یان فەنا) بەمەعشوقی حەق شاد دەبین و یەکدەگرین.

کاریگەری ئەم مەسەلەیە-پەردەی جەستە- دەقی جوانی ئەدەبی هێناوەتە ئارا کەلێرەدا هەندێکیان دەنووسینەوە و باسیان دەکەین:

١- حسین مەنسوری حەللاج ـ قدس سرە ـ:

**بینی وبینک انی یزاحمنی**

**فارفع بلطفک إنّي من البين**

واتە: لەنێوان من و تۆدا خۆمم پەردە و جیاکەرەوە، بەلوتفی خۆت خۆم لەم نێوانەدا لابەرە و هەڵی گرە.

٢- ابوالسعيد ابو الخير: ((شيخ پێی گوتم: پەردەی نێوان بەندە و خوا ئاسمان و زەوی نییە، عەرش و کورسی نییە، گومان و منی تۆ حیجابە، هەڵێگرە و لایبە، بە خودا دەگەیت)).

٣- مەولانا جلال الدين بلخى:

**زير ديوار وجود تويى گنج گهر**

**گنج ظاهر شود ار تو ز ميان برخيزى**

لەژێر دیواری بووندا تۆی گەنجی گەوهەر گەر تۆ لەنێواندا لاچیت گەنج دەردەکەوێت.

٤- عیراقی:

**گر عراقى برون شدى ز ميان**

**دلبر اندر كنار داشتمى**

عیراقی گەر لەنێواندا لاچووبای یارم لەتەنیشتدا دەبوو. {تیموری، ل ٣٩٨}

٥-مير محقق حسينى: لەنێوان گیان و یاردا هیچ دوورییەك نییە، مەقسود و ئامانج حاسڵە بەڵام تۆ حەوسەڵەت نییە و ناتوانی هەستی پێ بکەیت.{ لاهوری، ج٣، ل١٨٠٩ }

٦-امام کاظم:

**((ليس بينه و بين خلقه حجاب غير خلقه))**

واتە لەنێوان ئەو دروستکراوەکانیدا پەردە نییە، جگە لەخودی مەخلوقات خۆیان.

٧-امام سجاد:

**((وانک لا تحتجب عن خلقک الا ان تحجبهم الا عمال دونک))**

واتە: تۆ لەبەندەکانت نادرنیت و پەردەتان لەنێواندا نییە جگەلەوەی کە ئەوان بەکردارەکان خۆیان دەبنە پەردەی سەرخۆیان.

٨- فريد الدين عطار نيشاپوری:

**مادرين ره حجاب خويشتنيم**

**ورنه روى تو در برابر ماست**

واتە: ئێمە لەم ڕێگەیەدا پەردەی خۆمانین، گەرنا ڕووی تۆ لەبەرامبەر ئێمەدایە.

٩-خواجووی کرمانی:

**ز روى خوب تو گفتم كه پرده برفكنم**

**ولى چو درنگرم پرده و رخ تو منم**

وتم پەردە لە ڕووی جوانت لادەم، بەڵام کە سەیر دەکەم ـ ورد بوومەوە- پەردەی تۆ منم ـ خۆمم ـ. {تیموری، ل٩١٠}



ئەم داوایەی حافظ بۆخۆی ئەکرێ وەڵامدانەوە و بەدەمەوەچوونی فەرموودەی قودسی ((اترك نفسك وتعال)) نەفست بەجێی بهێڵە و وەرە، ئەم بۆچوونە عیرفانییە وایکردووە کە عارفەکان بەهیچ شێوەیەك ئاوڕ لە جەستە نەدەنەوە و ئیهمالی بکەن تەنانەت تائەو ڕادەیەی کە گۆشەگیری هەڵبژێرن و پشت لەژیانی کۆمەڵایەتی و واقعی بکەن.

بەهەرحاڵ خواجە حافظ وەك تەواوی عارفەکانی دیکە ئەم ڕاستییە عیرفانییە دەردەبڕێت کە لەنێوان عاشق و مەعشوقدا هیچ پەردەیەك نییە و خوا زۆر نزیکە لە بەندەوە وەك حەق لەسورەتی (ق) ئایەتی (١٦) دا دەفەرمووێ ((ونحن اقرب اليه من حبه الوريد)) واتە: ((ئێمە لەڕەگی بناگوێی مرۆڤ لێی نزیکترین))، تەنانەت پێغەمبەر ـ د.خ ـ باس لە (نفحات: هەناسە)ی ڕەحمانی دەکات کەخوا هێندە لە بەندەکانی نزیك دەبێتەوە تائاستی هەستکردن بەهەناسەی حەق.

لەگەڵ ئەم نزیکییەی حەقدا ئێمەی مرۆڤ بەهۆی لاوازی جەستەییمانەوە هەستی پێ ناکەین بۆیە تەواوی عارفەکان و-لێرەدا ـ خواجە داوای لابردن و لاچوونی ئەم پەردەیەی جەستە دەکەن.

## غەزەلی دووسەد و شەست و چوارەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەحزوف**

**(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)**

**١- ای صبا گر بگـذری بر ساحل رود ارس**

**بوسه زن بر خاک آن وادیّ و مُشکین کن نفس**

ئەی سەبا گوزەرەت بەکەناری رووباری ئاراس کرد خاکی ئەو دەشتە ماچ کە و نەفەست میسکبارکە.

بگـذری: گوزەربکەی، گوزەرت کرد. ساحل: کەنار.

ارس: ئاراس، رووباری ئاراس کە دەکەوێتە نێوان ئێران و رووسیا، لە نزیك ئازەربایجان و تەبرێزەوە.

بوسەزن: ماچ بکە، ماچکە. وادی: دەشت.

ئەی سەبا گەر رۆیشتی بۆلای تەبرێز و رووباری ئاراس خاکی ئەو ناوە ماچکە-کە یار لەوێیە- چونکە یار بەسەریدا رۆیشتووە و هەناسەت میسکداربکە.

بەڕای د.غنی و (هرویش لەوی وەرگرتووە) {هروی، ج٢، ل١١٣٤ } ئەم غەزەلە بۆ شاه شوجاع گوتراوە کاتێ کە لە تەبرێز بووە، بۆیە خواجە بەسەبا دەڵێ، ئێستا کە یار لە تەبرێزە و بەدەشتی دەوروبەری رووباری ئاراسدا تێپەڕیوە و ئەو خاکە بۆنی گرتووە ـ کەبۆنی میسکە ـ بۆیە گەر رۆیشتی بۆ ئەوێ خاکی ئەوناوە ماچکە تاهەناسەت بۆنی میسك بگرێت و بۆنخۆش بێت.

بەبوونی ناوی رووباری ئاراس، هەر لێکدانەوەیەکی عیرفانی لەبەیتەکە دەسەندرێتەوە و ناکرێ لێکدانەوەی عیرفانی بۆ ئەم بەیتە بکرێت، هەرچەندە لاهوری رووباری ئاراسی بە (دەریای ئەحەدیەت - یەکتایی) ناودەبات.

**٢- منزل سلمی که بادش هردم از ماصد سلام**

**پر صدای ساربانان بینی و بانگ جرس**

مەنزلی سەلما کەلەئێمەوە بەردەوام سەد سەلامی لێ بێت بە پڕ لە دەنگی وشترەوانان و زەنگەکانی دەبینی.

سلمی: سەلما، ناوی ئەدەبی مەعشوقە. صد سلام: سەد سڵاو، سەلامی زۆر.

ساربان: وشترەوان.



ئەی سەبا کە دەڕۆی بۆ لای یار، مەنزڵگەی یار- لەهەرساتە هەزاران سەلامی ئێمەی لێبێت ـ بەم شێوەیە دەبینی و پڕە لەدەنگ و هاواری وشترەوانەکان و تەقەتەقی زەنگی ملی وشترەزۆرەکان. بەم پێیە لێرەدا خواجە مەنزڵگەی یار بەسەبا دەناسێنێ.

**٣- محمل جانان ببوس آنگه به زاری عرضه دار**

**کز فراقت سوختم ای مهربان فریادرس**

کەژاوەی یار ماچکە و ئەوکاتە بەگەریانەوە عەرزی کە، کە لە دووریدا سووتام ئەی میهرەبانی فریادرەس.

محمل: کەژاوە. ببوس: ماچکە. آنگه: ئەوکاتە.

بەزاری: بەگریان و زارییەوە. عرضه دار: عەرزی کە، پێی بڵێ. سوختم: سووتام.

ئەی سەبا کەگەیشتیتە لای یار کەژاوەکەی ماچبکە و بەگریان و زارییەوە حاڵی منی عەرزکە کەئەی میهرەبانی فریادرەس لەدووریتدا سووتاوم.

**٤- من که قول ناصحان را خواندمی قول رباب**

**گوشمالی دیدم از هجران که اینم پند بس**

من کەگوتەی ئامۆژگاری کەرانم بەئاوازی رباب دایە قەڵەم (گوێ بادان)ێکم لەهیجرانی کەئەمەبووە پەند بۆم و بەسمە.

قول: قسە- لەجاری دووەمدا بەمانای ـ ئاواز و نەغمە هاتووە ـ.

گوشمال: گوێ بادان، گوێراکێشان بەمەبەستی تەمێ کردن و مۆچیاری کردن، تاڵی تەلی بەساز و کەمانچە بەدوکە- برغویەکی دارینە وە پێچراوە و سەرێکی پانی وەك گوێی هەیە و لەکاتی رێککردندا ئەوسەرە پانە بادەدرێت و رێکدەکرێت، خواجە ئەم گوێبادانەی بەکارهێناوە.

ئەو دەڵێ: من کەگوێم بە قسەی ئامۆژگاری کەران نەئەدا و قسەی ئەوان و نەغمە و ئاوازی روبابم لایەك بوو، کەهیجران و دووری یار بەجۆرێ گوێی بادام و هۆشیاری کردمەوە کە ئەمەم بەسە و پەندی لێ وەردەگرم.

**٥- عشرت شبگیرکن بی ترس کاندر شهر عشق**

**شبروان را آشنایی هاست با میرِ عسس**

بێ ترس خۆشی شەوانە بگوزەرێنە چونکە لەشاری عەشقدا شەورەوان (شەوکوتانی عەشق) لەگەڵ سەرۆکی حەسسەکاندا ئاشناییان هەیە.

شبگیر: شەوانە، نیوەشەوان

شبروان: دزانی شەو، شەوکوتان، ئەو عاشقانەی شەوان بەدزییەوە عەشقبازی دەکەن.

عسس: حەسس، پاسەوان.

میرعسس: سەرۆکی پاسەوانەکان.

شەوانە تادرەنگ خەریکی خۆشی و هاودەمی عەشق بە و لەهیچ کەس مەترسە، چونکە لەشاری عەشقدا ئەوانەی شەوانە بەدزییەوە خەریکی عەشقبازین لەگەڵ سەرۆکی پاسەوانەکاندا ئاشنایەتی و دۆستایەتییەکیان هەیە و لە پاسەوان مەترسە.

لەنوسخەی (خلخالی ـ قزوینی) دا لەبری (بی ترس کاندر شهر عشق) (می نوش کاندراه عشق) هاتووە. بەڵام لەتەواوی نوسخەکانی دیکەدا بەم شێوەیەی ئێستا هاتووە تەنانەت لەنوسخەی (بادلیان و پنجاب)ی خلخالیشدا هەربەم شێوەی ئێستایە. {بڕوانە دیوانی حافظ، د.خرمشاهی، ل٢٦٧}

**٦- عشقبازی کار بازی نیست ای دل سر بباز**

**ورنه گوی عشق نتوان زد به چوگان هوس**

عەشقبازی یاری منداڵان نییە ئەی دڵ سەر بەختکە، گەرنا ناتوانرێ بەگۆچانی هەوەس لەگوێ عەشق بدرێت.

بازی: یاری منداڵان. بباز: بەختکە، فیداکە، دانێ. چوگان: گۆچان.

بێگومان عەشق کارێکی سەختە و یاری منداڵانە نییە و هەمووکەسێك ناتوانێ عاشق بێت و گیان و سەر فیداکات لە پێناو عەشقەکەیدا، خواجە دڵی خۆی ئاگادار دەکاتەوە کەئەی دڵ ئاگاداربە عەشق و عاشقی یاری منداڵان نییە گەر لەخۆت گوێ عەشق نابڕێتەوە بەڵکو بەسەبر و زەحمەت قەبوولکردن.

ئارەزوو لەشەرحی ئەم بەیتەدا نووسیویەتی عەشق لە (عشق)ەوە داڕێژراوە کە (عشقە)ش گیایەکە (خەیاتە) بەدرەخت وگیای دیکەوە دەئاڵۆسکێت و لەسەر رەگەکەی ئەو دەژی و لەوخواردن وەردەگرێت و گۆنای ئەو زەرد دەکات و هێزی لێدەبڕێت و هەستەکان لەبەرژەوەندی قەدەغە دەکات و نارەحەتی و سەختی دەهێنێت.

ئەی دڵ بزانە عەشق ئاسان نییە، عەشق دەریایەکی بێ کەناری پڕ لە شەپۆلی بێ ئامان و گێژاوی ترسناکە. عەشق رێگەیەکی دوور و درێژی دوایی نەهاتووی وشکە، عەشق بیابانێکی پڕ لە درك و داڵ و دڕندەیە، مەولانا گوتەنی: عەشق قومارێکە کەهەموان تیایدا دۆڕاوین و براوەی نییە ـ هیچ بەرژەوەندییەکی تێدا نییە ـ. بەڵام: خنك آن قمار بازی خۆش بەحاڵی ئەو قوماربازانەی ـ عەشقەی ـ کەهەرچی هەبوو دۆڕاندی جگە لە ئاواتی قومارێکی دیکە.



**٧- دل به رغبت می سپارد جان به چشم مست یار**

**گرچه هشیاران ندادند اختیارِخود به کس**

دڵ بەرەغبەتی خۆی گیان بە چاوی مەستی یار دەسپێرێ، گەرچی هوشیاران ئیختیاری خۆیان نەداوە بەکەس.

بەرغیت: بەرەغبەت و ئارەزووی خۆی، بەویستی خۆی.

گەرچی هۆشیاران و عاقڵان ئیختیاری خۆیان نەداوەتە دەست کەس کەچی دڵی من کە عاشقی چاوی مەستی یاربووە بەرەغبەت و ویستی خۆی گیانی دەبەخشێتە چاوی مەستی یار و شەیدای دەبێ.

خواجە کە لەبەیتی پێشوودا لە عەشق و گرانی عەشق دوا لێرەدا ئامادەگی دڵی خۆی بۆ مەعشوقی حەق دەردەخات و دڵی پێشکەش دەکات.

**٨- طوطیان در شکّرستان کامرانی می کنند**

**وزتَحَسُّر دست بر سر می زند مسکین مگس**

توتیان لەشەکرستاندا خەریکی کامەرانین و مەگەزی داماویش لە حەسرەتدا دەست دەکێشن بەسەریاندا.

شکرستان: شەکرستان، شوێنی شەکر ـ ئەکرێ درکە بێت لەشوێنێ کەپڕبێت لەقسەی خۆش و مەجلیس گەرم بێت ـ شوێنی شادی و فەرەح.

تحسر: حەسەرەت.

دست بر سرمی زند: دەست دەکێشێ بەسەریدا، دەست دەماڵێ بەسەریدا.

مسکین مگس: مەگەزی داماو.

دەست بەسەرداکێشانی مەگەزی داماو لەتاو دووری و دابڕانیەتی لەشەکرستان و شوێنی خۆشی و شادی ئەکرێ لێرەدا مەگەزی داماو عاشق بێت کە دوورە لەمەینۆشی و خۆشگوزەرانی و توتیانیش بارسوك و مادەلەوحەکان بن کەئاگایان لە رۆح و عاشق نییە، دونیا هەمیشە شوێنی ئەو بارسوك و سادەلەوحانەیە لەکاتێکدا کەعاشقەکان بەنارەحەتی و دەردەوە ژیانی دابڕان بەسەردەبەن توتی ئاساکان کە هەرئەوە دەزانن بلێنەوە ـ کە ئەکرێ فەقیهەکان بن یاخەڵکی رەمەکی و جفاك- خۆشحاڵ و شادبن.

**٩- نام حافظ گر برآید بر زبان کلك دوست**

**از جناب حضرت شاهم بس است این ملتمس**

گەر ناوی حافظ بەسەر زمانی قەڵەمی دۆستدا بێت- حیسابی بۆبکات، لەدەرگای حەزرەتی شادا ئەم داوایەم بەسە.

برآید: بێت.　　جناب: دەرگا، ئاستانە.　　ملتمس: داوا.

خواجە لەئاستانەی دۆستدا کەوتووە و داوایەکی هەیە ئەویش ئەوەیەکە یار/حەق حیسابی بۆبکات و ناوی حافظ لەقەڵەمەکەیدا بێت.

جارێکیان پیاوێك بەحەزرەتی موسا ـ ع ـ یگوت: ئەی حەزرەت بزانە مەقامی من لای خوا لەکوێدایە کەحەزرەتی موسا ـ د.خ ـ گەڕایەوە پێی فەرموو خوای گەورە فەرمووی پلەوپایەت لەبنی جەهەنم دایە پیاوەکە زۆر دڵخۆش بوو، حەزرەت لێی پرسی: من گوتم لەجەهەنم دای بۆچی دڵخۆشی ؟

پیاوەکە وتی: گرنگ نییە لەکوێدام: مادام، خواحیسابی بۆمن کردووە و منی لەبیر نەکردووە دڵخۆشم.

هەروەها خواجە عبداللە انصاری لەموناجاتەکەیدا دەڵێ: ((ئیلاهی ئەگەر بڵێی بەندەی من، لەعەرش تێدەپەڕێ خەندەی من)) {بەنقل از لاهوری، ج٣، ل١٨٣٢}.

خواجەش لەم بنەماوە ئەم قسە شیرینە دەکات کەگرنگ ئەوەیە ناوی بەقەڵەمی دۆستی حەق ـ جل شأنە ـ دا بێت.

هەرچەندە بەیتی یەکەمی غەزەلەکە ـ رووباری ئاراس ـ ی تێدایە، بەڵام لەنێوەڕۆکی غەزەلەکەدا ئاماژەی ئاشکرا بۆشاشوجاع نەکراوە و غەزەلێکی سەراپا داڕنراو موجەڕەدە.

لێرەدا بەپێویستی دەزانم لەمەسەلەیەکی گرنگ بدوێم کەڕێکخستنی غەزەلەکانی دیوانی خواجەیە: تائێستا شێوازێکی یەکگرتوو لەڕێکخستنی تەرتیبی غەزەلەکانیدا پەیڕەو ناکرێت و هەر لێکۆڵەر و رەخنەگرێك یاساغکەرەوە و راڤەکەرێکی دیوانی حافظ بەجۆرێك غەزەلەکان تەرتیب دەکات و ریزیان دەکات. دروستە کەتەواوی نوسخەکان بەپێی پیتی قافیە غەزەلەکان رێکدەخەن بەڵام لەنێویەك پیتی قافیەدا جیاوازی لەنێوان نوسخەکاندا هەیە، بەم شێوەیە:

١- هەندێك نوسخە بەپێی تەرتیبی هیجایی پێش پیتی قافیە غەزەلەکان رێکدەخەن ـ وەك لاهوری ـ.

٢- هەندێك نوسخە پشت بەنوسخە دێرینەکان دەبەستن لە رێکخستندا ـ وەك عیوضی ـ.

٣- لەهەندێك نوسخەدا پیتی سەرەتایی میسراعی سەدری ـ یەکەمی ـ یەکەمین بەیتی غەزەلەکە کراوەتە پێوەر و لەنێو چەندین غەزەلی یەك قافیەییدا یەکەم غەزەل ئەو غەزەلەیە کە بە یەکەمین پیتی هیجایی دەستپێدەکات بەتەرتیب -لاهوری-.



شێوازی سێیەم لای رەخنەگر و ساغکەرەوە نوییەکان پەسەند نەکراوە و هەرچ شێوازی یەکەم و دووەمە پەیڕەو دەکرێت.

هەرچەندە پێش و پاش خستنی غەزەلەکان لەگەوهەر و ناوەڕۆکی هیچیان کەم ناکاتەوە تەنانەت زیادیشیان ناکات بەڵام بەندە پێموایە پەیڕەوکردنی بۆچوونی دووەم ـ واتە پشت بەستن بەنوسخە دێرینەکان ـ دروستترین رێگەی رێکخستنی غەزەلەکانە.

بۆ نموونە ئەم غەزەلەی سەرەوە لەزۆربەی نوسخەکاندا یەکەمین غەزەلی پیتی ـ س ـ یە بەڵام لای د.هروی دوایین غەزەلی ئەم پیتەیە ئەویش لەبەرئەوەی کەپێش (س) (ف) هاتووە و دەکەوێتە دواوەی پیتەکانی دیکەوە.

بەهەرحاڵ ئێمە لێرەدا بەپێی توانا سوودمان لەڕێکخستنە دێرینەکان وەرگرتووە.

## غەزەلی دووسەد و شەست و پێنجەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی ئەسڵەمی موسبەغ**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فع لان)**

**١-گلعذاری ز گلستان جهان ما را بس**

**زین چمن سایەی آن سروِ روان ما را بس**

ئێمە لەباخی دونیادا گوڵ رووخسارێکمان بەسە و لەم مێرگەشدا سێبەری ئەو سەروە بەژنرێکەمان بەسە.

عذار: رووخسار.        گلعزار: روخسار گوڵ، یارێ کە رووخساری وەك گوڵە.

ما رابس: بۆئێمە بەسە، بەسمانە.

لەم باخی جیهانەدا ئێمە یارێکی رووخسار وەك گوڵمان بەسە و هەرلەم مێرگی دونیایەشدا گەرسێبەری ئەویارە بەژنرێکەمان لەسەر بێت بەسمانە.

**٢- من و همصحبتیِ اهل ریا دورم باد**

**از گرانان جهان رطل گران ما را بس**

من و هاودەمی ئەهلی ریا خوانەکا (لێم) لەگرانەکان (قورسەکان)ی جیهاندا ئێمە جامی قورسمان بەسە.

دورم باد: خوانەکا، دوورەلەمن.

گرانان: ئەوانەی قورس وگرانن، ئێسك گرانەکان.

گران جگە لەواتای زمانی (قورس) لەفارسیدا بەواتای ئێسك گران دێت و لێرەدا خواجە یەکەمجار مانای دووەمی بەکارهێناوە و جاری دووەم بەمانای یەکەم بەکاری هێناوە.

من و هاوڕێیەتی و هاودەمی ئەهلی ریا-کەئێسك گران و رەزاقورسی دونیان- رێی تێ ناچێت و خوانەکا ئیشی وابکەم کەلەگەڵ ئێسك گرانەکانی دونیادا بم، ئێمەی عاشقان گەر پێکی قورس و پڕی شەرابمان /عەشقمان هەبێت بۆ هاودەمی و هاوڕێیەتی بەسمانە.

**٣- قصر فردوس به پاداش عمل می بخشند**

**ما که رندیم وگدا دیر مغان ما رابس**

کۆشکی فیردەوس لەپاداشتی کردەوەدا دەبەخشن، ئێمە کە رەند و گەداین دێری موغانمان بەسە.



فردوس: فیردەوس، بەهەشت.        پاداش: پاداشت.

عمل: کردەوە، لێرەدا مەبەست لەکردەوەی چاکە.

دێری موغان لەشیعری حافظ دا جیهانی رەندی و عارفانە، بەگشتی جیهانی پڕفەیزی عیرفانە جۆری دینداری زاهیدان و جفاك و زۆرینەی خەڵکی دینداریییەکی بەرژەوەندیخوازانەیە و لەبەر خۆشی و بەرژەوەندی ئاخیرەت (کۆشکەکانی بەهەشت) واز لەخۆشی و بەرژەوەندی کاتی دونیا دەهێنن، بەڵام دینداری عارفان و رەندان جیاوازییەکی گەورەی لەم جۆرەی یەکەمی دینداری هەیە و ئەوان- عارفەکان /عاشقەکان- بەچاوی بەرژەوەندیخوازانەوە سەیری عەشق و دینداری ناکەن و تەنیا لە بەر مەعشوق /حەق چوونەتە نێو دەرگای بێ ئەمانی عەشقەوە.

خواجە لێرەدا ئەم جۆرە لەدینداری کردن کەئەکرێ (دینداری عاشقانە /عارفانە) بیدەینە قەڵەم لەدینداری یەکەم جیادەکاتەوە و دەڵێ: کۆشکەکانی بەهەشت بەزاهیدان و ئەوکەسانە ئەدەن کەکردەوەی چاکیان هەیە- کەجۆرێك لە تانە و تەشەری نادیاری تێدایە- بەڵام ئێمەی عاشقان و رەندی گەدایان خانەی عەشقمان (دێری موغان) بەسە و پێویستمان بەکۆشکەکانی بەهەشتە.

لە ڕاستیدا جیاوازی نێوان دینداری عارفان و زاهیدان لەوودایە کەعارفان بۆ حەق / مەعشوق هەوڵئەدەن و زاهیدان بۆ پاداشت و نیعمەتەکانی ئەو هەوڵئەدەن، ئەم هەوڵدانەش بۆ پاداشتەکان لەتەریقەتی عارفاندا لەرێ لادان و خیلافی تەریقەتە، سەعدی گوتوویەتی:

**خلاف طریقت بو کە اولیا**

**تمنا کنند از خدا جز خدا**

**٤- بنشین بر لب جوی و گذر عمر ببین**

**وین اشارت ز جهان گذران مارا بس**

لەکەنار جۆگەدا دانیشە و سەیری تێپەڕینی تەمەن بکە و ئەم ئاماژەیەشمان لەجیهانی بەسەرچوو (تێپەڕیو) بەسە.

گذر: تێپەڕین، بەسەرچوون.

**گذران:** بەسەرچوو، تێپەڕیو، شتێ لەحاڵەتی تێپەڕین و بەسەرچووندا بێت.

لەڕاستیدا ئەم بەیتە ئامۆژگارییەکە بۆ ئەو کەسانە کەبێ ئاگان لەتەمەنی خۆیان و بەجۆرێك باوەشیان بەدونیادا کردووە کە ئەڵێی هەرگیز نامرن، خواجە پێمان دەڵێ: لەکەنار

جۆگەیەکدا دانیشە و لەکاتی سەیری تێپەڕینی ئاوی نێـو جۆگەکـەدا بـیر لەتێپـەڕینی تەمـەن بکەرەوە کەهەروا وەك ئاوی نێو ئەو جۆگەیەیە بەخێراییی دەگوزەرێ، ئێمەی ڕەندانیش هەر ئـەم ئاماژە و ئیشارەتەمان لەدونیای تێپەڕیو و بەسەرچوو بەسە کە زوو بەسـەر دەچـێت و هـەرگیز ناوەستێ یاوەفای بۆ کەس نییە و فانی دەبێت.

**٥- نقد بازار جهان بنگر و آزار جهان**

**گر شما را نه بس این سود و زیان ما را بس**

سەیری نەقدی بازاڕی جیهان و ئازاری بەدەستهێنانی بکە، گەر بۆ ئێوە بـەس نییـە ئێمـە ئەم سوود و زیانەمان بەسە.

نەقـد و نەختینـەی بـازاڕی جیهـان سـوود و قـازانج و ئـازار و مەینـەتی بەدەسـتهێنانی جیهانیش بەزەرەر و زیانی بازاڕی جیهان ئەداتە قەڵەم و نەختینـەی بـازاڕی جیهـان بـەئازار و ماندووبوون دێتە بەرهەم گەرئێوە بەمە عاقڵ نابن ئیمە ئەمەمان بەسـە و تێگەیـشتووین کـە نەختینەی بازاڕی دونیا شاینی ئەو هەموو ئازار و نارەحەتییە نییە و وازمان لێ هێناوە.

**٦- یار با ماست چه حاجت که زیادت طلبیم**

**دولت صحبت آن مونس جان ما را بس**

یار لەگەڵ ئێمـەدا ئیـدی چ پێویـست دەکـات داوای زیـادە بکـەین، ئێمـە خۆشـبەختی هاودەمی ئەو ڕۆحی ڕەوانەمان بەسە.

باماست: لەگەڵ ئێمەدایە. زیادت: زیاتر، زیادە. طلبیم: داوابکەین.

مونس جان: خۆشەویستی گیان، ڕۆحی ڕەوان.

ئێمەی عاشقان کەیارمان لەگەڵدابێت ئیدی پێویـستمان بـەهیچ نییـە و گـەر خۆشـبەختی هاودەمی ئەو ڕۆحی ڕەوانەمان بەنسیب ببێت بەسمانە، ئێستاش کە لەگەڵماندایە هیچ پێویست ناکات داوای زیادە ـ ماڵی زیادە ـ بکەین.

**٧- از در خویش خدا را به بهشتم مَفرِست**

**که سرِکویِ تو از کون و مکان ما را بس**

بۆ خاتری خوا من لەبەر دەرگای خۆتەوە مەنێرە بۆ بەهەشت، چونکە لەکەون و مەکانـدا ئێمە سەرکۆڵانی تۆمان بەسە.

کون و مکان: گەردوون و شوێن، دونیا و مافیا.

لێرەدا خواجە ئەوپەڕی تەسلیم بوونی عاشق و دوایین پلەی عەشق دەخاتـەڕوو، دەڵـێ ئـەی یار من لەبەردەرگای تۆدا کەوتووم بۆخاتری خوا لـەم بەردەرگایـە دەرم مەکـە و مـەمنێرە بـۆ



بەهەشت- ئەم بەردەرگایەی تۆ لەبەهەشت خۆشترە- چونکە لەگەردوون و لـەدونیا و لەهەرچـی شوێنێکدا ئێمەی عاشقان ئەم سەرکۆڵانەی تۆمان بەسە و هیچ شوێنێکی دیکەمان ناوێت.

**٨-حافظ از مشربِ قسمت گله بی انصافیست**

**طبع چون آب و غزلهای روان ما را بس**

حـافظ گلەیی لەبەش و قیمەتی خۆت بێ ئینسافییە، ئێمـە تـەبعی وەك ئـاو و غـەزەلی ڕەوانمان بەسە.

مشرب: سەرچاوە، بەش و نسیب. بی انصافی: بێ ئینسافی، بی ویژدانی.

طبع: تەبع، سروشت.

حافظ کاتێ کەسەیری خۆی دەکات سروشت و تـەبعێکی وەك ئـاو زوڵاڵ و جـوانی هەیـە و بەگوتەی نالی- شەکربارە-ە و غەزەلی ڕەوان و جوان دەنووسێ ئیدی بەخۆی دەڵێ ئەم سروشت و توانای غەزەل دانانەوە گلەیی کردن لە سەرچاوەی قسمەتی ئەزەلی و بەشی خۆت بێ ویژدانی و بێ ئینسافییە چونکە من ئەم ڕوانەم بەسە ـ سروشتی چون ئاو و غەزەلی ڕەوان ـ.

لێرەدا خواجە بەگشتی لەوە دەدوێت کە گلەیی کردن لەبەش و نسیبی ئەزەلی بـێ ویـژدانی یە و گەربەوردی سەرنج بدەین هەر مرۆڤێك لەبوارێکـدا بەشـی زۆری پێـدراوە- ئـەم ڕوانـین و ڕوانگەیەش کاتێ دروستدەبێت کەمرۆڤ گـەورەتر بیربکاتـەوە و تـەنیا پـارە و پـوول بەبـەش و قسمەت نەزانێ.

## غەزەلی دووسەد و شەست و شەشەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسلەم**
**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لن)**

**١- دلا رفیق سفر بخت نیکخواهت بس**
**نسیم روضه ی شیراز پیک راهت بس**

ئەی دڵ بەختی چاکت بەرەفیقی سەفەر بەسە و بۆ پەیکی ڕێگە نامەگەیەن و قاسیدیش شەماڵی باخی شیرازت بەسە.

نیکخواهت: خێرخواز، چاکەکار چاکەویست.

پیك راه: قاسیدی هەواڵبەری ڕێگە، کەسێکە کە بەر لەگەیشتنی کاروان هەواڵی گەیشتنی کاروان بەشوێنی مەبەست- مەنزڵ- دەگەیەنێت، یاخود ڕابەری ڕێگە {معینیان، ل٤٤١}

خواجە بەدڵی خۆی ئەڵێ، ئەی دڵ گەر بەنیازی سەفەری بەختی بێدار و شەماڵی باخی شیرازت بەسە تابنە ڕەفیق و هاوەڵی سەفەر و قاسیدی هەواڵبەر بۆت، لەڕاستیدا ئەم بەیتە هۆگری حافظ دەردەخات بۆ شیراز و شنە و شەماڵی باخ و باخاتی شیراز و ئاوهەوای شیراز.

(سودی) پێیوایە کە مەبەست لەم بەیتە ئەوەیە کە سەفەرمەکە و لە شوێنی خۆت (شیراز)دا بمێنەرەوە {سودی، ج٣، ل١٥٨٨} (پێموایە سودی زیاتر پشتی بەبەیتی دووەم بەستووە و پێکاویشیەتی).

**٢- دگر ز منزل جانان سفر مکن درویش**
**که سیر معنوی وکنج خانقاهت بس**

ئەی دەروێش ئیدی لە مەنزڵی یار سەفەرمەکە چونکە ڕەوتی مەعنەوی و کونجی خانەقات بەسە.

سیر معنوی: ڕەوتی مەعنەوی، مەبەست لەبڕینی قۆناغەکانی عیرفان و عەشقە کەخۆی بۆخۆی سەفەرێکی پڕلەزەتە.

بێگومان دەروێش و عارفی ڕاستەقینە بەجەستە لەکونجی خانەقایەکدان و بەرۆح و مەعنەویات هەمیشە لەسەفەر و سەیری ڕۆحانیدان بۆیە خواجە پێیان دەڵێت: ئەی عارف /دەروێش لەمەنزڵی عەشقی یاری حەق دوا مەکەوە سەفەرمەکە چونکە ئەم سەفەرە مەعنەوییە و کونجی خانەقات بەسە و پێویستیت بەسەفەری جەستەیی نییە.



**٣-هوای مسکن مألوف و عهد یار قدیم**
**ز رهروان سفر کرده عذر خواهت بس**

مەیلی شوێنی خۆپێوەگرتووە پەیمان و عەهدەت لەگەڵ یاری قەدیمدا، لای یارانی سەفەرکردوو وەك عوزرەخواهی بەسە.

هوا: مەیل، هەوا. مألوف: مەئلوف، خوپێوەگرتوو. رهروان: ڕێبواران، ڕۆیشتوان.

سفرکرده: سەفەرکردوو. عذر خواه: پۆزش، عوزروخوا، داوای لێبوردن.

لێرەشدا خواجە بەدەروێش یا دڵی خۆی (کەهەمان دەروێشە) دەڵێ، کەسەفەر ناکەیت و پێویست ناکات سەفەربکەیت بۆئەوەی هاوڕێیان و ڕێبوارانی سەفەرکردووت لێت عاجزنەبن دووبیانووت بەدەستەوەیە وەك عوزر بیانهێنەرەوە کەیەکەمیان خۆشەویستی و مەیلی شوێنی خۆتە کەلات مەئلوفە و خوت پێوەگرتووە و دووەمیشیان پەیمان و عەهدی یاری حەقە کەپەیمانت پێداوە بەجێی نەهێڵی.

ئەم دوو عوزرەش هێندە گرنگ و ڕازیکەرن کەیارانی سەفەرکردوو لێت زویر نابن و ئەم دوانەت بەسە وەك عوزرخواهی و بیانووی نەڕۆیشتنت.

**٤- وگر کمین بگشاید غمی ز گوشەی دل**
**حریم درگه پیر مغان پناهت بس**

ئەگەر غەمێك لەگۆشەی دڵدا کەمینت بۆ دانێ و هێرشت بکاتە سەر بەردەرگای پیری موغانت وەك پەناگە بەسە.

کمین بگشاید: کەمینت بۆ دابنێ و هێرشت بکاتەسەر. پناه: پەنا، پەناگە.

ئەی دڵ گەر لەم تەنیاییەشدا غەمێك لەگۆشەی دڵدا کەمینت بۆ دابنێ و خەمبار بیت ئەوا بۆ ڕەواندنەوەی و ڕزگار بوون لێی بەردەرگای پیری موغانت بەپەناگە بەسە و لەمەینەتی پیری عەشق دەیڕەوێنیتەوە.

**٥- به صدر مصطبه بنشین و ساغر مئ نوش**
**که این قدر جهان کسب مال و جاهت بس**

لەسەر سەکۆی مەیخانە دانیشە و پێکی مەی بنۆشە، چونکە لەجیهاندا بەدەستهێنانی ئەمەندەت لەسەروەت و پلە و پایە بەسە.

صدر مصطبه: سەرسەکۆی بەردەم مەیخانە/ دووکان. کسب: بەدەست هێنان.

ئەی دڵ لەسەر سەکۆی بەردەم مەیخانە دانیشە و پێکی شەڕابی عەشقی حەق هەڵدە، چونکە گەر لەدونیادا ئەم پلە و سەروەتە (لەسەرسەکۆی مەیخانە دانیشتن و هەڵدانی پێکی مەیی عەشقی

حەقیقی ئیلاهی)ت دەستکەوێت بەستە و پێویستیت بەسەروەت و پلەوپایەی ترنییـە، لەڕاسـتیدا ئەم سەروەت و پلە و پایەیە(عەشقی ئیلاهی) گەوهەرێکە کە هیچ دەستکەوتێك پێی ناگات.

**٦- زیادتی مَطَلَبْ کار بر خود آسان کُن**

**که شیشەی می لعل و بتی چو ماهت بس**

داوای زیادە (ڕۆیی) مەکە و کار لەسەرخۆت ئاسانکە، کەشوشەی مەیی یـاقوتین و بـوونی وەك مانگت بەسە.

زیادتی طلب: داوای زیادەمەکە، زیادەویست مەبە.

کاربرخود آسان کن: کار لەسەر خۆت ئاسان بکە و بەتوندی مەیگرە.

واتە بەتوندی مەیگرە و(دونیا) زیادەویـست مەبـە تـۆ پێکـی شوشـەیی شـەڕابی یـاقوتی (عەشق) و بوونی مانگ ئاسا(یاری حەق)ت بەسە.

**٧- فلك بە مردم نادان دهد زمام مُراد**

**تو اهل فضلی و دانش همین گناهت بس**

گەردوون هەوساری موراد دەداتە دەست خەڵکی نەفام، تۆ ئەهلی زانست و فەزیڵـەتی ئـەم گوناهەت بەسە.

نادان: نەفام، گەلحۆ و گێل.          زمام مراد: هەوساری موراد.

ئەی دڵ تۆ ئەهلی زانست و فەزیڵەتی و سروشتی گەردوونیش وایـە کەهەوسـاری ویـست و موراد دەداتە دەست خەڵکی نەزان و نەفام و ئاواتی ئەوان دێتەدی و دونیا بەویستی ئەوانەیـە، هەربۆیە تۆ گوناهی ئەم عاقڵی و فەزیڵەتەت بەسە و باجی ئەوە ئەدەیتەوە.

**٨- بە منّتِ دگران خو مکن کە در دو جهان**

**رضای ایزد و انعام پادشاهت بس**

خومەگرە بەمنەت هەڵگرتنی خەڵکی ترەوە چونکە لەهەردوو دونیادا ڕەزامەندی یـەزدان و بەخششی پادشات بەسە.

خومکن: خومەگرە.          ایزد: یەزدان، خودا.

انعام: بەخشش.

ئەی دڵ منەتی کەسی دیکە هەڵمـەگرە چـونکە لەهـەردوو دونیـادا ڕەزامەنـدی یـەزدان و بەخششی پادشات بەسە.

واتە: لە ڕۆژی دواییدا ڕەزامەندی خودا و لە دونیاشدا بەخشش و ئەو پادشا (ملـك)ەت بەسە.



**٩- بە هیچ ورد دگر نیست حاجت ای حافظ**

**دعای نیمشب و درس صجگاهت بس**

ئەی حافظ پێویستیت بە هیچ ویردێکی دیکە نییە، نـزای نیوەشـەو و دەرسـی بـەرە بەیانت بەسە.

لێرەدا خواجە گەورەیی و بەرزی دۆعا و نزای نیوەشەو و بەرەبەیانیان ـ دەرسـی قورئـان ـ دەخاتەڕوو، بەخۆی دەڵێ: تۆ ئەم دوانەت بەسە و پێویستیت بەهیچ ویردێکی دیکە نییە.

## غەزەلی دووسەد و شەشت و حەوتەم:

**بەحری موزاریعی هەشتی ئەخرەبی مەکفونی مەقسور**

**(مفعول فاعلات مفاعیل فاعلان)**

**١-جانا تورا که گفت که احوال ما مپرس**

**بیگانه گرد و قصەی هیچ آشنا مپرس**

گیانەکێ بەتۆی گوت هەواڵی ئێمە مەپرسە، ببە بەبێگانە و هەواڵی بەسەرهاتی هیچ ئاشنایەك مەپرسە.

تورا که گفت: کێ بەتۆی گوت، کێ پێی گوتی.

بیگانه گرد: ببە بەبێگانە.

دووری یار دوورەپەرێزی ئەو لەشاعیرە، خواجە ئەم بەیتەی گوتووە و بەیار دەڵێ:

جانەکەم کێ بەتۆی گوتووە کەهەواڵی ئێمەی عاشقان نەپرسیت و لێمان بێگانە بیت و هەواڵی هیچ ئاشنایەك نەپرسی.

ئەم غەزەلە لەنوسخەی (خلخالی) دا نییە و بەمەش لە (قزوینی ـ غنی) و (د.خرمشاهی) دا نەهاتووە و (مهدی معینیان)یش لەشەرحەکەیدا نەیهێناوە.

لەڕاستیدا غەزەلەکە لەغەزەلە سادە دووبارەکانی حافظ دەچێت کەتیایدا بەسادەیی چەمکەکان دەخاتەڕوو، ئەکرێ ئەمەش هۆکاری لادانی بێت لە دیوانەکەیدا، بەڵام لەزۆربەی نوسخە دێرینەکاندا هاتووە. بەڵام جیاوازییەکی کەم لەنوسخەکاندا بەدی دەکرێت و (د.لاهوری) (٩) بەیتی هێناوە کەئەم بەیتەشی تێدایە:

**نقش حقوق صحبت و اخلاص بندگی**

**از لوح سینه محو کن و نام ما مپرس**

نەخشی حەقی دۆستایەتی و ئیختلافی بەندایەتی لەلەوحی سینەبسڕەوە و ناوی ئێمە لە کەس مەپرسە.

**٢- زآنجا که لطف شامل و خلق کریم گشت**

**جرم نکرده عفو کن و ماجرا مپرس**

لەوەوە کەلوتفت گشتگیر و رەفتاری بەخشندە هی تۆیە، گوناهی نەکراو ببەخشە و لەبەسەرهاتەکە مەپرسە.



زآنجا: لەوەوە. جرم: تاوان، گوناه. نکرده: نەکراو.

ماجرا: رووداو، بەسەرهات.

ئەی یار تۆ ئەم دوو سیفەتەت هەیە (لوتفت گشت گیرە و رەفتارت بەخشندەگییە) بۆیە لەم دوو رەفتارەوە لەو گوناهە خۆش ببە کە نەمکردووە و سەپێندراوە بەسەرماندا و لەرووداو و بەسەرهاتەکەی مەپرسە.

**٣-خواهی که روشنت شود اسرار درد عەشق**

**از شمع قصه ز باد صبا مپرس**

ئەگەر دەتەوێت نهێنی دەردی عەشقت بۆ روونبێتەوە، لەمۆم بپرسە بۆت باسکات، لە سروە مەپرسە.

روشن: رۆشن، روون، رووناك. روشن شود: بۆت روونبێتەوە.

ئەی رێبوار گەر دەتەوێت نهێنییەکانی دەردی عەشق بزانیت و بۆت روونبێتەوە ئەوا لەشەماڵی بەرەبەیان مەپرسە بۆت باسکات بەڵکو لەمۆمی دڵسوتاو بپرسە، چونکە شەماڵی فێنك راستە پەیك و هەواڵبەری عەشقە بەڵام لەناخی عەشق و نهێنییەکانی عەشق ئاگادار نییە و مۆم کەدەسووتی و دەتکێتە خوارەوە لەدەردی عەشق دەزانێ (واتە عەشق سووتانە نەك شەماڵیکی فێنك).

**٤- هیچ آگهی ز عالم درویشیش نبود**

**آنکس که با تو گفت که درویش را مپرس**

ئەوکەسەی کەبەتۆی گوت هەواڵی دەروێش مەپرسە، هیچ زانیارییەکی دەربارەی جیهانی دەروێش نەبوو.

جیهانی دەروێشی جیهانێکی پاکییە، بۆیە ئەحواڵپرسی دەروێشان شەرمێکی گەورەیە و ئەو کەسەی کەبەتۆی گوت هەواڵی دەروێش مەپرسە بێگومان لەجیهانی دەروێشی بێ ئاگابوو ئەگەرنا وای نەدەگوت.

**٥- از دلق و پوش صومعه نقد طلب مجوی**

**یعنی ز مفلسان سخن کیمیا مپرس**

داوای نەقدی (طلب) لەخیرقەپۆشانی پەرستگا مەکە، واتە داوای گوتەی کیمیا گەر لەموفلیسان مەکە.

دلق پوش: خیرقە پوش، سۆفی.

طلب: داواکردن، هەوڵدان بۆ گەیشتن بەحەق / یار، زاراوەیەکی عیرفانییە و پلەیەکە کە ئاداب و رەفتاری تایبەتی هەیە.

خواجە پێیوایە کە (طلب) پارە و نەقدێکە یا ئیکسیرێکە کەشتی بێ بەها دەکاتە زێڕ و زیو و سۆفییان لەم نەقد و کیمیا (ئیکسیرە) بێ بەشن و تیایاندا نییە، و دەڵێ داوای نەقد و سکەی (طلب) لە سۆفییان (خیرقە پۆشانی خانەقا) مەکە، واتە داوای کیمیاگەری ـ توخمی بەهاکردنە زێڕ و زیو ـ لەموفلیسان مەکە چونکە گەر هەیانبووایە خۆیان موفلیس نەدەبوون.

**۶- در دفتر طبیب خود باب عشق نیست**

**ای دل بدرد خو کن و نام دوا مپرس**

لەدەفتەری (کتێبی) پزیشکی عەقڵدا بەشی عەشق نییە، ئەی دڵ خو بەدەردەوە بگرە و ناوی دەرمان مەبە.

خود: عەقڵ، ژیری. باب: بەش، بابی کتێب.

گەر کتێبی دکتۆری عەقڵ بەش بەش بێت و هەربەشێك بۆ دەرمانی نەخۆشییەك تەرخانکرابێت ئەوا بەشێکی بەناو عەشقەوە تێدا نییە بۆیە ئەی دڵ لەگەڵ دەردی عەشقدا بسازێ و ناوی دەرمان مەبە.

واتە: دەردی عەشق بەعەقڵ تیمار ناکرێت و ئارامگرتن لەسەر ئەو دەردە باشترین چارەیە.

**۷-ما قصەی سکندر و دارا نخواندەایم**

**از ما بجز حکایت مهر و وفا مپرس**

ئێمە چیرۆکی ئەسکەندەر و دارامان نەخوێندووە، جگە چیرۆکی میهر و وەفا هیچی دیکە لە ئێمە مەپرسە.

سکندر: ئەسکەندەری مەکدۆنی. دارا: دارا (داریوش)ی هەخامەنشی کە لە ۳۳۰-۳۳٦ پێش میلاد دا فەرمانڕەوایی کردووە و بەدەستی ئەسکەندەر تێك شکا. {هروی، ج۲، ل۱۱۲٦}.

نخواندەایم: نەمانخوێندووە.

مهر و وفا: عەشق و وەفا، چیرۆکی (مهر و وفا) کە چیرۆکێکی بەناوبانگی رۆمانسییانەیە.

چیرۆکی داریوش و ئەسکەندەر رەمزی سیاسەت ودەسەڵات وکێبەرکێی دونیایی وچیرۆکی میهر و وەفا رەمزی عەشقی دونیایی پڕ رەمز و راڤەی عەشقە، خواجە لێرەدا دەڵێ: ئێمە جگە لەچیرۆکی عەشق هیچی دیکە نازانین و هیچی دیکەمان لێ مەپرسە، ئێمە چیرۆکی ئەسکەندەر و دارامان نەخوێندووەتەوە.



**۸-حافظ رسید موسم گل معرفت مگوی**

**دریاب نقد وقت و چون و چرا مپرس**

حافظ وەرزی گوڵ گەیشت و باسی مەعریفەت مەکە، پارەی کات بەدەست بێنە و لەچۆن و بۆچی گەڕێ (واز لەچۆن و بۆچی بهێنە).

موسم گل: وەرزی گوڵ درکەیە لەبەهار.

واتە حافظ سەردەمی گوڵ و وەرزی بەهارە ـ کەسەردەمی عەشقی یاری حەقە ـ واز لەماریفەت و حیکمەت بهێنە و سکەی کات بەدەست بهێنە و خەریکی عەشق و شادی بە و واز لەچۆن و بۆچی، مەنتیق و فەلسەفە و مەدرسەگەڕی بهێنە.

## غەزەلی دووسەد و شەست و هەشتەم:

**بەحری خەفیفی شەشی مەخبونی مەقسور**
**(فاعلاتن مفاعلن فعلان)**

**١- درد عشقی کشیده‌ام که مپرس**
**زهر هجری چشیده‌ام که مپرس**

دەردی عەشقێکم کێشاوە هەر مەپرسە، زەهری دوورییەکم چەشتووە هەرمەپرسە.
کشیده‌ام: کێشاوە. چشیده‌ام: چەشتوومە.
کە مپرس: (لێرەدا) هەرمەپرس،کە مەپرسەن بۆدەربڕینی سەرسوڕمانی زۆرە.
واتە: دەردێکی سەخت و نارەحەتی عەشقێکم کێشاوە ژەهرێکی زۆر تاڵ دوورییەکیشم چەشتووە کەلەسەختیدا هەر باس ناکرێت.

**٢-گشته‌ام در جهان و آخر کار**
**دلبری برگزیده‌ام که مپرس**

گەڕاوم بەجیهاندا و سەرەنجام یارێکم هەڵبژاردووە هەر مەپرسە.
گشته‌ام: گەڕاوم. آخر کار: سەرەنجام، دواجار. برگزیده‌ام: هەڵبژاردووە.

**٣- آنچنان درهوای خاک دوش**
**سخنانی شنیده‌ام که مپرس**

من شەوی رابردوو ـ بە گوێی قسەم لەدەمی بیستووە هەرمەپرسە.
واتە من شەوی رابردوو بەگوێی خۆم قسەی زۆر خۆشم لەدەمی یار بیستووە.

**٥- سوی من لب چه می گزی که مگوی**
**لب لعلی گزیده‌ام که مپرس**

بۆچی رووەو من لێو دەگەزی کەهیچ مەڵێ، گازم لە لێوێکی سووری واگرتووە هەر مەپرسە.
لب میگزی: لێو دەگەزی، ئاماژە لەقسە نەکردن وبێدەنگ بوونی.
مگوی: مەلێ، بێدەنگ بە، قسەمەکە. گزیده‌ام: گازی لێگرتووە.
تۆ روو لەم دەکەیت و لێوی خۆت دەگەزی و بەئاماژە پێم دەڵێی قسە مەکە و رازی عەشق مەدرکێنە و گوتەکانی یار و مەعشوق بەغەیر و ئەغیار مەڵێ، باشە هیچ ناڵێم بەڵام گازم لە لێوێکی یاقوتینی سووری واگرتووە (گوێم لەقسەی خۆشی وای یاربووە) هەر



مەپرسە، یاخود چۆن نەڵێم کە گازم لە لێوێکی یاقوتینی واگرتووە (گوێم لە قسەی خۆشی وای یاربووە) هەر مەپرسە.
لێرەدا ئەکرێ (تۆ) کە روو لەیار دەکەیت مورشید بێت کەئاماژە بەمورید دەدات رازی عەشق هەڵنەماڵێت.

**٦- بی تو در کلبه‌ی گدایی خویش**
**رنجهایی کشیده‌ام که مپرس**

بێ تۆ لەکۆلیتی گەدایی خۆمادا ئازار و رەنجی زۆری وام کێشاوە هەرمەپرسە.
کلبە: کۆلیت، ژوری چکۆلانەی پڕخەم و حوزن.
ئەی یار، بەبێ یادی تۆ و شهودی تۆ لەکولانەی سواڵکەری دونیادا دوچاری دەرد و نارەحەتی زۆر دەبم، کەهێندە زۆرە هەر مەپرسە.

**٧-همچو حافظ غریب در ره عشق**
**به مقامی رسیده‌ام که مپرس**

هەروەك حافظی غەریب لەڕێگەی عەشقدا، بەپلە و پایەیەك گەیشتووم هەرمەپرسە.
همچو: هەروەك.
حافظ لەعەشقی حەقدا بەمەقامی بەرز گەیشتووە شاعیر ـ وەك ئەدەبی کەسێکی دیکە بێت دەڵێ وەك حافظی غەریب لەڕێگەی عەشقدا بەپلە و مەقامێك گەیشتووم هەرمەپرسە ـ ئەکرێ ئەو مەقامە نارەحەتی بێت ـ رواڵەتی بەیتەکە،- یاخود خۆشبەختی و بەرزی بێت- ئاستی قووڵی بەیتەکە لەڕاستیدا تەواوی غەزەلەکە بەبێ واتای نوێ، دووبارەکردنەوەی ئەو واتا عیرفانییانەی کەلەغەزەلەکانی پێشوودا باسمانکردووە بەتەواوی غەزەلێکی عیرفانی سادەیە و وشەکان لەسیاقی مەئلوفی عیرفانیدا بەکارهاتوون.

## غەزەلی دووسەد و شەست و نۆیەم:

**بەحری رەمەلی هەشتی مەخبونی مەقسور**

**(فاعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلان)**

**١- دارم از زلف سیاهش گله چندان که مپرس**

**که چنان زو شده‌ام بی سرو سامان که مپرس**

هێندە گلەییم لەپرچی رەشی هەیە هەرمەپرسە، چونکە لەدەستی ئەوەوە وا بێ سەر و سامان بووم هەرمەپرسە.

گلە: گلەیی. زو/ از او: لەوەوە، لەدەستی ئەوەوە.

بی سر و سامان: پەرێشان حاڵ، پەشێوەحاڵ، موفلیس.

زوڵف، داپۆشەری رووی یاری حەق و حیجابی جوانی مەعشوق و بەهۆی ئەم شاردنەوەوە خواجە دونیایەك گلەیی لەپرچی رەشی یار هەیە کە رووی یاردادەپۆشێ و لەمەشەوە خواجە بەجۆرێك پەرێشان و پەشێوحاڵ بووە کە لەباسکردن نایەت و هەر مەپرسە چی بەسەر هاتووە.

**٢-کس به امید وفا ترک دل و دین مکناد**

**که چنانم من ازین کرده پشیمان که مپرس**

خوا نەکا کەسی بەئومێدی وەفا واز لەدڵ و دین بهێنێ چونکە من والەم کردەیە پەشیمانم هەر مەپرسە.

مکناد:: خوانەکا، کاری نزایی (داوایی) نەرێیە. کَردە: کردە.

خواجە دەڵێ: خوانەکا کە هیچ کەسێك بەهیوا و ئومێدی وەفای یاری بێ وەفا واز لەدین و دڵی خۆی بهێنێ و هەردووکیان بدۆڕێنێ و بیخاتە بەرپێی یارەوە چونکە من وام کردووە ئێستا زۆر زۆر لەکردەی خۆم پەشیمانم.

**٣-به یکی جرعه که آزار کسش در پی نیست**

**زحمتی می کشم از مردم نادان که مپرس**

بۆ یەك قوم کە ئازاری کەسیش لەدوا نییە، نارەحەتییەك لەدەست خەڵکی نەزان دەکێشم هەرمەپرسە.

در پی نیست: لەدوا نییە، نابێتە مایەی.



بەنۆشینی یەك قوم شەراب کە نابێتە مایەی ئەوەی تەواو مەست بم و ببمە مایەی ئازاردانی خەڵکی کەچی لەتاو لۆمەی خەڵکی نەزان زەحمەت و نارەحەتییەك دەکێشم هەر مەپرسە و باسناکرێت.

د.هروی پێیوایە کەئەم بەیتە بەهیچ شێوەیەك لێکدانەوەی عیرفانی هەڵگرێت و چیرۆکێکی حەزرەتی عومەر لە (د.فروزانفر)ەوە نەقڵدەکات کەتا ئاستێك مەینۆشی حەڵاڵ دەکات {د.هروی، ج٢، ل ١١٣١} بەڵام بەبڕوای بەندە ئەسڵی چیرۆکەکە پووچە و هاوەڵان زۆر لەوە قووڵتر لەقورئان تێگەیشتبوون، بەتایبەتی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتابیش ـ خ.ل ـ کە تارادەیەکی زۆر عەقڵانی سەختگیر بووە لەجێبەجێ کردنی حوکمە بڕواکاندا.

بەهەر حاڵ زۆر بەئاسانی ئەم قومە شەرابە بەتۆزە عەشقێکی ئیلاهی لێکدەدرێتەوە لاهوری گوتەنی خاوەنی کشف المحجوب (هجویری) دەفەرمێ: سونەتی خوای گەورە وایە کە هەر کەس باسی خوابکات هەموو عالەم ئەکاتە لۆمەکاری ئەو. {لاهوری، ج٣، ل١٨٤٢}

**٤- زاهد از ما به سلامت بگذر کاین می لعل**

**دل و دین می برد از دست بدان سان که مپرس**

ئەی زاهید بەسەلامەت لەئێمە رەتبە، چونکە ئەم مەیە سوورە وادڵ و دین لەدەست ئەبا هەر مەپرسە.

بەسلامت بگذر: بەسەلامەتی رەتبە. بدان سان: بەوشێوەیە، وا.

شەڕابی عەشق، شەڕابێکی یاقوتینی وایە کە دڵ و دینی رواڵەتی لەعاشقان دەسێنێ و موفلیس و پەرێشانیان دەکات، خواجە بەتوانجەوە بەزاهیدی ریاکار دەڵێت: ئەی زاهیدی بەدین و دڵ کەبەلای ئێمەی عاشقاندا تێدەپەڕی بەحەزەرەوە تێپەڕە تابە سەلامەتی رەتبی چونکە ئەم شەڕابی عەشقە بەشێوەیەك دڵ و دین دەبات هەرمەپرسە مەبادا دڵ دینی مەینۆشی برفێنێ.

**٥- گوشه‌گیری و سلامت هوسم بود ولی**

**شیوه‌ای می کند آن نرگس فتّان که مپرس**

گۆشەگیری و سەلامەتی ئارەزووم بوو بەڵام ئەو نێرگزە فەتانەی یار بەشێوەیەك ناز و عیشوەگەری دەکات هەرمەپرسە.

فتان: فیتنە ئەنگیز.

خواجه دەڵێ: ئارەزووم وابوو کە واز لەعەشق بهێنم و بەسەلامەتی لێی دووركەومەوە و گۆشەگیر بم بەڵام ئەو چاوەمەستانە و فیتنە ئەنگیزانەی یار بەشێوەیەکی وا عیشوەگەری دەکات هەرمەپرسە و ناهێڵێ واز لەعەشقی بهێنم.

واتە: دەمەوێ واز لەعەشق بهێنم بەڵام مەستی چاوی یار ڕێگەم لێدەگرێ.

**۶-گفت و گوهاست درین راه که جان بگدازد**

**هرکسی عربده‌ای، این که مبین آن که مپرس**

لەم ڕێیەدا گفتوگۆی واهەیە کەگیان دەتوێتەوە، هەرکەس هاوارێك دەکات، ئەم کەسە سەیر مەکە ئەو کە مەپرسە.

جان بگدازد: گیان دەتوێتەوە، تاقەت دەبڕێت، بڕست دەبڕێت.

عربده: شەڕ و هاواری سەرخۆش، غەوغا، قاڵەقاڵ.

خواجه لەم بەیتەدا بەشێوەیەکی زیرەکانە کە نەسەقی بەیتەکەش ئەو بەرز و نزمییە پیشان دەدات لە خیلافات و ڕێکنەکەوتنی زانایان لە مەسەلەی عەشق و تەواوی مەسەلە پەیوەستەکانی تر بەعەشق و غەیبەوە دەدوێت، بێگومان غەیب و عەشقی ئیلاهی هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانییەوە تاهەنووکەش گفتوگۆیەکی زۆر زۆری لێکەوتووەتەوە، هەندێ بەتەواوی ڕەفزی دەکەنەوە و هەندێکیش دەبنە موریدی ئەو ڕێگەیە.

خواجه دەڵێ: لەباسی ئەم ڕێیەدا و لەباسی عەشقدا هێندە گفتوگۆ و باس و خواس هەیەکە بڕستی مرۆڤ دەبڕێت و خیلاف و ڕێکنەکەوتنی یەکجار زۆر بەدی دەکرێت و هەریەکێك لەروانگەیەکەوە قسەدەکات، تائەورادەیەی وەك هاواری سەرخۆشانی لێهاتووە و یەکێ دەڵێ سەیرمەکە و ئەوی دیکە دەڵێ پرسیار مەکە.

یاخود لەبارەی ئێمەی عەشقانەوە خیلافی زۆر لەنێوان زانایانەوە هەیە و هەریێکیان شتێك دەڵێن.

**۷-گفتم از گوی فلك صورت حالی پرسم**

**گفت آن می کشم اندر خم چوگان که مپرس**

گوتم، ئەحواڵێکی گۆی گەردوون بپرسم، گوتی لە دەسکی گۆچاندا حاڵێکم هەیە هەر مەپرسە.

می کشم: دەکێشم. چوگان: گۆچان، لێرەدا مەبەست لە داری گۆ و مەیدانە.

خواجه لێرەدا گەردوونی بەگۆی یاری گۆ و مەیدان داوەتە قەڵەم دەڵێ: لای خۆم بیرم کردەوە و گوتم حاڵ و ئەحواڵێکی تۆپی گەردوون بپرسم بزانم کاروباری چۆنە و چۆن کاردەکات



و ئازادە یا نا گوتی لەدەستی دەسەڵاتی قەدەر و ویستی ئیلاهی حاڵێکم هەیە هەر مەپرسە واتە منیش زارێکی نێو یاری قەدەری ئیلاهی زیاتر هیچی دیکە نیم و هیچم بەدەست نییە.

ئەم بەیتە ڕەتدانەوەیە بۆ ئەوکەسانەی کەپێیان وابوو، گەردوون و ئەستێرەکان کاریگەرییان لەژیانی مرۆڤ هەیە و ڕەتکردنەوەی نجومگەرییە.

**۸-گفتمش زلف به خونِ که شکستی گفتا**

**حافظ این قصّه دراز است به قرآن که مپرس**

پێمگوت بەقەسدی خوێنی (گیانی) کێ پرچت چین چین کردووە گوتی حافظ ئەم چیرۆکە درێژە و تو قورئان مەپرسە.

گفتمش: پێم گوت. بەخون کە: بەقەسدی ڕشتنی خوێنی کێ، بەقەسدی کوشتنی کێ.

شکستی: چین چینت کردووە، ڕازاندووتەوە.

به قرآن: تو قورئان، بەقورئان سوێندت ئەدەم.

یار پرچی چین چین کردبوو و ڕازاندبووەوە، خواجەش دەڵێ: پێم گوت بەنیازی کوشتن و دڵڕفاندنی چ کەسێك ئەم پرچەی ڕازاندووەتەوە، گوتی: حافظ چیرۆکی بەسەرهاتی ڕازاندنەوەی ئەم پرچەم دوور و درێژە تو قورئان لێم مەپرسە و پرسیاری لەبارەوە مەکە.

پرچ هەمان پرچی عیرفانی بەیتی یەکەمە.

## غەزەلی دووسەد و حەفتایەم:

**بەحری موجتەسی هەشتی مەخبونی ئەسلەمی موسبەغ**
**(مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لان)**

**١- اگر رفيق شفيقى درست پيمان باش**
**حريف حجره و گرمابه و گلستان باش**

ئەگەر رەفیقی میهرەبانی، پەیمان راست بە و هاودەمی حوجرە و گەرماو و باخ بە.

رفیق: هاوڕێ، رەفیق. شفیق: میهرەبان، بەشەفەقەت.
درست: راست و دروست. حجره: حوجرەی فەقێیان. گرمابه: گەرماو، حەمام.

ئەگەر هاوڕێی میهرەبانی منی پەیمانی دۆستایەتیت لەگەڵمدا راست و دروست بێت و لەهەموو جێگە و شوێنێکدا هاودەم و هاوڕێم بە لەحوجرە و چ لەگەرماو و چ لەگوڵزاردا.

زۆربەی راڤەکارانی شیعری خواجە پەیوەندییەکی لەنێوان دۆستایەتی راستی و هاودەمی لە حوجرە و حەمام و گوڵستاندا بەتایبەتی حەمام- دانەناوە و روونیان نەکردۆتەوە کە بۆچی لەنێو ئەو هەموو جێگەیەدا حافظ ــ حەمام ـ ی دەستنیشان کردووە بەڵام جەنابی خرمشاهی لە (حافظ نامە)دا لە { ادوارالاحباب، ج٢، ل١٩٢} ی (ابوالمفاخر باخوزی)یەوە نقڵی کردووە و نووسیویەتی:

لەنێو سۆفییاندا واباوبووە کەبەتەنیا و بەبێ هاوڕێ نەڕۆن بۆ حەمام و پێکەوە بڕۆن {ج٢، ل٨٦٣ }.

لێرەدا خواجە بەرەچاوکردنی ئەم نەریتە بەیار دەڵێت: ئەگەر بەڕاستی هاوڕێی میهرەبانی و راستگۆی لەگەڵ دۆستەکاندا خاوەن پەیمانی راستی عەشق و هاودەم و هاوڕێی هەمیشەیی هاوەڵ و دۆستانیشت بە.

**٢-شكنجِ زلف پريشان به دست باد مده**
**مگو كه خاطرِ عشّاق گو پريشان باش**

چین و لوولی پرچی ئاڵۆسکاو مەدە بەدەست باوە، مەڵێ گوێ مەدەرێ بادڵی عاشقان پەرێشان بێت.

شکنج: چین و لولی.
پریشان: ئاڵۆز، ئاڵۆسکاو، پەرێشان.
گو پریشان باش: باپەرێشان بێت، لێگەڕێ پەرێشان بێت.



پرچی چین چین و لوولی یار بووەتە حیجابی سەر روومەتی ئەو و ئەم حیجابەش مایەی پەرێشانی حاڵی دڵی عاشقانە، لێرەدا خواجە بەمەعشوق دەڵێ: چین و لوولی پرچی ئاڵۆسکاوت مەدە بەدەم باوە کەپەرێشانتر و پرچین و لوولتری بکات و حیجابی سەر رووخسارت زیاتر بێت و مەڵێ لێگەڕێ باحاڵی عاشقان پەرێشان و پەشێو بێت.

واتە: ئەم کارەت بەرامبەرە بەگوتنی (لێگەڕێ بادڵی عاشقان پەرێشان و پەشێو بێت) ئەم کارە مەکە و ئەم گوتەیەش مەڵێ.

**٣-گرت هواست كه با خضر همنشين باشى**
**نهان ز چشم سكندر چو آب حيوان باش**

ئەو ئارەزووتە کەلەگەڵ خدردا هاودەم بیت وەك ئاوی نەمری لەبەر چاوی ئەسکەندەر ونبە.

همنشين باش: هاودەم و هاونشین بیت. سكندر: ئەسکەندەری مەکدۆنی.

ئەسکەندەری مەکدۆنی رەمزی دونیا و دەسەڵاتی دونیایی و خدری زیندەش هێما و رەمزی خودا ویستی و جیهانی پیرۆزی رۆح و مەعنایە، لێرەدا خواجە دەڵێ: گەر هیوا و ئارەزووت وایە و هاوڕاز و هاودەمی خدربیت و ببیتە ئەهلی مەعنا وەك ئاوی حەیات (کە ئەسکەندەر زۆری بەدوادا گەڕا و نەیدۆزییەوە) خۆت لەئەهلی دونیا و ماددییات بەدووربگرە و بشارەوە، واتە لەدونیا و دونیاویستیان گۆشەگیربە.

**٤- زبورِ عشق نوازى نه كارِ هر مرغى است**
**بيا و نوگل اين بلبل غزل خوان باش**

زەبوری عشق خوێندن (بەئارەزووە) کاری هەموو باڵندەیەك نییە، وەرە تازە گوڵی ئەم بولبولە غەزەلخوێنە بە.

زبور: کتێبی پیرۆزی حەزرەتی داود-د.خ- و یەکێکە لەو پێنج کتێبە ئاسمانییەی کە خوای گەورە بۆ پێغەمبەرانی ناردووە و لەقورئاندا بەئاشکرا باسیان کراوە و ئەوانیش (صحف)ی حەزرەتی ئیبراهیم ـ د.خ- و (زەبور)ی حەزرەتی داود-د.خ- و (تەورات)ی حەزرەتی موسا-د.خ- و (ئینجیل)ی حەزرەتی عیسا ـ د.خ- و (قورئان)ی حەزرەتی موحەمەد ـ د.خ ـ، زەبوری داود کۆمەڵێ سروود بوون کە بەدەنگەوە دەخوێنرانەوە.

خواجە لێرەدا (عەشق)ی بە زەبور داناوە و دەڵێ: خوێندنەوەی وەك زەبوری عەشق بەئاواز و دەنگەوە لەهەموو باڵندەیەك نایەت و شایستەی دەوێت، من کەغەزەلخوانم و بولبولی غەزەل دانەرم چاك دەتوانم عاشق بم، بۆیە وەرە ببە بەگوڵی من و یار و مەعشوقم بە.

بەکورتی هەموو کەسێك ناتوانێ عاشقێکی راستەقینە بێت من دەتوانم ئەرکی عەشق و دەردی عەشقی هەڵگرم بۆیە وەرە ببە بەمەعشوقی من.

**۵-طریق خدمت و آیین بندگی کردن**

**خدای را که رها کن به ما و سلطان باش**

بۆ خاتری خوا (توخوا) ڕێوڕەسمی خزمەتکردن و بەندایەتی کردن واز لێ بێنە و بۆ ئێمە و تۆ سوڵتان بە.

طریق و آیین: ڕێوڕەسم و شێواز. خدای را: بۆخاتری خوا، توخوا.

رهاکن بەما: واز لێبێنە بۆ ئێمە، بدە دەستی ئێمە.

ئەی یار توخوا ببە سوڵتان و پادشامان و لێگەڕێ با ڕێوڕەسمی خزمەت و بەندایەتی کردنت جێبەجێ بکەین.

**۶-دگر به صید حرم تیغ برمکش زنهار**

**وز آنچه با دل ما کرده‌ای پشیمان باش**

ئامان ئیدی بۆ نێچیری حەرەم شمشێر هەڵمەکێشە و لەوەی کە لەگەڵ رقی دڵی ئێمەدا کردووتە پەشیمان ببەرەوە.

صید حرم: نێچیرێك کە لەحەرەمی سنووورداری خۆتدایە و ماڵییە و راناکات.

برمکش: هەڵمەکێشە. زنهار: ئامان. پشیمان باش: پەشیمان بەرەوە.

ئەی یار دڵی ئێمە لەو کۆترە ماڵییانە دەچێت کە لەحەرەم و حەوشەی عەشقی تۆدا دەژین و هەرگیز بەجێی ناهێڵن، ئامان ئیدی تۆ شمشێر بۆ ئازاردانی ئەو نێچیرە ماڵی و حەرەمییانەی خۆت هەڵمەکێشە و لەبری ئازاردانی داوای لێبوردن لەدڵی ئێمە بکە و لەورەفتارانەی پێشووت پەشیمان بەرەوە.

**۷- تو شمع انجمنی یکزبان و یکدل شو**

**خیال و کوششِ پروانه بین وخندان باش**

تۆ مۆمی مەجلیسی یەك قسە و سەرڕاست و سەیری خەیاڵ و هەوڵی پەروانە بکە و پێ بکەنە و شادبە.

انجمن: مەجلیس، کۆڕ. یکزبان: یەك قسە، راستگۆ.

یکدل: موخلیس. کوشش: هەوڵ، کۆشش. خندان: لێو بەخەندە، شادومان.

ئەی یار تۆکە ئێستا ناوبانگت دەرکردووە و بوویت بە مۆمی مەجلیس و کۆڕ راستگۆ و یەکقسە و چاك بە، کەتۆ مۆمی سەیری ئەو هەوڵ و خەیاڵە بکە کە لەدڵی پەروانەدایە و خۆی



دەکاتە قوربانی مۆم و شادومان بە کەمن وەك پەروانە بەدەورتدا دەسوڕێمەوە و ئامادەم گیانی خۆم لەپێناو تۆدا بەختبکەم.

**۸-کمال دلبری و حسن در نظر بازی است**

**به شیوه‌ی نظر از نادران دوران باش**

کەماڵی دولبەری و جوانی لەنەزەر بازیدایە، بۆیە لەشێوەی سەیرکردندا لەنایابەکانی دەوران بە.

نظربازی: سەیرکردن و چاپڕکێ، چاوبڕکێ نێوان عاشق و مەعشوق.

نادران: نایابان، دانسقەکان. دوران: دەورن، رۆژگار.

خواجە هەرجارێك یەکێك لەسیفەتەکانی ترۆپکی دولبەری ئەخاتەڕوو لێرەدا، ترۆپك کەماڵی جوانی یاری بە نەزەربازی و عەشقی چاوبازی و شێوەی چاو... دەداتە قەڵەم بۆیە بەیار دەڵێ ئەی یار مادام کەماڵی جوانی و دولبەری نەزەربازییە تۆش لە شێوەی سەیرکردن و عیشوەی چاواندا لە دانسقە و نایابەکانی دەوران بەو بگە بە لوتکە و کەماڵی جوانی و مەعشوقی.

**۹-خموش حافظ و از جور یار ناله مکن**

**ترا که گفت که در روی خوب حیران باش**

حافظ بێدەنگ بە و لە تاو ستەمی یار مەناڵێنە، کێ بەتۆی گوت بەرووی جوان سەرسام بە.

جور: ستەم، جەور. حیران باش: سەرسام بە، حەیران بە.

بەندە پێموایە گەر تۆجیتۆیەك بۆ عەشقی خواجە دارێژین ئەوا حەیرەت و سەرسامی لەجوانی یاردا دەبێتە تۆجیتۆی عەشقی حافظ، بۆیە لێرەدا وەك هەمیشە حەیران بوونی خۆی بەجوانی و جوانییەکانی عەشق دووبارە دەکاتەوە، بۆیە ئەم سیفەتە دەبێتە مایەی ئەوەی کە ئەو گلەیی لەکەس نەکات و بەدوی خۆیدا بڕوات، بەخۆی دەڵێت حافظ بێدەنگ بە و لەتاو ستەمی یار مەناڵێنە خۆ کەس پێی نەگوتووی بەجوانی جوانانداحەیران و سەرسام بە، لەبەر ئەوەی کاری خۆتە و کەس پێی نەکردووی بێدەنگیش بە.

## غەزەلی دووسەد و حەفتا و یەکەم:

**بەحری هەزەجی هەشتی ئەخرەبی مەکفوفی مەقسور**

**(مفعول مفاعیل مفاعیل مفاعیل)**

**١- بازآی ودل تنگ مرا مونس جان باش**

**وین سوخته را محرم اسرار نهان باش**

وەرە و ببە هاودەمی گیانی دڵی تەنگی من و ببە مەحرەمی رازە پەنهانەکانی ئەم دڵە سووتاوە.

باز آی: وەرەوە، بگەڕێرەوە، بگەڕێوە.

مونس: هاودەم و هاوڕاز.

سوختە: سووتاو (لێرەدا بۆدڵی تەنگ یا خودی شاعیر دەگەڕێتەوە).

ماوەیەکە یار خواجەی بەجێ هێشتووە و دڵی تەنگ بووە ـ یا بە تەعبیری عارفانە، خواجە دوچاری قەبضی هاتووە ـ بۆیە ئێستا داوای گەڕانەوە و هاتنەوە لەیار دەکات و دەڵێ: بگەڕێوە بۆ لام و ببەرەوە بەهاودەمی و هاوڕازی گیانی دڵی تەنگی من و ببەرەوە بە مەحرەمی راز و ئەسراری ئەم سووتاوەی عەشقی خۆت (کە ئەم سووتاوە ئەکرێ هەمان دڵی تەنگی میسراعی یەکەم بێت یاخودی شاعیر).

**٢- زان باده که مصطبـەی عشق فروشند**

**مارا دو سه ساغر بده و گو رمضان باش**

لەو شەرابەی لەسەر سەکۆی عەشقدا دەیفرۆشن دوو سێ پێکمان بدەرێ با رەمەزانیش بێت (گوێ مەدەرێ).

مصطبە: سەکۆ. فروشند: دەفرۆشن.

گو رمضان باش: بارەمەزانیش بێ گوێ مەدەرێ، گەرچی رەمەزانیش بێ.

گەر رەمەزانیش بێت عاشقان هەرپێویستیان بە بادە و شەرابی عەشقی یاری حەق هەیە، بۆیە خواجە پاش ئەوەی بەیار دەڵێ: بگەڕێوە، پێشی دەڵێ: لەو شەرابەی خۆشەویستییەی کە لەمەیخانەی عەشقی حەقدا دەیفرۆشن دوو سێ پێکمان بدەرێ بینۆشین بارەمەزانیش بێ چونکە ئەو شەرابە رۆژوو بەتاڵ ناکاتەوە. یا دوای مەخە بارەمەزانیش بێت چونکە دواخستنی زیانی هەیە.



د.خطیب رهبر ئەم شەڕابە بەشەرابی مەعریفەتی ئیلاهی دەداتە قەڵەم {خطیب رهبر، ل ٣٦٨}.

**٣- درخرقه چو آتش زدی ای عارفِ سالک**

**جهدی کن و سرحلقەی رندان جهان باش**

ئەی عارفی رێگەی تەریقەت چون ئاگرت بەرداوەتی خیرقە هەوڵێ بدە و ببە سەردەستەی رەندانی جیهان.

آتش زدی: ئاگرت بەردایە. جهدی کن: هەوڵێ بدە.

سرحلقە: سەردەستە، پێشەوە.

خیرقە لێرەدا زوهدی ریایی و روکار و رواڵەتی تەریقەتی رەسمییە و خواجە بەعارف ـ کە ئێستا خۆی بێت ـ دەڵێ: ئێستا کە ئاگرت بەرداوتە زوهدی ریایی و وازت لە زوهدی رەسمی و ریابازانە هێناوە و بەڕاستی لەدەرگای عەشقی حەقت داوە هەوڵێ بدە و ببە بەسەردەستە و پێشەوای عارفانی جیهانی.

(خرقە) لەزاراوەی عیرفانیدا بەواتای وجودی رێبواری تەریقەت دێت وئاگربەردانە خیرقەش فەنابوون و سفرکردنەوەی وجود و جەستەی عارفە. بەم واتایە خواجە لەبەیتەکەدا دەڵێ:

ئێستا کە بەفەنا گەیستوویت هەوڵبدە ببیتە سەردەستەی عارفان.

**٤- دلدار که گفتابه توام دل نگران است**

**گو میرسم اینک به سلامت نگران باش**

بەدڵدار کە گوتی دڵم بۆت نیگەرانە، پێی بڵی وابەسەلامەت دەگەمە لای چاوەڕوان بێت.

گفتا: گوتی (لەڕاستیدا ئەم شێوە دەربڕینە لە رابردووی سادەدا شێوەی دێرینە و لە فارسی نوێدا ـ ا ـ سواوە و تەنیا گفت ماوەتەوە، د.هروی و خطیب رهبر بە ـ می گفت /دەیگوت ـ لێکیان داوەتەوە کە ئەلبەتە بەهۆی ئەوەی کە ئینشاییە و ـ کە ـ لە پێشەوە هاتووە ئەم مانایەش دەگەیەنێ بەڵام لەڕاستیدا رابردووی سادەیە).

نگران: نیگەرانی (لەچاری دووەمدا بەواتای چاوەڕوانی هاتووە).

می رسم: دەگەم. اینك: وا.

دڵدار کە دەیگوت لەم سەفەری عەشقەتدا کە پڕە لە هەڵدێر و بەڵا دڵم بۆت نیگەرانە، پێی بڵێن وا بەسەڵامەت دەگەمەوە لات چاوەڕوانم بە.

بێگومان سەفەری ترسناکی مرۆڤ بۆدونیا و شەوق و تاسەی مەعبودی مەعشوقی حەق بۆ دیدار و گەیشتنەوەی مرۆڤ بۆلای حەق مەسەلەیەکی زۆر قووڵی فەلسەفی /ئایینی /عارفانەیە

و عارفەکان پێیان وایە خواجە بەتاسەوە چاوەڕوانی ڕۆیشتنەوە و لیقای بەندە خۆشەویستەکانی دەکات وەك لە فەرموودەی قودسیدا هاتووە ((الاطال شوق الابرار الی لقائی انا الی لقائهم اشد شوقاً / شەوق و تاسەی چاکان بۆدیداری من درێژەی کێشا ؟ بەڕاستی من بۆدیداری ئەوان زیاتر بەتاسەوەم)) {لاهوری، ج٣، ل ١٨٧٣} دیوان عراقی خواجەش لێرەدا دەڵێ: بە مەحبوب بڵێن نیگەرانی من نەبێت بەسەلامەتی عەشقەوە دەگەڕێمەوە بۆلای.

**۵-خون شد دلم از حسرت آن لعل روان بخش**

**ای دُرجِ محبت به همان مُهر و نشان باش**

دڵم لەحەسرەتی ئەو لێوە گیانبەخشەدا بووە کەباب، ئەی سندووقچەی خۆشەویستی هەروا سەرمۆربە.

خون شد دلم: دڵم بووە کەباب (لەداخ و حەسرەتدا).

روان بخش: گیانبەخش، حەیاتبەخش. درج: سندووقچە، باوەڵی بچووك.

مهر و نشان: مۆر، سەرمۆری نیشانەی نەکرانەوەی شتێك و نیشانەی هی کەسێك بوو.

دڵ باوەڵی بچکۆلانەی خۆشەویستییە کەلەم بەیتەدا داخراوە و سەربەمورە، خواجە دەڵێ دڵم لەتاو حەسرەتی لێو (قسە)ی ئەو یارە گیانبەخشە (کەمرۆڤ زیندوو دەکاتەوە بەقسە و هەناسەی) دڵم بووە بەکەباب و کەچی هەر بەهیوای خۆم نەگەیشتم کەلیقای یارە، ئەی باوەڵی چکۆلانەی دڵ هەروا داخراو و سەربەستراو بە و خۆشەویستی ئەو دەرمەکە و واز لە خۆشەویستی و عەشقی ئەو مەهێنە خواجە لێرەدا بەکنایە دەڵێ: گەرچی بە تاسەی خۆم نەگەیشتووم واز لە عەشقی یاری حەق ناهێنم و هەر لە دڵمدا دەمێنێتەوە و دڵم سندووقچەی سەرمۆری عەشقی ئەوە.

**۶- تا بر دلش از غصّه غباری ننشیند**

**ای سیل سرشک از عقبِ نامه روان باش**

تاغوبارێکی خەفەت لەسەر دڵی نەنیشێت ئەی لافاوی فرمێسك بە دوای نامەدا هەڵکە (بڕۆ).

ننشیند: نەنیشێ. ازعقب: بەدوای.

روان: باش، بڕۆ، هەڵکە.

خواجە کە نامە بۆ یار دەنێرێ پاش ئەوە بەفرمێسکی خۆی دەڵێ وەك لافاو هەڵکە و بەدوای نامەکەدا بڕۆ تائەگەر لەئەنجامی خوێندنەوەی نامەکە تۆز و غوباری خەفەتێك نیشتە سەردڵی یار بیشۆیتەوە.



**٧-حافظ که هوس می کندش جام جهان بین**

**گو در نظر آصف جمشید مکان باش**

حافظ کە ئارەزووی جامی جیهان بین دەکات، بڵێ لە بەرچاوی ئاسەفی وەك جەمشیددا بێت.

هوس میکندش: ئارەزووی دەکات. گو: بڵێ.

آصف: وەزیری حەزرەتی سولەیمان بە گشتی وەزیری زیرەك و چاپووك و میهرەبان و دەستکراوە.

جمشید مکان: لە پلەوپایەی جەمشید دا، جەمشید ئاسا.

جەمشید پادشا بووە، و حافظیش لێرەدا دەڵێ: گەر حافظ ئارەزووی بەدەستهێنانی جامی جهان بینی ئەسکەندەر دەکات کەئەسراری دونیای تیادا دەردەکەوێت، پێی بڵێت لەبەر چاوی وەزیر دوورنەکەوێتەوە و خۆی بخاتە ژێر مەرحەمەت و میهرەبانیی ئەو، ئەو وەزیرە بەرێزەی کە لەپلە و پایەدا وەك جەمشید وایە و پایە و مەقامی شاهانەی هەیە.

وەزیری چون جەمشید لای (د.غنی و تاریخ عصر حافظ) بە (خواجە جلال الدین) وەزیری (شاشوجاع) دراوەتە قەڵەم (د.هروی، د.خطیب) جەختیان لەسەر کردووەتەوە.

بەهەر حاڵ گەر وەزیرێکی دیاریکراویش نەبێت ئەم بەیتە لەستایشی کەسێکدا گوتراوە ئیدی ئەوکەسە دەسەڵاتدارێك بێت، یاخود (لاهوری) گوتەنی مورشیدی کامڵ بێت یاهەر کەسێکی دیکە.

